(رۆمان)

# کێ باوەڕ دەکا، رۆستەم

براوەی خەڵاتی دامەزراوی گوڵشیری
سەرماوەزی ١٣٨٣ێ بۆ پلەی یەکەمی
باشترین رۆمانی ساڵی ١٣٨٢ ی هەتاوی

رووح ئەنگیز شەریفیان

وەرگێڕانی
رەسووڵ وەیسی

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **کیٚ باوەڕ دەکا، رۆستەم (رۆمان)**
- **نووسینی: رووح ئەنگیز شەریفیان**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** رەسووڵ وەیسی
- **پێداچوونەوە:** رەهبەر مەحموودزادە
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١١**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٩٧)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٥١٥)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

وێڕای سپاسی خاڵۆزای هێژام

کاکە ڕەهبەر مەحموودزادە

## پێشکەشی دەکەم بە:

هاوژینی دڵسۆز و بەڕێزم خاتوون حەلیمە سەیدا کە سەرەڕای ڕاوەستاوی لە هەمبەر گشت کەندو لەندو کەمایەسی یەکانی ژیان ، هاندەر و پشتگرێکی بە ئەمەك و هەمیشەیی کارەکانم بووە.

# (١)

هەر بۆ ئەوە نابێ باوەڕ بکەم. وەك ئەوەیە پێت بڵێن: ئەودەمی لە سەفەرێ بووی وڵاتەکەت وەسەر ئاو گەڕابوو.

شەمەندەفەر هێور هێور وەڕێدکەوێ. بە بەردەم بۆتکەی ڕۆژنامەفرۆشیدا تێدەپەڕین، ئافرەتە فرۆشیارەکە بێ ئەوە ببانبینێ لێمان دەڕوانێ. گەڕاوە و باڵابەرز و گۆشتنە. ڕۆژنامە و چوکولاتگەلێك لەبەر بۆتکەکەی هەڵڕژاوە. جیهان ڕۆژنامەکانی لەو کڕی. ڕۆژنامەگەلێکی فرە، دیوارگەلێك کە لێکمان جیا دەکاتەوە.

*تۆ دەتوت: تەنیایی مرۆڤ پێوەندی بە*
*خواست و ویستی خۆیەوە هەیە، دەتوت:*
*خۆڕاگری لە هەمبەر تەنیاییدا ئەو کاتە*
*چەتوونە کە شتێکی بە پێچەوانەی*
*ئەمەوە بێ...*

بەلای شەمەندەفەرێکدا تێدەپەڕین کە لە سەکۆی هەمبەرماندا وێستاوە. لە پەنجەرەی شەمەندەفەر ورد دەبمەوە کە دیارە پەنجەرە نیە، شووشەیەکی یەك پارچەیە کە نە والا دەبێ و نە پێوە دەدرێ، سەیری دەکەم و پێموایە ئەو شەمەندەفەرانەی لە هاتوچۆدان وەك زیندانن و ئیزگەکانی جەرگەی ڕێگاش سەعاتگەلی دیدارن. مرۆڤ ئەگەر غیرەتی بێ دەشێ بۆ خۆدەربازکردن کەلکیان لێ وەرگرێ. هەر نەبێ دەنکە جۆیەك غیرەت.

*دەتوت تەنیایی هەڵبژێردراو، کەشو هەوائێیکە*
*هیچ کەس ناتوانێ لێمانی بستێنێ ...*

حەزم دەکرد سواری ئەو شەمەندەفەرانە بووباین کە خاوەن کووپەی سەربەخۆن. بەڵام ئێستا ئیدی شەمەندەفەری کووپەدار یا زۆر کەمە یان هەر دەست ناکەوێ. بوونەتە واگۆنگەلێکی سالۆن ئاسا بە دوو ڕیز کورسی لە بەرامبەر یەکتردا. جیهان وتی: دەتوانین بە شەو سەفەر بکەین و بۆ خەوتنیش کووپەیەك بگرین. لەم سەردەمەدا کووپەی تایبەتی تەنیا بۆ خەوتن دەست دەکەوێ. بەڵام من حەزم لە سەفەری ڕۆژە، گەرەکمە لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوە بکەم. ئەو خانووانە بە چاو

ببینم کە پەنجەرەکانیان رووناکن، یاکوو ئەوانەی پەردەکانیان دادراونەوە و لە بێدەنگی لەپشتیانەوە دزە دەکاتە دەرەوە.

حەسارە چۆڵکراوەکان و باغـە روالـەت دارووخاوەکـان. خـانووە چـیمەن لێـدراوەکان، یـاری منداڵانەی بێرەوبەوێدا پرژو بڵاو، تەنافێکی تەژی لە جلوبەرگی شۆراوە کە رەنگ و بۆی ژیانیان بە خۆیانەوە گرتووە.

جیهان رۆژنامەیەك هەڵدەگر، بە بان چاویلکەکەیدا سەیرێکی دەرەوە دەکا، باوێشکێکی هێـدی و لەسەرخۆی دێتێ کە شوێن دەخاتە سەر منیش. لێوەکانم بە یەکەوە لێکـدەنێم و بـەری باوێشـکم دەگرم. ئەم رۆژانە شتی زۆر بێ کەلك و پڕ و پـووچ بـاری خـەمم لـێ دەکـەن، چەشـنی باوێشـك هاتنێك.

سەعات لـە دەی لاداوە، خۆزیـا قاوەچـی زووتـر بهاتبایـە. ئەگـەر بـێ، قـاوەی لـێ دەکـڕم. سەردەمێك باو بوو کـە قاوەچـی لـەنێو شـەمەندەفەرە مسـافیرهەڵگرەکاندا بـە چـەرخی قـاوە و چایەکەیەوە پەیـدا دەبـوو. ئێسـتا تێناگـەم. لەمێـژە سـواری ئـەم شـەمەندەفەرانە نـەبووم. لـەو سەردەمانە دا چایی و قاوە هەر تامیان نەبوو، بەڵام ئـەمن کڕیـاری هەمیشـەییان هـەموو بـووم. دەنگی چەرخەکەی بۆی هەیە لەم خەم و ئـازارە لـە ناکـاوە رزگـارم بکـا. پێدەچـێ جیهـان قـاوە نەخواتەوە، دەڵێ بە قاوە سەر ئێشە دەگرێ.

دەڵێم: قاوە بابەتی سەرئێشەیە.

بەڵام ئەو سوورە لەسەر قسەکەی و دەڵێ: ئێمە لە دنیاییێکدا دەژین کە فرە سـانا دەشـێین مـل بەو شتە نەدەین کە خوازیاریان نین. بێ ئەوەی هەست بە تاوانێك بکەین.

*تۆ دەتوت قاوە وەك بۆنی بۆیاغ و دەرمان*
*دەتشێوێنێ. گەرچی تامەکەییت پێ خۆشە*
*بەڵام پێت ناخورێتەوە. ئەو تاقە شووشە*
*قاوەیەی کە بۆم هێـناوی لە دۆلابـی**
*هۆدەکەت دا راگرتـووە و دەرگەی هەروا*
*داخراوە...*

دابی قاوە خواردنەوەم دوای گەڕانەوە لە ئێران دەست پێکرد. بەر لەوە قاوەم هـەر بـە قەسـت و نیەتی فاڵگرتنەوە دەخواردەوە. ئەو فاڵانەی کـە هـیچ کامیـانم لـەبیر نیـەو شـتێکیان لـە بابـەت داهاتوومەوە روون نەکردۆتەوە. لەبری ئەوە هەزار بیرەوەرییان بۆم جێ هێشتووە.

لەتەك فاختەدا دەچوومە گرتنەوەی فالّی قاوە، بەدەم رۆیشتنەوە داهاتووی منو خۆی پێشبینی دەکردو لە گەڕانەوەشدا ئەو بابەتانەی بۆم شی دەکردەوە کە دیبوومان. پێم دەگوت لەمە بەدواوە ناچینە لای هیچ فالّگرێك و خوا نەخواستە ئەگەر کەلّکەلّەی* فالّگرتنەوەشم بوو، لەتەك ئەودا ناچم.

پێدەکەنی و دەیوت: خەمت نەبێ، نە ئەتۆ بە بەلّێنییەکەت پابەند دەبی و نە ئەمن.

-ئێستا دەبینی.

-پێت وایە دەتوانین بە بێ فالّ بژین؟ هەر کە ئاشق بووین جارێکی دیکە ڕێگەمان دەلای ئەو فالّگرانە دەکەوێتەوە و دەستەو داوێنیان دەبینەوە.

-مەگین بڕیارە ئاشق بین؟

-نا، بڕیارە تەرکە دنیا بین.

جیهان لە شێوە قاوە خواردنەوەکەی من وەڕەز دەبێ. ئەوکات کە تازە زەماوەندمان کردبوو حازر بوو بە هەرچی قاوەی دنیایە میوانم بکا. لە زۆربەی هەرە زۆری قاوەخانەکانی ئورووپادا بەیەکەوە قاوەمان خواردۆتەوە. چەندین سالّ لەو سەردەمەوە تێپەڕیوە، بەلّام هێشتا هەروەك منالّ دلّم بۆ شتی چکۆلە چکۆلە دەکرووکێنێ. ئەگەرچی ئیتر ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە دوایین جار کەی بوو ئاوا کەلّکەلّەیەکم بوو. جیهان قۆچاختر لەوەیە خولیاگەلێکی ئاوای بێ. ئەو لەجیهانێکی راستەقینەو لۆژیکیداو هەروەك خۆی لێکی دەداتەوە، لەجیهانێکی بێ هەلّکەوت و داکەوت و بێ سەرنجدانە پەراوێز و ئیحساساتی بووندا، دەژی. جیهان خاوەن یاساگەلێکی نەنووسراو و نەگوتراو، بەلّام چاوپۆشی لێنەکەرە کە بە پێی ئەوە هەلّسوکەوت دەکا. ئەگەر رەخنەیەك بگرم دەلّێ ئەم کردەوەیە پێوەندی بەو وانەیەوە هەیە کە خوێندوویەتی.

جیهان ژمێریارێکی سوێند خواردووەو وەك من کە لە چوار قوڕنەی دنیادا دەرمانسازیم خوێندووە، لێرەو لەوێ ژمێریاری خوێندووە هەتا لە ئاکامدا لێرە گیرساوەتەوە و بە بۆچوونی خۆی کارێکی وای کردووە منیش لێرە جێگیر بم. شەمەندەفەر جارێ نەکەوتۆتە سەر دەور و لە کەشوهەوای شار دوور نەبۆتەوە. لە جیهان ورد دەبمەوە. دەم و چاویم بۆ نابیندرێ. رۆژنامە دیوار ئاسا ئەوی لەمن هەلّاواردووە. هەر کە دەیهێنێتەخوار و لاپەڕەکانی هەلّدەداتەوە بەشێك لە پرچەکانی دەبینم کە رۆژ بە رۆژ تالّی چەرمووی زیاتری تێدەکەوێ.

یەکەم جار کە دیتم سی و چەند ساڵ بەر لە ئێستا بوو، لەبەر دەرگەی ماڵی فاختەدا، هەر هیچ لە ژمێریارە سوێندخواردووەکان نەدەچوو. گەنجێکی ئوڕووپادیتوو بوو کە دەتوت دنیای بە تەواوی لەچنگ خۆی ناوە.

بەر لەوە لەماڵ دەرکەوم، فاختە تەلەفۆنی کرد. دەنگە ناسکەکەی هێشتا هەر لە گوێمدا دەزرینگێتەوە. جیهان کە تەلەفوونەکەی هەڵگرتبوو بە هێماوە پێمی وت:

مێلۆدییە.

جیهان بە فاختە دەڵێ مێلۆدی.

ئێستاش هەر پێم سەیرە کە ئاشقی ئەو نەببوو. فاختە لە گشت ئەو کیژانەی دەیانناسم شەنگ و لەبارترە.

یەکەم جار کە دیتم ساڵی چوارەمی دواناوەندی بوو. مامۆستاکەمان تازە هاتبووە ژوور کە دەرگەی پۆلەکەمان کەوتە سەرپشت. فاختە بە کەلێنی دەرگەدا سەری بە ژوورێدا کرد، بە دەم بزەوە وتی: ئیزن دەدەی مامۆستا، من لە دیوی ماموستاکان بووم، قسوورم نەبوو، کاتیبە ئیشی پێم بوو.

مامۆستا بە ئاماژەی سەر، ڕێگەی دا بێتە ژوور. جوان و دەلال و بالابەرز بوو. پرچەکانی لە پشت سەرییەوە گلۆڵە کردبوو. بالاپۆشەکەی* پاقژ و ئوتوو لێدراو بوو دەتوت بە لەشیەوە سەما دەکا. منالەکان مەحوی تەماشای بوون. تەنانەت مامۆستاش بە بزەیەکی پەسندانەوە لێی ورد بۆوە. فاختە چاوێکی بە مێزەکاندا گێڕا. شوێنێك لە پاڵ من بەتاڵ بوو، بە ئاماژەی مامۆستا هات لە لام دانیشت. کشامەوەو لە ژێرەوە چاوێکم لێ کرد. بێ ئەوە سەرنجێکم پێ بدا کتێبەکانی نایە سەر مێز. کە زەنگ لێدرا هەتا سەرم وەرسووڕاند لەپڕ دەرپەڕیبوو و ون ببوو. دیم لە حەوشە لەتەك چەند کیژی پۆلی سەرتر دەئاخوێ. دەتوت لەگەڵ گشت قوتابخانەدا دۆستە. قارەمانی والیبالی قوتابخانە بوو. سەعاتێك دواتر کە قوتابیان بەڕیز وێستابوون و مودیر و کاتیبە هەواڵ و بەرنامەکانی قوتابخانەیان بۆ منالان شی دەکردەوە، لە سووچێك وێستابوو. هۆی ئەم کارەی لە منالان دەپرسم.

دەڵێن: هەر لە پارەکەوە بەرنامەی ڕۆژانە قوتابخانە دەخوێنێتەوە. مەگین نازانی وێژەری رادیۆیە و هەر بۆیە خاتوونی مودیر هەڵیبژاردووە.

کەیف خۆشم کە لە پاڵ من دادەنیشێ، دیارە لە مانەوەشی دڵنیا نیم. ئەوجار کە دێ، هێشتا دانەنیشتووە، رووم تێ دەکا و دەپرسێ: ناوت چیە؟

له وەڵامی دا دەڵێم: کاغەز و قەڵەمت لە لایە؟
-بۆ گەرەکتە مەسنەوی بخوێنییەوە؟
-شتێکی لەو بابەتەی.
مامۆستای بیرکاری وەژوور دەکەوێ و قسەکانمان بە ناتەواوی دەبڕێتەوە.
دوانیوەڕۆ لەکاتی چوونەوەماندا دەبینم لەپێش منەوە دەڕوا. لە نێوان بیگەمێ و نەیگەمێدا دڕدۆنگم. لە پێچەکەی سەری کۆڵاندا وەردەچەرخێ، کە چاوی پێم دەکەوێ، لە سەرم ڕادەوەستێ. خۆشحاڵ دەبم و باوی هەنگاوەکانم خۆشتر دەکەم. بەقەدەر بستێك لەمن باخۆشترە. ئێرەییم بە جوانییەکەی دێ. ناوەکانم دووپات دەکاتەوەو دەڵێ: نەکا تۆش گرفتی منت بێ؟
-گرفت؟
-کە ناچار بی بەڵگە بۆ ناوەکەت بێنییەوە.
-نا، ئاواتی ئەوەم هەر لە دڵدایە کە ناوم بە کێ بڵێم کە لێم نەپرسێ کامیان؟
-سەرەڕای ئەمە ئەم گرفتە ڕۆژێك و دووان نیە کە مرۆڤ دڵی بەمە خۆش بێ کۆتایی پێ دێ.
-گرفتی تۆ چیە؟
-ناچارم بەڵگە بۆ ناوەکەم بخەمە ڕوو، بڕێ جار حەز دەکەم بەو کەسانەی کە ناوی کیژ یا کوڕ بوونی فاختەم لێ دەپرسن بێژم: ناوی منیان ناوە فاختە هەتا مرۆڤە بە ئاوەز و بێ ئاوەزەکان لێك هەڵاواردرێن.
یەکێك دەناسم کە کیژەکەی ناو ناوە تەراوەت، کیژە کە هێندە کرێتە کە بۆوە نابێ چاوی لێ بکەی.
شانی هەڵدەتەکێنێ: منیش «ماریا کالاس»نیم. دیسان تۆ باشتریشی. کەس ناشێ ئەتۆ بچێژێ هەتا بزانێ سوێری یان شیرین.
پاشان دەڵێ: نەنکم دەنگێکی خۆشی بووە و لە نێو ژناندا جار وبارە گۆرانی چڕیوە. بەم هیوایە کە منیش ببمە شتێکی وەك ئەو، ناویان نام فاختە، دڵیان بەمە خۆش بووە.
-کچەکان دەیانوت وێژەری رادێوی.
-بە پێچەوانەیان تێگەیاندووی، وێژەری چی. حەوتووی یەك دوو ڕۆژ ئەگەر کارێکیان بێ بانگم دەکەن شێعرێك، بابەتێك دەخوێنمەوە.
-دەپرسم: گۆرانیش دەڵێی؟
وەردەچەرخێ و بەسەر سوڕمانەوە سەیرم دەکا: بۆچ لات وایە گۆرانی دەڵێم، مەگین گۆرانیبێژم؟

-ئەی خۆت نەتوت نەنکت گۆرانیبێژ بووە؟

بە جەختەوە دەڵێ: گۆرانییەك، نەك گۆرانی. ئەویش بۆ دۆستەکانی.

-کەوابوو تۆش دەبێ گۆرانیمان بۆ بچڕی.

دەڵێن نەنکم دەنگی بە ڕادەییەك خۆش بووە کە کاتێ لایە لایەی بۆ منالان وتووە پەلەوەرەکانیشی سیحر کردووە، ئیدی تا چەندە دروستە خوا دەزانێ. باوەگەورەم پێی وتووە فاختە. لەو دەمەوە ناوی من دەنێن فاختە.

-دەیجا خۆ شتێکی خراپ نیە.

-ئەگەر دەنگم وەکوو ئەو بووایە ڕەنگ بوو بمتوانیبا کاروکاسبییەکی لەبار بۆخۆم وەدۆزم، بە داخەوە ئەم شتانە بە داواکاری جێبەجێ ناکرێن.

لەو ڕۆژەوە بە یەکەوە دەچینە قوتابخانە و دێینەوە. ڕۆژێك کە لە زەنگی دەرگەکەیانم داوەو چاوەڕوان ماوم، لە پشت سەرمەوە دەنگی پێ دەبیسم. دەگەڕێمەوە، پیاوێکی گەنجی پۆشتەو تەڕپۆشی چاویلکەی دژە هەتاو لە چاودا، بەرەولام دێ. دڵم دەگەشێتەوە. لە دەم دەرگە دەوێستی. بە نیشانەی سلاوکردن سەرێکم بۆ دەلەقێنێ و جەرەسی ماڵەکە لێدەدا. سووکە سلاوێك دەکەم و لام وایە بێشك لە دۆستانی مێهرانی برای فاختەیە. لەگەڵ ئەو کوڕە گەنجانەی کە دیومن جیاوازە. نازانم چۆن، بەلام هەستی پێ دەکەم، لە شێوە ڕاوەستانەکەیەتی، یان لەبەرکردنی جلو بەرگەکەی؟ لەو چەشنە سلاوەی لێمی کرد، یان لە بزاڤی دەستی کەجەرەسی لێدا و کشاوە دواوە؟ حەزم لێ نیە سێرەی لەسەر هەلگرم. بۆنی ئۆدکلۆنەکەییم بۆدێ و هەناسەیەکی قووڵی بۆ هەڵدەکێشم...

فاختە لە پشت دەرکەوە دەقیژێنێ: هاتم، هاتم، دایە من ڕۆیشتم. مالاوا.

دەرگە دەکاتەوەو هەر لەو کاتەدا کە دەستی دەبا دەرگە پێوەدا دەڵێ: باسو خواس؟ هاتم، خۆ وەدرەنگ نەکەوتووین دیسان داتروسکاوی*؟

کە چاوی پێمان دەکەوێ قسەکەی ناتەواو دەمێنێتەوە. هەر سێکمان لە یەکتر دەڕوانین، پیاوە گەنجەکە بە بزەوە سلاوێك دەکا و دەپرسێ: مێهران لە ماڵە؟

روو لە من دەکا و دەڵێ: ئاگام لێ نەبوو تۆ جەرەست لێداوە.

تەنانەت ئاخاوتنیشی جیاوازە، جیاواز لەگەڵ ئاخاوتنی براکانی من یا کوڕەکانی دیکە. وشەکان رەوان و لێك و لەبار دەردەبڕێ و سەر و بنی هیچ وشەیەك ناقرتێنێ. کە قسەی کرد ڕێك لە دەموچاوم ڕاما.

فاختە دەگەڕێتەوە دالان و دەنگ هەڵدەبڕێ: مێهران، جیهانبەخش.

دەردەپەڕێتەدەرێ و دەڵێ: کەرەمکە* ژووری.

مێهران لە پەنجەرەی نهۆمی سەرەوە، سەری دێنێتەدەرو دەڵێ: جیهان وەرە سەرێ، هەر ئێستا ئامادە دەبم.

وڕ و بێدەنگ وەڕێ دەکەوم، لەخۆم ناگەم.

فاختە لەبنەوە لێم ورد دەبێتەوە. لەباسکم دەکوتێ: ئەوڕۆ بۆچ هێندە بێدەنگی ، هۆشت لەکوێیە؟ کەشتییەکانت وەژێر ئاو کەوتوون؟

هەوڵ دەدەم لە سەرەخۆ بم و دەنگم ئاسایی بێ. دەپرسم: ئەوە کێ بوو؟

-دۆستی مێهران. یەکێك لە سێ تفەنگدارەکان.

-سێ تفەنگدار؟

-ئا ئیدی، جیهان، ئەمیر و مێهران.

-سێ تفەنگدارەکان خۆ چوار کەس بوون.

-باشە، ئەوانە سێ تفەنگدارە ئێرانییەکانن. جیهان دوای وەرگرتنی دیپلۆم چووە فەڕانسە. ئەمیریشت کە دیوە.

-دەی؟

-ئەوە دوو ساڵە لە فەڕانسەیە.

-ئەی لێرە چی دەکرد؟

-ئەوەی کە تۆ دیتت ڕۆحەکەی بوو، بۆ زەماوەندی خوشکەکەی هاتووە ئیدی، بۆ خوێندن چۆتە فەرانسە، خۆ دوور نەخراوەتەوە.

سەرم با دەدەم.

مێهران ئەوەندەی بە جیهان هەڵاگوت شەکەتی کردین. دەڵێ بەرنامەکانی بەڕیز و بە دوای یەکدا بەڕێوە دەبا. بەرێکەوت چوونە پاریسەکەشی هەروا بوو. بەر لەوە کۆتایی بە تاقیکارییەکانی دیپلۆمی بێنێ لێبڕاوە بچێتە دەرەوە. مێهران دەیوت: ئەوکاتە کە ئێوە خەریکی تاقیکارییەکانی چوون بۆ زانکۆن و ئارەق دەڕێژن، ئەمن پەساپۆڕتم وەرگرتووەو لە سنوور وێستاوم.

سەروچاوم گەرم داهاتووە. دڵم بێ پشوو دەکوتێ، هەموو بیر و هۆشم لای فاختەیە کە خەریکی پێهەڵاگوتنی ئەوە.

ئاگادار دەبێتەوەو هار و هاج پێدەکەنێ. بەرەو ڕووم دەوەستێ، قۆڵم دەگرێ، لە چاوەکانم ورد دەبێتەوەو دەڵێ: با سەیرت کەم، سەیرت کەم...؟

که ئاوا له هەمبەرم دەوەستێ جیاوازی بالآمان زۆرتر دێته ڕوو، تاڵگەڵێکی پرچەکانی بەسەر دەمو چاویدا پەرێشان بۆتەوەو چەشنی گلۆڵە ئاوریشمێك ملی داپۆشیوه، ڕەنگە قاوەییەکەی هاوڕەنگی چاوەکانی لە ژێر ڕووناکیدا دەبریسکێتەوە. ڕووی لێ وەردەگێڕم. لە هەوڵی درێژەدانی ڕێگەدام، بەڵام ئەو لێم نابێتەوە. دەموچاوی لێم نزیك دەخاتەوەو ناچارم دەکا لە چاوەکانی ورد ببمەوە. هێدی وەلای دەنێم و دەڵێم: چ ببینی، مرۆڤێکی غەریبە بوو گەرەکمە بزانم کێ بوو. هەر هێندە ئیتر.

لاساییم دەکاتەوە: هەر هێندە ئیتر، هەرهێندە ئیتر. هەر بەو سانایییە، ها؟

ئەرێ وەڵڵا.

دیسان پەلپم پێ دەگرێ، دەستەکانی دەخاتە سەرشانم و دەڵێ: لە سەری کۆڵانەوە بە یەکەوە هاتن؟

نا بەخوا. لەبەر ماڵی ئێوە وێستابووم کە هات.

بڵێ بە گیانی دایکم.

بە گیانی دایکم.

نانا بڵێ بە گیانی ڕۆستەم.

دەڵێم: ڕۆستەم لەم نێوەدا چکارەیە دەیهێنیتە نێو ناوانەوە.

لە سەعاتەکەم دەڕوانم و پێشانی دەدەم: دەزانی سەعات چەندە؟ وەدرەنگ کەوتووین.

بۆ خەم نابێ. هەتا بۆم لەبنی کوولەکە نەدەی وازنایەنم.

بە تووڕەییەوە دەستی وەلا دەنێم و دەڵێم: لە جەرگەی شەقامدا ڕاتگرتووین کەچی؟

بە دڵمەندییەوە سەری با دەداو وەپێش دەکەوێ.

ئەو کە ئازیزترین و نزیکترین دۆستمە، نازانم دەتوانم چی پێ بڵێم؟ هەر بەڕاستی لە بابەت ئەم گەنجەوە، ئەم جیهانەوە کە لەبەر دەرگەی ئەوانەوە لەپاڵ مندا وێستابوو و ساتێك، تەنیا ساتێك سەیری کردم، دەشیا چ بڵێم؟

* * *

## ( ٢ )

ئافرەتە رۆژنامە فرۆشەکە هەروا چاوی لەمنە، هەر بەڕاستی نازانم ئاخۆ دەتوانم لەگەڵ ئەو چاوەی کە لێم دەڕوانێ بەڵام نابینێ ڕابێم، بەڵام ئافرەتەکە ڕەحەت و ئاسوودە دینواند. چاوێکی لە کڕیارەکانی دەکرد، ئەو رۆژنامەو چوکولاتانەی هەڵیان گرتبوو حەساو دەکرد و پارەکەی وەردەگرتن و خەریکی بەڕێ کردنی کڕیارێکی دیکە دەبوو.

باوکم کە بۆ یەکەم جار چاوی بە بۆتکەکانی رۆژنامەفرۆشی کەوت وتی: ئەگەر بۆتکەیەکی بچکۆلەی دەرمان فرۆشی لە پاڵ ئەم بۆتکانە دانێن ڕمێنی زۆر دەبێ.

باوکم لە کۆنە دەرمانسازەکانە، دەرمانخانەکەی لە هەموو شتێکی ئەو دنیایە لە لا ئازیزترە. هەر لە سەرەتاکانەوە بیری لە بابەتێکی جیا لەمانە نەکردۆتەوە. دەرمانخانەکەی نزیك ماڵی خۆمانە. هەر بە بۆنەی ئەم دەرمانخانەوەیە کە لەمێژ ساڵە لەم گەڕەکە دێرینەیە بنەمان گرتووە. هاوسێکان یەك یەك و دوو دوو لەوێ باریان کردووە، باوەکوو گەڕەکەکەمان بە دوای کۆچی دایەگەورە و باوەگەورە ئەو رەنگو بۆی جارانی نەماوە، بەڵام ئەوانەی ئێمە واتا دایك و باوکم و پوورەکانم تەنانەت ئێستاش هەر لەوێ دەژین. دایکم چاك دەزانێ ئەگەر کوو باوکم و دەرمانخانەکەی لێك جیا بکاتەوە، نە باوکم بەرگە دەگرێ نە دەرمانخانەکەی.

دەرمانخانەی باوکم بەشێك لە ماڵ و خاوخێزانەکەیەتی. کڕیارەکانی بە ناو دەناسی و ڕای ئەو بۆ تاقمێکیان لە نوسخەی پسپۆڕەکانیش بە نرخترە. لەو کاتەوە کە بەساڵاچووتر بووە، خۆی کەمتر دێتە بەر دووکانەکە ژوورێکی بچکۆلەی لە پشتەوەی دووکانەکەیدا هەیە کە لە سەعات چوار بەو لاوە دەبێتە ژوانگەی دۆستانی هاوتەمەن و هاودەورەکانی کە بە یادی سەردەمی گەنجایەتییان دەسدەکەن بە هەرزە چەنەیی* و تریقە و پێکەنین. لەو نێوەدا بە چەند نەخۆش رادەگا کە زۆربەیان منداڵ یان ئەو بە ساڵاچووانەن کە قوونەبان و وازی چوونە

دوکتۆریان نیــه و زۆرتــر بڕوایــان بــه ڕاو ئــەزموونی باوکمــه هــەتا دوکتــۆره گــەنج و تــازه پێگەیشتووەکان.

دەرمانخانه هەموو ئێمەی به خۆیەوه خەریك کردووه. برا گەورەم دەرمانسازی خوێنــدووەو به دوای تەواو کردنی خوێندنەکەی پێشنیاری به باوکم کرد ئەوێ مــەزنتر بکــا. بــاوکم ملــی نەدا. دەرمانسازێکی گەنجیشی هەبوو که نوسخەکانی دەپێچاوه. دوکتۆرێك که لەگەڵ خوشکم زەماوەندی کرد، دایکم دەڵێ: یەکتریان خۆش دەویست. بەڵام ئەمن دەزانم خوشکم ئاشقی ئەو ببوو.

گەڵاڵەی دەرمانخانەی شەوانەڕۆژی بۆ یەکەم جار باوکم به زەینی گەیشت. دایکم بێ ئــەوه شتێکی لێ تێ بگا بوو به بنیاتنەری ئەم بیره، جارێکیان وتی: ئەگەر کەس دەنگی لێوه نەیه، دوکتۆر شەوانەش دەرمانخانەکەی داناخا و پێشی ناخۆش نیه لەوێدا بخەوێ.

باوکم بێ هیچ قسەو باسێك، بیرەکەی دایکمی قۆستەوه.

براکەشم لەو نامێنێتەوه. هەموو بیرو هۆشی دەرمانخانەکەیــەتی، دۆســت و ناســیاو رووی نابینن. براژنم ئەو هەوایەی بەدڵ نیه و وەك دایکم ناتوانێ بڵێ: هەرواباشتر که خۆی لــه مــاڵ نیه بەردەست و پێم بگرێ.

دیاره که بارودۆخی دایکم جیاوازه. بنەماڵەکەمان دایــم و دەرهــەم خــەریکی هاموشــۆی ماڵه یەکترین. باوکم وتەنی ئەگەر کەسێ نەمانناسێ نازانێ کێ له کوێ دەژی و کــێ منــاڵی کێیه؟

پووره پەری لای وایه ئەوان یەکەم دانیشتووانی ئەم گەڕەکەن و حــەقیان بەســەر ئــاووگڵی ئەوێوەیه. له راستیدا ئاوەدانی گەڕەکو تەنانەت چیمەنتۆی شەقامەکانیشی هەر به هۆی ئەوان و دەستڕۆیشتووی پاپا واته باوەگەورەمەوه بووه.

بنەماڵەیەك له سەرووی کۆڵاندا نیشتەجێیه و یەکیان له سەری کۆڵان.

پووره ماه و غولام خانیش که هەر شەقامێك ئەولاترن. لەوەی که خۆیان له دیــتران جیــا کردۆتەوه سەرکۆنه دەکرێن و تاوانەکەش دەخەنه مل غولام خان.

له سەردەمێکی وەك ئیمڕۆدا رەنگه بەدەگمەن هەڵکەوێ بتوانی گەڕەکگــەلێکی بــەم ڕاده یەکدەست بدۆزیەوه. تاقمێك بەمە دەڵێن بەرابەری و دێمۆکراسی. بــەڵام ئــەمن نــاوی دەنــێم چەشنێك بێ نموتی و شکڵ و شێوەی پێشــووم لا پەســندتره. ئەگــەر ئەمــە بێــژم ســتاره بــه

کۆنەپەرستم دەزانێ. ئەگەرچی بە وتەکەی دڵم دێشێ بەڵام پێموایە حەق بەوە. مەگین من لەگەڵ دایك و باوکمدا شتێکی جیا لەمەم کردووە، کێ هەیە داوەری بکا؟

خێزانەکانی ئەو سەردەم جیاوازییەکی بەرچاویان لەتەك یەکتردا نەبوو، لەهەر حاڵدا داپیرێك و باوەگەورەیەك لە ئارادا بووە. مناڵان پوور و پلك* و خاڵۆ و مامۆیان بوو. نۆکەر و قەرەواش دەهاتن و دەچوون. وەك نەنەگەورە و نەنە دەدری کە لە ماڵ باوەگەورە و خانم خانمێدا دەژیان و ببوونە ئەندامی بنەماڵە.

ماڵی باوەگەورەو خانم خانمێ باشترین ماڵی دنیا بوو. بەتایبەت ئەو رۆژانەی باوەگەورە لە سەفەردا بوو. باوەگەورە بەو باڵا کورتەو قژە چڕەو چاویلکەیەکی کە هەرکات دەهات شتێ بخوێنێتەوە لە چاوی دەکرد، دەتوت دێوەزمەیە، دێوەزمەی نێو حەقایەتەکان. سەرو کەلارەی دێوەزمەکان کە هەموو جارێ لە حەقایەتێکدا قووت* دەبۆوە، لەژێر چارشێوی نەنە دەدریدا خۆم حەشار دەدا و لەژێرەوە لە رۆستەم ڕادەمام. ئەو تلەکانی بە یەکەوە قوفڵ دەکرد و سەری بەر دەداوە.

باوە گەورە کاتێ بەرزو بە پەلە دەئاخاوت دەبووە بوونەوەرێکی ترسێنەر کە باشتر بوو کەسی لە دەور و بەری نەبێ، ئەمن نەدەترسام بەڵام ترسم بەوەوە ناسی. لە تیچسرەواندندا زۆر تەڕدەست بوو، ئەگەرچی قەتی لەمن نەدابوو بەڵام شێوە لێدانەکەییم دیبوو. کاتێ لە لای دەبووم دڵنیا نەبووم چ شتێ چاوەنواریم دەکا. رۆژێکیان پیاوێکم چاو پێکەوت کە دەیانوت چەند کەسی کوشتووە. لەو ڕۆژەوە بۆم دەرکەوت باوەگەورە هەر جارەی کە دەچێتە دێ چەندکەس دەکوژێ. بەڵام چون خاوەنی دێیەکەیە کەس ناوێرێ متەقی لێوە بێ، کە بە ڕۆستەمم وت لەترسان داچڵەکا. خۆم ترسم لێ نیشت. هەرکات لە باوەشی دەکردم دەستیم دەگرت و بە سەرنجەوە لێی ورد دەبوومەوە هەتا بەڵکوو پەڵە خوێنێك بە دەستەکانییەوە ببینم. هەرکە لە مەبەستم دەگەیی پێدەکەنی و دەیوت: دیسان خەریکی چاو لە لەپی دەستم دەکەی، بڵێ بزانم چی تێدا دەبینی؟

هەوڵم دا خۆم لە باوەشی دەربهاوێم و لە ژێر چارشێوی خانم خانمێدا خۆم وەشارم.

ئێمە بە باوەگەورەمان دەوت پاپا، ئەمەش لە داهێنانەکانی پوورە پەری بوو کە گۆیا ناوی پاپای لە فیلمێکدا بیستبوو یا لە کتێبێکدا خوێندبوویەوە کە وتبوویە مناڵەکان بە باوەگەورە بڵێن پاپا و بە دایە گەورەش بڵێن مامی. دایە گەورە وتبووی پێویست بەمە ناکا.

پووره پەری وتبووی ئاخری هەر دەبێ شتێکی بانگ بکەن، وەنیە؟

- باشە مەگین هەر ئەو خانمە چ ئیرادێکی هەیە؟

پووره پەری بە ڕووهەڵماڵاوییەوە شانی هەڵتەکاندبوو، بڕۆی تێك نابوو و وتبوی: خانم، خانم.

ناهید کە نەوەی نۆبەرەی بوو و زمانی تازە کرابۆوە، بە لاساییکردنەوە لەو دەڵێ: خانم خانمێ.

پووره پەریش درێژەی وتەی منداڵەکە دەگرێ و ناوی دایەگەورەم دەبێتە خانم خانمێ. نەنەگەورە دەڵێ: ئەو منداڵە بەستەزمانە ناشێ خانمێك دەربڕێ. وەی لە دەست ئەو پەرییەی.

بەڵام نازناوی خانم خانمێ ناگۆڕێ.

شەمەندەفەر دەگاتە کەشوهەوای دەرەوەی ئێزگە. لە دەرەوە دەڕوانم. خۆر مەلاسی ژێر هەورە و هەوا تەزی و سەهۆڵبەندان. دەترسم گەرمای دڵگری هەتاوم لەو رۆژە هەوری و تاریکانەدا لەبیر بچێتەوە.

ئێستاش هەر هەست بە فێنکایی ئەو بایە دەکەم لەکاتی وەژوورکەوتنتدا سەروچاوم ختۆکە دەدا. جاکەتەکەم لەخۆم وەردەپێچم. لە بزاڤی ئەو هەورە گەواڵ گەوالانەی کە هەرکام بە چەشنێ بەرەو لایێ دەخوشن ورد دەبمەوە. هەوڵ دەدەم لە وێکچوونەکانیان لەتەك شتگەلی دەوروبەری خۆم بگەم و وەك سەردەمی منالێم حەقایەتیان بۆ بکەم...

*منالییەکەم لەو سەردەمەوە لەبیرە. لەو*
*رۆژەوە کە تۆ هاتیە ماڵە خانم خانمێ. لەو*
*رۆژانەوە کە چیرۆکەکانمان لەتەك یەکا*
*داهێنا،ئەمن دەمگێڕاوەو ئەتۆ دەتخستنەوە*
*سەریەك. ئەتۆ دەتگێڕاوەو ئەمن بە ئاکامم*
*دەگەیاندن.*
*شەوانی هاوین کە بە یەکەوە لەسەر تەختی*
*حەوشە خۆمان لە گەز دەداو حەقایەتی*
*هەورەکانمان دەگێڕایەوە.*

*بەبێ تۆ هیچ بیرەوەرییەکم لەو سەردەمەدا*
*نیە و ئەگەر تۆ نەبوایەی منالّی خۆمم ون*
*دەکرد. هەزار سالّ بەسەر تەمەنی منالّیمدا*
*تێپەڕیوە. هەر دەلّێی لە سەردەمێك و*
*دنیایەکی دیکەدا قەوماوە. جار و بارە ترسم*
*ڕێدەنیشێ کە نەکوو ئەوانم لەخەودا بینیبێ...*

هەموو شەوێك کە چەند پەلّە هەورێکم لە ئاسماندا دەدی، کتوپڕ بیانوویێکم دەناوەو دەچوومە مالّە خانم خانمێ هەتا لەتەك ڕۆستەمدا حەقایەتی هەورەکان بگێڕینەوە. ڕۆستەم ئەوانی بە تەرز و شێوەی مالّ و دێیەکەیان دەشوبهاند و ناوی لێدەنان. جارێکیان پەلّەهەورێکی گەورەی لاکێشی پێشاندام و وتی: دایکم لەوێدا خەوتووە.

پرسیم: بۆ لەوێدا خەوتووە؟

دەستی بە سەری داهێنا. ئەمە یەکێ لەو کارانە بوو کە خووی پێ گرتبوو، پێ دەچوو قژەکانی بۆ ئەو وەك پالّپشتێك وابن. کاتێ گەورەکان قژیان کورت دەکردەوە شەرم دایدەگرت و دەسەلاّتێکی نەدەما. هەر کە قژی درێژتر دەبوو دەتوت ئازایەتیشی دەگەیشتە ئەوپەڕی خۆی و بێدەنگی دەشکاند.

گەورەکان قەت لەوە ناگەن کە چ شتێ بۆ منالاّن بنچینەیی و گرینگە، بەتایبەت ئەو منالاّنەی نە دایکیان بێ و نە باوك.

وتی: ئازیزم* دەلّێ: چۆتە ئاسمان و لەو سەرەوە لێمان دەڕوانێ.

پرسیم: بۆ نایەتە خوار؟

وتی: چونکە مردووە، کاتێ یەکێك دەمرێ، دەڕواو ئیتر ناگەڕێتەوە.

پرسیم: ئەی ئازیزت کێیە؟

نەختێ لە فکرەوە چوو و وتی: ئازیزم نەنەگەورەمە.

-دایکی دایکت یا دایکی باوکت؟

دیسان دەستی بەسەری داهێنا و وتی: نازانم.

*ئەوەی لە تۆ و لە هاتنت بۆ مالّەکەم لەبیر*
*ماوە، ئاوێتەیەك لەو بیرەوەرییانەن کە بە*
*هۆی دیترانەوە وتراون و بیسراون.کاتێ ئەوانە*

*دەخەمە پاڵ یەك، دەشێم بێژم یەکەم ڕۆژی*

*هاتنتم بیر دەکەوێتەوە...*

لە لای چارشێوی خانم خانمێ، تازە لە خەوی دوانیوەڕۆیە رابوومە و چاودەبڕمە کوریژگەیەکی تەنیا کە لە نێوەڕاستی پێ پلەکانەوە ڕاوەستاوە. چ شتێکت بۆ من نائاسایی نەبوو، نە ناوت، نە ڕەچەڵەکت، نە پرچە قرژنەکەت. نە جلکە نائاساییەکانت کە بۆ بەرت فش و فۆڵ بوون، هەر بەتەنێ نیگاکانت گێژیان دەکردم.

پاپا هەروەك ئەو سندووقە میوانەی کە دەیهێنانەوە، ئەویشی لە دی ڕا هێنابوو.

دەستی منالەکە رادەکێشێ و دەیهێنێتە جەرگەی قادرمەکان. ئەوجار ڕوو لە خانم خانمێ دەکا دەڵێ: ها، نانخۆرێکم بۆ هێناوی.

-ئەوەت لە کوێ هێناوە، ئەوە چیە ئیتر؟

پاپا دەڵێ: ئەم رۆستەمە کوڕی محەممەدە. هێناومە فێرە کاری بکەی. لەبەر دەستی نەنکەکاندا هەڵسووڕێ. دایکی نەساخە، ناتوانێ پێی ڕابگا.

-ناوی چیە؟

-وتم رۆستەمە ئیدی.

-حەی ، ئەوە رۆستەمەکەیە؟

خانم خانمێ سەری وەرسووڕاند و وتی بۆ خاتری خوا، بە شێوەییێك کە هەر من بیستم.

سەر هەڵدێنم تا بزانم نانخۆر یانی چی.

وردیلە، لەڕ، داماو و چڵکن و کرێتە. سەری بەر داوەتەوە، دەموچاوی لەنێو ئەم کۆمە پرچە ڕەشەدا زەحمەت دەبینرێ. لەمن بچکۆلەترە.

ئەوان وتەنی پاپا هێنابووی گیانێکی وەبەر بێتەوەو بتوانێ خەریکی کار بێ. بەڵام هێشتا دوو حەوتووی لانەدابوو کە خانم خانمێ دەستی گرت و بەڕێی کردەوە دێ.

وتی: ئەم تفڵە بەستەزمانە، بێ دایك و باوك دیق دەکا. ئیدی هەر ئەوە ماوە منالی خەڵکیم بە ملی دابێ.

چەند مانگێك ڕابرد پاپا دیسان هێنایەوە. ئەم جار پوورە ماه گێڕایەوەو ساڵێك دواتر بۆ جارێکی دیکە هێنایانەوە شاری. مەزنتر ببوو، پاپا هەتا جەرگەی حەسار پالی پێوەنا. قیژاندی: چیدی مەیگەڕێنەوە. حەز دەکەی باوەژنی بیکووژێ؟ باوکی خۆ پیاوەتی ئەوەی نیە لە دەمی ئەو دەڕاشۆیە* بداتەوە.

بە شێوەیەکی زۆر نالەبار لە جەرگەی حەساردا گرمۆڵە ببۆوە.

پاپا بەرەو چێشتخانە دەنگی لێ هەڵێنا: فاتم، دەدری، بە ملی شکاوتان لەکوێن؟ یەکتان بێ ئەمە بەرنەوە.

نەنەگەورە زراو بردوو لە حەساری پشتەوەڕا هات و بە دەم چارشێو لە خۆ شەتەکدانەوە سلاوی کرد و بەرەو منالەکە چوو.

خانم خانمێ سەیری منالەکە دەکا کە پەشێو و داماو لە جەرگەی حەساردا وێستاوە، لەپڕ لە جێوە ڕادەبێ. چارشێوەکەی لە ژێر مندایە و لەسەری مەلاس بوومە، بەتامەزرۆییەوە تێی دەڕوانم، بە تووڕەییەوە لە ژێرمی دەردەکێشێ. سەر هەڵدەبڕم و بەسەر سووڕماوی لێی ورد دەبمەوە. لە تووڕەبوونەکەی ناگەم. پاپا پاڵی وەشیپانەی دەرگە داوە، لەسەر ئەویش دەبۆڵێنێ. لەو سەرو بەندەدا پوورە ماهیش لەو لاوە پەیدا دەبێ. خانم خانمێ چارشێوەکەی لە نێوقەدی هالاندووە و نەنەگەورە دەستی ناوەتە نێو دەستی منالەکەوە. پووری چاوێك لە ئەوان و باوەگەورە دەکا و لووتی تێك دەنێ. باوەگەورە هەر کە چاوی پێی دەکەوێ بەرەو بنەبانی هۆدەکە دەچێ.

پوورە ماه گەورەکیژی خێزانە و بۆ خۆی کەسێکە. کزو بالابەرزە. پرچە درێژ و تاس و لووسەکەی لە پشت سەرییەوە گلۆلە دەکاو دەیانخاتە ژێر سەرپۆشەکەیەوە. جارێکیان کە پرچەکانی لێك والاو پەخش و پەرێشان کردبوو، بە بینینی ئەو رەنگە روون و تروسکەدارە و شێوە حالەتە جوانەی سەرم سوڕماو پرسیم: ئەم پرچە جوان و کەشخەیە بۆچ دەشارییەوە؟

وتی: ئاوا ئاسوودەترم، وازی ئەمەم نیە بە بەریاندا بێم و بچم.

پوورە ماه لە ڕوالەتدا ئاوێتەیەکە لە پاپا و خانم خانمێ. بەلام خۆی وتەنی خوو و خدەی لەهیچ کەس ناچێ. پاپا وتبووی: ئەو دەبوا کوڕ بوایە، بوو بە کچ.

پوورە ماه، بە پێچەوانەی ویستی پاپا چووبووە قوتابخانەو دیپلۆمی وەرگرتبوو، پاشانیش دیسان هەر بە پێچەوانەی ویستی پاپا ببووە مامۆستای قوتابخانە. بەم هۆیەکە پوورە ماه بە قسەی ئەوی نەکردبوو، نەدەیتوانی لێی ببوورێ. هەر بەم هۆیەشەوە لەگەڵ کیژەکانی دیکەی واتا دایکم و پوورە پەریم توندوتۆڵتربوو. پاپا خۆی بە ڕووناکبیر دەزانێ و دەڵێ زۆر باش بە جیاوازی نێوان ژن و پیاو دەزانێ. شوێنی ژن لە ماڵ و جێگەی پیاو لە دەرەوەی مالە. پوورە پەری بەسەر پوورە ماه دەڕوا و دەڵێ: ئێمە بە ئاوری تۆوە سووتاوین.

پووره ماه دەڵێ: به ئاوری خۆتان سووتاون. ئەگەر منیش به قسەی ئەوم کردبا گۆڕانێك له باری ژیانی ئێوەدا بەدی نەدەهات باری ژیانی من تووشی ئاڵووگۆڕ دەهات.

پووره پەری خۆی ڕیچ دەکاتەوە: خەریکی تانه لێدانه.

خانم خانمێ دەڵێ: پەری دیسان دەست پێمەکه.

دایکم هەر هەتا پۆلی شەشەمی خوێندووەو پووره پەری هەتا پۆلی نۆیەم. ئەم بڕیاره عەشیرەییه هەتا ناهیدی خوشکیشم کاری خۆی کردووە. ئەو توانی دیپلۆمەکەی وەرگرێ. هەر که ئەو دوکتۆره دەرمان چێکەره که له ژێر دەستی باوکمدا کاری دەکرد خوازبێنی لێ کرد، وازی له زانکۆ هێنا. بەڵام کوڕەکان به هەر گێره و قەرقەشێك بووایه دەبا خوێندبایان.

پووره ماه هەر له سەرەتاوه کاری خۆی لەتەك پاپادا یەکلاکردەوە. به پێچەوانەی بیرو ویستی ئەوەوە، بووه مامۆستای قوتابخانه — بۆچوونی پاپا ئەمه بوو له بنەماڵەیەکی دەست ڕۆیشتوو و ناسراودا که بەڕەی خۆیان پێ له ئاو دەردەکێشرێ، ئەگەر کیژێك مژوولی ئیش و کار بێ، بۆ ئەو خێزانه عەیبه و پێگەیان دادەبەزێنێ — و به پێچەوانەی ویستی ئەوەوە شووی کرد. پاپا ئەو زەماوەندەی به دڵ نەبوو بەڵام ناچار ملی دا. غوڵام خان شووێك نەبوو که ئەوان دیارییان کردبێ. پاپا وتبووی: نرخ و بایەخی هەر بەم ڕادەیە، بیده بڕواو خۆت لەو گێرەو کێشەیه دەرباز که. ئەمه بۆ تۆ نابێته کیژ. ژنی خەڵکه.

غوڵام خان دەسته پیاو بوو. نه گۆشتن بوو و نه کزەڵۆکه. له لای پووره ماه که دەوێستا گۆشتن دەینواند. دەنگێکی نەرم و گەرمی بوو. دلۆڤانترین دەنگێك که تا ئەم کاته بیستوومه.

لەگەڵ ئەم دەنگه ئەهوەنکەرەوەیه دەشیام هەتا چەند سەعات هەڵکەم. گرینگ نەبوو چ دەڵێ، گرینگی له دەنگەکەیدا بوو. خۆشی به ڕادەی دەنگەکەی دلۆڤان بوو. ئەو تەنیا کەسێك بوو که بۆ من و ڕۆستەم حەقایەتی خوێندبۆوە. هەر ڕۆژنامەیەکی که دەیکڕی ئەگەر حەقایەتێکی تێدا چاپ کرابا، بۆی دەخوێندینەوە. ڕۆژانه نوقمی سێحری ئەو دەبووین و خۆمان لەجێی پاڵەوانەکانی دادەنا.

پووره ماه و غوڵام خان بێ منالن. منالیان نابێ. کەس تێناگا خەتای کامیانه.

غوڵام خان کاتیبی قوتابخانەیەکه که پووره ماه مامۆستایەتی و لەو کاتەوه که غوڵام خان برازاکەی پاپای له قوتابخانه وەدەرنا، دژمنایەتی پاپا لەگەڵ ئەودا سەری هەڵداوه. پووره ماه

دەڵێ: هێشتا حەوتوویێك لە دەست پێكردنی وانەكان رانەبردبوو كە بەربووە لێدان و كوتانی منالّی خەڵكی.

پاپا دەڵێ: غولاّم خان لە كەیەوە بۆتە دەمراست و پارێزەری منالّی خەڵكی؟

- هەر لەو دەمەوە كە بووە مامۆستا. ئەو پسمامەی* ئێمە پێی وایە هەر بە لێدان و كوتان دەبێ وانە فێری منالاّن بكا. غولاّمیش شەرمەحزووری لەگەڵ كەس دانیە.

-هەڵەی جەنابی غولاّم خانی ئێوە لەمەدایە. هەر لە كۆنەوە وتوویانە: «لێدانی گەوران بەتایبەتی مامۆستا بۆ گچكەكان خەلاّتە.»

-غولاّم خان ئەگەر لەم مامۆستایانەی گەرەك بوایە زۆر بوون، مورتەزاش پێویستی بە راسپاردنی ئێوە نەبوو.

-ئێستا وای لێهات بڵێن ڕێز بۆ ڕاسپاردەكەی ئێمە دادەنێ. ئەگەر زۆر زیخە، با تولەیەك بۆ خۆی ڕابگرێ.

پوورە ماه بێ ئەوە وەلاّمی بداتەوە هەڵدەستێ دەڕوا.

هەر لەو ساتەدا سەر و گوێلاكی لووسی لە دالاندا دەركەوت.

پشیلە كەشخەو ڕەنگ خەنەییەكەی خانم خانمێ كە جگە لە خۆی دەستی كەسی وێنەكەوتبوو، پشیلەیەكی بەدحەمەل و لەخۆ باییە، هەر بۆیە پاپا ناوی ناوە لووسی. و خانمێش هەر بۆیە زۆری خۆش دەوێ كە جگە لەو نە كەس دەناسێ و نە گوێ بە كەس دەدا. ئێمەی منالّ ئەگەر خۆشمان بكوژین قسەكانمان بە هێند وەرناگرێ. ئاكارو گرینگیپێنەدانەكانی ئەو دژمنایەتییەكی شاراوەی لە ئێمە دا پێك هێناوە كە لە ترسی خانم خانمێ دەری نابڕین. ئەو دژمنایەتیە لە براكان و كوڕە پوورەكانمدا لەوپەڕی خۆیدایە. لووسی بە هەزار قەمزەو لار و لەنجەوە دێ لە پالّ خانم خانمێ لەسەر چارشێوی نوێژی ڕادەكشێ. خانم خانمێ دەیلاوێنێتەوە و خۆی بە قوربانی دەبێ. ئێمە هێندێ جار بە پارێزەوە لێی نزیك دەبینەوە، دەستمان دەگرێ و دەیخاتە سەر پشتی پشیلەكە هەتا هێدی بیلاوێنینەوە. بەلاّم لووسی لەم چەشنە دەرفەتانەشدا گوێیەكانی قووت دەكاتەوە، ئەگەر نەختێ توندتر دەستمان بە پشتیدا بێنین، هەڵدەستێ دەچێتە دەرێ. ئیزنی ئەوەشمان نیە ڕەپێی بنەین. هەتا دەگەینە بەر دەرگەی ژوورەكە، ئەو وەسەربانی كەوتووەو لەبەرچاو ون بووە.

لووسی بە هەنگاوی هێمن و قورسەوە بە دالاّنەكەدا دێ. سەیرێكی دەوروبەری دەكاو یەك ڕاست بەرەو رۆستەم تێهەڵدەكشێ، چاوێكی لێدەكا. بۆن بە كەوش و دەلینگی شالّوارەكەیەوە

دەکا. ڕۆستەم دەچەمێتەوەو دەستی بە پشتی دادێنێ. لووسی سەری هەڵدێنێ و لمبۆزی لە قۆڵی ئەو دەساوێ.

خانم خانمێ چارشێو بە دەستەوە بەسەر سوڕماوی و سەرنجەوە لەوان راماوە، پاپا کە لەنێو هۆدەوە لە دەرەوەی دەڕوانی برۆکانی بەرەوبان دەبا.

*ئەتۆ سەرت بەرز کردەوە، هەر لەمن ڕامای.*
*دەتوت ورەی ئەوەت نەبوو چاو لە چاوی*
*گەورەکان بکەی، نیگای سەرسوڕهێنەری من و*
*نیگا سەرگەردانەکەی تۆ تێك ئەنگوتن، لووسی*
*لە ژێر پێی تۆ لەسەر عەرد خۆی لە گەزدا بەڵام*
*ئەتۆ دانەوای، بیلاوێنییەوە.*

باوکم باشترین زاوای پاپا و خانم خانمێیە کە دەیوت گشت ئاواتەکانیانی وەدی هێناوە.

باوکم دوکتۆری دەرمانسازەو خاوەنی دەرمانخانەیەکی مەزن و بڕواپێکراوە. خوشکم شەش ساڵ و دوو براکانم هەر یەکەی چوار ساڵ و دوو ساڵ لەمن مەزنترن.

دایکم پاپایەکی دووهەمە. هەر دەڵەی بەشێك لە رۆحی پاپایان لە لەشی ئەودا جێکردۆتەوە. هەر بۆیەشە پاپا فرە خۆشی دەوێ. لەگەڵ هەر مەحبووبێکی هەزار مەحبووبی لە زاری دێتە دەرێ، یەکێکی نەیدێبی، پێی وایە دەبێ چ ئافرەتێکی کەشخە و لەبەردڵان بێ کە ئاوا بە تامەزرۆییەوە بانگی لێدەکا.

دایکم دەستەژنە. داڵگۆشت* و سەوزەڵێیە*. پرچی وەك هی پاپا رەش و کرژ و لوولە، دایمە لە پشت سەرییەوە گلۆڵەی دەکا. وەکوو پاپا کەم دەوێ و گرژومۆن و زمان تیژە. هەتا ئەوەی ئەمن لەبیرم بێ جلوبەرگەکەی هەمیشە فانیلەیەك و دامێنێك بووە، دەتوت سەد دەست فانیلە و دامێنی رەنگاورەنگی هەیە کە لە کاتی خۆیدا دەیگۆڕین و چەند جووت سەرپایەش کە مەگەر لەکاتی خەوتندا دەنا لە پێی نەدەهاتنە دەرێ. ئەگەر شەکەت دەبوو بەخشەخش بە شوێن خۆیدا ڕاکێشی دەکردن. خانم خانمێ کە دەنگی پێی دایکمی دەبیست دەیوت: دیسان دەنگی خشەخشی سەرپایەکانی مەحبووبە دێ. نەنە، هەتا پرتەو بۆڵەی دەست پێ نەکردووە، زوو چایەکی بۆ تێکە.

دایکم بەو ئاکارو کردەوەیەو بیرو بۆچوونەکانییەوە وەکو پاپایە. هەر لەو رۆژەوە رۆستەم پێی ناوەتە ماڵە پاپا هەستم بەمە کردووە. دژمنایەتییەکی لەبن نەهاتووی خوت و خۆڕایی لە تەك ئەودا هەیە. ئەو پرتە و بۆڵەیەی لەسەر منیشی دەکا هەر لەمەر ئەوەوەیە.

بەڵام حەقایەتی پوورە پەری شتێکی دیکەیە. لە ماڵە پوورە پەریدا هەموو شتێ ڕەنگی شادی بەخۆیەوە گرتبوو و پێم سەیر بوو کە پاپا دایم و دەرهەم پرتەو بۆڵەی دەکردو نەدەهاتە ئەوێ. پاپا پاشملە زەمی شووەکەی پوورە پەری دەکرد و پێی دەگوت فۆکۆلی و قێرتی. چونکە هەتا لە دەوری یەکتر کۆوە دەبووین، پەرویزخان وێڵۆنەکەی دەهێنا و هەوای خۆش خۆشی پێ دەژەنی و ئێمەش سەمامان دەکرد. پوورە پەری بەر لە هەمووان ڕادەبوو هەرتك دەستی بە سەر سەریدا تێك دەهاڵاندو لە جەرگەی ژوورەکەدا سەمای دەکردو هەرکام لە ئێمەشی هەڵدەستاند. ئێمە گشتمان سەماکردن لەو فێر بووینە.

خانم خانمێ چاوی لێ دەکردو دەیوت: نازانم ئەو سەمایانە لە کوێ فێر بووە. جۆرێ دەیوت و چاوی لێدەکرد کە دیار بوو خۆی لە هەمووانی پێخۆشتر بوو.

پوورە پەری چکۆڵەترین و دەلال*ترین کیژی خانم خانمێ و پاپایە، واتە هەر شێوەی خانم خانمێ دەدا. خانم خانمێ لەگشت شوێنێ باسی ئەو دەکاو پوورە پەریش پێدەکەنی و دان بە وتەکەیدا دێنێ.

پوورە پەری لەبابەت قەڵافەتەوە چۆتەوە سەر پاپاوە، واتە دەستەیەو لەشە پتەوەکەشی لەگەڵ خانم خانمێ موو لێنادا. چاوەکانی ڕەنگ هەنگوینن، لووتی بچکۆلە و لێوەکانی ئەستوور و هەست بزوێنن.

پوورە پەری و پەرویزخان دوو کوڕی هاوتەمەنی براکانی منیان هەیە. باوە گەورە دەڵێ: ئەو پیاوە ئابڕوویەك بە خێزانەکەمانەوە نایەڵێ.

بە تەمای ئەوەیە ئەگەر هەلومەرجی بۆ بڕەخسێ پوورە پەری پێ تەڵاق بدا. بەڵام خانم خانمێ دەڵێ حەق ئەوە نیە ئێمە چارەنووسیان دیاری بکەین. ئەوە دامانا پێت تەڵاق دا، بۆخۆی و بە دوو منداڵەوە چ بکا. پەری شووەکەی بە دڵەو هیچ ئیدی. ناکرێ کارت پێیان نەبێ؟

پاپا لووتی تێك دەنێ و دەڵێ: بۆ هەرچی ئەمن دەیڵێم تۆ دژایەتی لەگەڵدا دەکەی.
خانم خانمێ دەڵێ: لێگەڕێ با دوو کەسی لێوبەبزەشمان لەم ماڵەدا هەبێ، گرفتێکی هەیە؟

ئەودەم کە پووره پەری پێ گرانی کیژەکەی بوو پاپا چەقەو گوڕەیەکی وای ناوه کە شووی پووره پەری چوو لەو سەری شاری دوور لە گەڕەکەکەی ئێمە ماڵێکی بەکرێ گرت و پووره پەری و منالّەکانی بۆ ئەوێ ڕاگوێست، دیاره پووره پەری هەموو* ڕۆژێ سەیارەی دەگرت و دەهاتە ماڵمان و هەمیشەش بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوه دەچۆوه. پاشان کە منالّەکەی لە دایك بوو — هەر ئەو کیژەی کە من گەرەکم بوو ناوی بنێم ستاره- بە بیانووی ئەوه کە پێی ناکرێ بە منالّ ڕابگا، یا دەبێ یەکێك لە دایەگەورەکان بچێتە لای یا ئەوەتا خۆی بگەڕێتەوه، گەڕاوه ماڵەکەی خۆی، بەڵام پەرویزخان ماڵەکەی ئەوسەری شاری نەدایەوه خاوەنەکەی و زۆربەی کاتەکانی لەوێدا ڕادەبوارد. پاپا ئەوەی پێخۆش بوو و بژیوی پووره پەریشی دەدا هەتا چاوی بە پەرویزخان و وێڵۆنەکەی نەکەوێ. بەڵام پووره پەری دەیوت:

باوکم ژیانی شێواندووم، شووەکەمی لێ ئەستاندووم.

خانم خانمێ پێدەکەنی و دەیوت: واش نیە کە لێی ئەستاندبی. واز لەو نقەنق و نووزه نووزه بێنە.

ڕۆستەم پێمی وت کە پەرویزخان شەوانە دێتەوه ماڵە پووره پەری و سەر لە بەیانی زوو هەڵدەستێ دەڕوا.

پووره پەری دوای چەند ساڵ تێگەیی کە پەرویزخان چووه ژنێکی دیکەی هێناوه. بە دوای ئەوەدا شایی و خۆشی لە ماڵە پووره پەریدا بنەی تێکەوەپێچاو پووره پەری چاوێکی فرمێسك بوو یەکی خوێن. پاپا بە خانم خانمێی وت: ئێستا درۆ و ڕاستی وتەی من وەدی هات؟ ئەو پیاوه هەر پینەیەکی دزێو بوو ئەها.

خانم خانمێ دەستی ڕاوەشاندو وتی: کیژەکەت لێ بەدبەخت و چارەرەش کردم، ئێستا لات وایە هەق بە تۆش بووه.

هەتا ئەوەی کە پەرویزخان ڕۆیی و ئیدی ون بوو. هەر بەڕاستیش پێدەچوو پاپا ئەوی بەدەست یەکێ لە رەعیەتەکانی کوشتبێ. ئەو چەشنە کارانە لە پاپا دوور لە چاوەڕوانی نیە.

پووره پەری تووك و نزای لە پاپا و پەرویزخان دەکرد. بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ جوانترو بەرچاوتر دەینواند. خانم خانمێ دەیوت: منالّەکەم زایە* بوو. بەو گشتە خەم و خەفەتەیەوه مرۆظ حەز دەکا هەر چاوی لێ بکا. ئەگەر ئەو منالاّنەی نەبووایە هەر ئێستا هەزار بێنیکەری هەبوو.

ماڵە پاپا و خانم خانمێ بە هۆی ئەوه نەنەگەورەو نەنە دەدری لێیە لەگەڵ ماڵەکانی دیکە جیاوازه. قاقاو پێکەنینەکانی نەنە دەدری، هەموو ئەو دڵە خورپێیەی کە بە هۆی بینینی

پۆتڕاکی* دێوەزمەئاسای پاپاوە بەدی هاتووە، قەرەبوو دەکاتەوە. نەنە دەدری لەو ژنە گۆشتنە باشانەیە کە هەتا ئێستا دیومە. کاتێ چێشت دەخوا دەستەکانی لەسەر سینگییەوە جووت دەکا، ئانیشکی بەرەو دواوە ڕادەکێشێ، یانی ئەوە بەم لایەدا قورس دەبم. شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و پێدەکەنێ و دەڵێ: خاتون گیان، ئەمن ئەگەر ئاویش بە تەنێ بخۆمەوە ڕۆژ بە ڕۆژ زلتر دەبم.

نەنەگەورە لەژێر لێویەوە دەڵێ: ئاخر خۆ ئەتۆ ئاوی بە تەنێش ناخۆیەوە.

خانم خانمێ دەڵێ: هەر وەها ئاوی بەتەنێش ناخۆیەوە. مرۆڤی تێر لەپێش تۆدا دانیشێ برسی دەبێ. وەڵڵاهی هەرکەس نانی وشکی ئاوا بخوا، دەیکا بە گۆشت.

نەنەگەورە دەڵێ: خاتوون ، قسە لەسەر نان و ئاو نیە. لەبەر بێ خەمیان وەك منالْ وایە. مەگین نابینن چۆن تێکەڵاوی ئەو منالانە دەبێ. خۆ کارێکی عەیب نیە، ژنەتیوە گەلحۆیە، دایە مەمدە بە گورگی و تەنافێنێ دەکا. ئەمن کە سەرم لێ دەرناچێ. هەر بۆ ئەو منالانە باشە.

نەنەگەورەو نەنە دەدری هەرتك خوشکن و هەر لە هەوەڵەوە لە ماڵە خانم خانمێدا کاریان کردووەو لامان وابوو هەتا هەتایەش هەر لەوێ دەمێننەوە. نەنەگەورە بالابەرزو بەخۆ بوو. دەنگێکی بەرزو پتەوی هەبوو. بە زۆربەی بەکاروباری نێومالێ ڕادەگەیی. نەنە دەدری قەت لە ماڵەوە بەند نەدەبوو و بەهەر برو بیانوویێکەوە بووایە لە مالْ دەردەکەوت و بەرەبەرە کڕینی وردە شتی مالێی وەئەستۆ گرتبوو و ناویان نابوو نەنە دەدری.

ناوی نەنەگەورە فاتم بوو و نەنە دەدریش خاوەر، بەلام جگە لە نەناسیاوەکان نەمدیبوو کەس ئەوان بە نێوی خۆیانەوە بانگ بکا. چەند جارێك دەگوێی ئێمە منالانیان داچرپاند ئەوان فاتمە خاتوون و خاوەر خاتوون بانگ بکەین بەلام شتەکە هێندە گاڵتەجاڕانە* بوو کە دیزە بە دەرخونە کرا. نەنەگەورە زۆری پێ ناخۆش نەبوو بەلام نەنە دەدری بە خانم خانمێی کوت: خاتوون، کاتێ منالەکان بانگ دەکەن فاتمەخاتوون یا خاوەر خاتوون وادەزانم میوانمان بۆ هاتووە، قەستی ئەوەم هەیە بچم دەرگەی کۆلان بکەمەوە.

هێندێ کەس هەر دەڵەی بۆ ئەوە لە دایك بوونە کە دەورووپشتی خۆیان تەژی لە تاریکی و خەم بکەن. نەنە دەدریش بۆ ئەوە بوو کە هەموو شوێنێ بەشایی و پێکەنین بتەنێتەوە، ئەگەرچی هەموو بۆلەیان لەسەر دەکردو گاڵتەیان پێدەکرد کە بێ فکرە و ئەگەر دنیا هەموو لەسەر ئاو کەوێ ئەو هەر لەسەر کارسازی خۆیەتی، بەلام لە ناخەوە دەیان زانی بۆ مالێ چ

نێعمەتێکی گەورەیە. ماڵێکی کە باوەگەورە، مەزن و سەرداری بوو. لە گوڕانـدن و نەعرەتـە لێداندا ناسراوی عالەم بوو و دەستی دەوەشـاندو کـوڕانی خێـزان و کاردارەکـان گـەلێك جـار کەوتبوونە بەر هێرشی زللەو جنێوەکانییەوە. بوونی نەنە دەدری لەوێدا خۆی نێعمەتێك بوو.

لەگەڵ ئەوەی هەزار تانە و تەشەری لە نەنەگەورە و خانم خانمێوە دەبیست، بەڵام تۆزقاڵێك لە پێکەنینەکانی خۆی دانەدەنا. هاوکایەی منالەکان بوو. ئەگەر خەم و خەفـەتێکمان بووایـە دەیخافڵاندین و دڵی دەداینەوە. ئەوەدەم فرە خۆشـحاڵ دەبـوو کـە داوای شـتێکت لـێ کردبـا، بەڕێوەبردنی کارێك، ئیشتیا کردنی چێشتێك، مەزنترین شانازی ئەوە بوو کە باوەگەورە نـاوی چێشتێك بێنێ و بۆ وێنە بڵێ: دەدری بۆ ئەمشۆ ئیشتیام دە دۆکڵیوێ کردووە. ئیـدی بـزانم چ دەکەی. کەس خۆی لەبەر نەدەگرت و هەر زۆر زوو قۆڵی لێ هەڵدەماڵی.

گۆرانیگەلێکی لەژێر لێویەوە دەگوتەوە کـە ئێمـەش فێریـان ببـووین. پەندومەسـەلێکی ئێجگاری دەزانی کە لەکاتی خۆیدا یان لەناوەختدا دەکاری دەکردن کە دیارە ئەوانـە تایبـەتی خۆی بوون. لەهەر شوێنێ یەکێك لەوان لە لایەن کەسێکەوە گوترابـاوە حازریـان پێدەکـەنین و دەیانوت: ئەوەش هەر هی نەنە دەدریە.

هێندێ جار لە حاست ئەو شتەی لێمان دەخواست، هەولی دەدا توندوتیژو قۆچاخ بێ. بـە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانمان شل دەکردو نێوچاوانی تێك دەناو دەیوت: نا.

هەرکە لەسەر مەبەستەکە سوور دەبووین، نەوی دەکێشا، دەیوت: بە مەرجێك لای کـەس نەیدرکێنن دەنا مەزن ئاغا دەمکووژێ.

ئەگەر بە ڕێگایەدا دەڕۆیی، یا دەئاخاوت چەشنێك بێخەمی و دڵنیایی لە ناخیدا حەشـار درابوو کە نەنەگەورەی تووڕە دەکردو ئێمەی منال بـە هۆیەکـەمان نـەدەزانی. هـەنگاوەکانی کورت، خێرا و لێبڕاو بوو. سەری بەرز دەکردەوە، دەستەکانی ڕێك و سـاف بـە هـەرتك لایـدا شۆڕ دەکردەوەو هێدی دەیجوولاندنەوە. بێ ئەوە بڕوانێتە دەورو بەری خـۆی ئـۆینی دەردێنـا و پێدەکەنی. کوڕە پوورەکـان و براکـانم لاسـایان دەکـردەوەو بۆخـۆی لـە هـەموان زۆرتـر لـە پێکەنینیان شاگەشکە دەبوو. لەخیدا منالێکی ماندوویی نەناس بوو کە قەت گەورە نەدەبوو.

ڕۆژێك تێکڕای گوڵدانەکانی حەوشـەی هێنـابوو لـە دەورو بـەری کـانی ڕیـز کردبـوون و گوتبووی ئاوا جوانترە. ئەڵلاوێردی — شووەکەی کە ئێمە ئاغاوێردیمان پـێ دەوت — هەرچـەند پێی وتبوو کاری پێیان نەبێ وتبووی تۆ کارت بەوە نەبێ.

نەنەگەورە زۆرجار بە هۆی نیگەرانییەوە وتبووی: مەزن ئاغا بێتەوە پێستی لە پشتی دادەماڵێ. مەزن ئاغا گیانێکی لە لای ئەو گوڵدانانەیە، ئافرەت دەڵەی خەرفاوی...

جێگورکێی گوڵدانگەلێك کە پاپا ژمارەو بەژن و بالاو بەیەك یەکی گوڵەکانی دەزانی، بەلای ئێمەوە کارەساتێکی گەورە بوو. خانم خانمێش دەستەکانی هەڵدەگلۆفی و سەری با دەدا. ئەجەلی هاتووە، بۆخۆی دەزانێ، جەحەننەمی لێ پڕ بێ.

پاپا گەڕایەوە، نەنەگەورە ئاخێکی هەڵکێشاو زووەکی فیزراندی یە* چێشتخانە. بەلام لە سووچی دەرگەکەوە ئاگای لێ بوو. خانم خانمێ لە ژوورەوە هۆشی هەر لە حەوشە بوو. ئەمن و ڕۆستەم لە ژێر دارەکاندا مەلاسمان دابوون.

پاپا هەرکە وەژوور کەوت، بە گوڵدانەکانی زانی، گوڕڕاندی: ئەڵلاوێردی، دەدری.

نەنە گەورە سەری لە چێشتخانە وەدەرناو وتی: دەدری بە گیانی ناسەلامەتی چووە نانی بکڕێ، فەرمایشتێکتان بوو؟

پاپا چاوێکی بە گوڵدانەکاندا گێڕاو وتی: دەدری ئەم گوڵدانانەی لە دەوری کانی ڕیز کردووە؟

نەنەگەورە وتی: ئەی لات وایە کێ کردوویە ئاغا. پێی دەڵێم لەسەر جێگای خۆیان دانێتەوە.

-ئەڵلاوێردی لەکوێ بوو؟

نەنە گەورە وتی: ئاغا، مەگین ئەڵلاوێردی باشاری* کرد. فەقیرە لە بەیانییەوە هەر نارەحەت بووەو خۆی خواردۆتەوە، ئێستاش لە شەرمان خزاوەتە ژوورەکەی. بانگی بکەم؟

پاپا سەری بادا کە نا. پاشان لە ژوورەکەی خانم خانمێ ڕا بیستم کە وتی: ئاواش کرێت نیە.

خانم خانمێ وتی کەوابوو لێگەڕێ با ماوەیەکیش ئاوا بێ. ئەڵلاوێردی بە ڕادەی پێویست سەرکۆنەی کردووە.

دەتوت هەموو دەیانزانی کە ناکرێ پێ بە پێی ئەو و بەڕادەی ئەو بژی، ئەگەر تەمای چوونە جێگایەکی هەبووایە سەدجار هەتا بەر دەرگە دەچوو و دەگەڕاوە. خانم خانمێ دەیگوڕڕاند: دەبڕۆ بەسە. ئەم وڕێنەیەت لەچیە؟

-ڕۆیشتم خاتوون، ڕۆیشتم.

جارێکی دی لەبەر دەرگە دەگەڕایەوەو بابەتێکی تازەی دەکەوتەوە بیرو دەستی پێ دەکرد. خانم خانمێ دەیوت: باشە باش، برۆ. ئـەوە نیوەڕۆیــە. قــورِم وەســەری مــەگین دەڕوا. ئـافرەت دەبرۆ.

دەڕۆیی و دوو هەنگاو دوور نەدەکەوتەوە دەگەڕاوە.

هەرکە دەچۆوە گوندی ماتەم بەسەر ماڵەکەماندا دەکشا. هەر لەو رۆژەوە کە دەڕۆیی هەتا دەگەڕاوە چاومان لە ڕێگای بوو و هەزارجار دەمانپرسی کەی دێتەوە. پــوورە پــەری برۆکــانی هەڵدەکێشاو پێدەکەنی و دەیوت: خوا شانسمان بداتێ.

گشتمان بۆ هاتنەوەی رۆژ ژمێریمان دەکرد. تەنیا ئێمەی منالْ نەبووین کــە هەســتمان بــە شوێنە بەتاڵەکەی ئەو دەکرد. مەزنەکانیش خوویان پێ گرتبوو. ماڵ بە بــوونی ئــەو لــە خــەو ڕادەبوو و بە نەبوونیشیەوە لەخەو رۆدەچوو.

بیر لە ستارە دەکەمەوە، لەو شتەی کە ئێمــە هــەمانبووە و چــێژمان لێوەرگرتــووە. ئــەو تەنانەت لە کەمترین بەرکەوتەکەی* بێبەری بووە، دلّم دەگیرێ.

دەگەینە ئێزگەیەکی چکۆلە، بێ ئەوە ڕاوەستین تێدەپەڕین. گرووپێك لە منالأنی قوتابخانە هاوڕێی یەك دوو مامۆستایان چاوەنواری شەمەندەفەرن و رەنگ بێ بۆ سەیران روو بکەنە کێو و پێدەشتەکانی دەرەوەی شار.

جیهان بە قەراخ ڕۆژنامەدا سەیرێکی من دەکا، سەیرێکی زۆرتر بە هۆی راهاتنــەوە نــەك سەرنجێکی تایبەتی. ئەو لەگەلْ ئەم بەشەی ژیانی من تەواو نامۆیە. مرۆڤێکە دەنێو خۆیدایە، بێدەنگ و پێبەندی خــوو و خــدەی ڕۆژانەیــەتی. کارەکــانی رۆژانــەی وەك ســەعات بەرنامــە دارێژراو و ڕێك و پێکن. ناتوانم هیچ بیرێك لە چاوەکانیدا وەخوێنمەوە. چاوەکانی بــە جارێــك شین هەڵگەڕاون. شینێکی تۆخ. لەو رۆژەوە بە دلّنیاییەوە دەشێم بێژم کە مرۆڤــانی ئەویــندار چاوەکانیان شینن.

حەز دەکەم قەڵەمێك ڕاکەم و رەنگی شین لە چاوەکانی بدەم. چاوە شینەکانی ئەو «سۆناتی مانگەشەو» دەخەنەوە بیرم ، رەنگە ئەوکاتە کــە بێتهــۆوێن ســۆناتەکەی دەنووســی بــیری لــە رەنگی شین کردبێتەوە.

سۆناتی مەهتابم یەکەم جار لە ڕادیۆ بیست. هەر ئەوددەمــە بــێ ئــەوە بــزانم چــیە تــوانیم هەستی پێ بکەم. بەر لەو ئێمە بە گشتی بێتهۆوێنمان دەناسی. لە دەفتەرەکانی بیروڕاکانماندا،

له هه‌مبه‌ر پرسیاری ئاهه‌نگسازی دڵخوازدا ده‌مان نووسی: بێتهۆوین. و له‌ به‌رامبه‌ر ئاهه‌نگی دڵخوازماندا ده‌مان نووسی ماچم بکه‌.

*پاڵم وه‌ شیپانه‌ی ده‌رگه‌ی هۆده‌وه‌ دابوو و*

*گوێم له‌ ڕادیۆ گرتبوو، وێژه‌ر ناوی کۆپله‌که‌ی*

*ڕاگه‌یاند، تێگه‌ییم بۆچ به‌م ڕاده‌یه‌ سه‌رنجمی*

*بۆ لای خۆی ڕاکێشا. هه‌وای ئێمه‌ بوو، هه‌وای*

*من و تۆ، دنیاکه‌مان رواڵه‌تی جیهانی به‌خۆیه‌وه‌ گرتبوو. هه‌واگه‌لێکی فره‌ بۆ مانگه‌شه‌و نووسراوه‌،*

*به‌ڵام سۆناتی مانگه‌شه‌وی بێتهۆوێن، مه‌هتاب خۆی*

*بوو. ده‌بوا هه‌واڵه‌که‌یم زوو به‌ زوو به‌ تۆ گه‌یاندبا. تو چیرۆکی هه‌وره‌کانت فێری من*

*کردو من بێتهۆوێنم به‌تۆ ناساند...*

وتم هه‌وایه‌کم به‌ ناوی مانگه‌شه‌و بیستووه‌. نازانی چه‌نده‌ خۆشه‌، ئه‌گه‌ر بیبیسی له‌ مه‌به‌سته‌که‌م ده‌گه‌ی.

چاوی لێم کردو پێکه‌نی. نه‌یده‌زانی ده‌ڵێم چی و مه‌به‌ستم چیه‌. وتم: ده‌بێ قه‌وان یا شریتی هه‌واکه‌ په‌یدا بکه‌م و بۆتی لێ بده‌م هه‌تا مه‌به‌سته‌که‌مت بۆ ده‌رکه‌وێ.

ناتوانی بۆمی لێ بده‌ی؟

-لێی ده‌م؟

-هه‌رئاوا به‌ ده‌مت.

سه‌رم بادا: خۆ له‌و چه‌شنه‌ هه‌وا بێ سه‌ره‌ و به‌رانه‌ نیه‌.

له‌ تارانی ئه‌و سه‌رده‌ماندا دووکانی قه‌وان و شریت فرۆشی ئێجگار که‌م بوو. زۆربه‌ی کڕیاره‌کانیان قوتابی یا مامۆستاکانی قوتابخانه‌ی مۆسیقا بوون. قوتابیانی قوتابخانه‌ی خۆمان ئاسایی توانایی کڕینی قه‌وانیان نه‌بوو. به‌ڵام تووشی ڕاڕاییه‌ك هاتبووم كه‌ وازی لێ نه‌ده‌هێنام. ئاخریه‌که‌ی ملم پێوه‌ناوچوومه‌ یه‌کێ له‌ دووکانه‌کانی شریت فرۆشی. به‌ نه‌ختێ دوودڵی و جه‌ختی تایبه‌تی له‌مه‌ڕ ناوی هه‌واکه‌و به‌م خه‌یاڵه‌وه‌ که‌ فرۆشیارم ده‌ مه‌به‌سته‌که‌ی خۆم گه‌یاندبێ، داوای مانگه‌شه‌و له‌ کاره‌کانی بێتهۆوێنم کرد.

فرۆشیار به‌سه‌رو روویه‌کی خۆشه‌وه‌ وتی، له‌وه‌ی که‌ کیژێکی وا به‌ سه‌لیقه‌ی هاتۆته‌لا خۆشحاڵه‌. له‌نێو قه‌وانه‌کاندا یه‌ك دوو دانه‌ی هێنا له‌پێش منی داناوپرسی: کامه‌یانت به‌دڵه‌؟

بە سەیرەوە پرسیم: مەگین چەند هەوا لە مانگەشەو هەیە؟

بە بزەوە وتی: سۆناتی مانگەشەوی بێتهۆوێن هەر دانەیەکە، بەڵام شێوە ژەنینەکانیان جیاوازە.

یەکێ لە قەوانەکانی پێشان دام: ئەمە کاری ئارتوور ڕووبینشتێن، پیانۆژەنی رووسییە. لەو کارە باشانەیە. سەفحەیەکی تری ڕاکرد: ئەمەشیان شووراچرکاسکی ژەنیوەتی. ئەویش رووسییە. کارەکەی ئەویش بێکەم و کووڕییە. دیارە ئەمەیان زۆر گەنجە و هێشتا هەر ماوە.

هیچ کام لە ناوەکانم نەبیستبوو. بیرێکم بە مێشکدا هات و وتم: ڕاستییەکەی ئەمن ئەم ناوانە ناناسم بەڵام هەر نەبێ ئەوەی هەڵدەگرم کە هاوناوی خۆمە.

پرسی: ناوت چیە؟

وتم: شوورا.

پاشان پرسیم: شریتەکەتان نیە؟

بیرێکی کردەوەو وتی دەتوانێ هەواکەم بۆ لەسەر شریت تۆمار بکا.

گرامافۆنێکی کۆنمان لە ماڵدا هەبوو کە باوکم لە ئاڵمانەوە هێنابووی. براکەشم تازە تەسجیلێکی بۆخۆی کڕیبوو کە تەنانەت نەماندەوێرا دەستیشی لێ بدەین. جگە لەوە، غولام خان تەسجیلێکی هەبوو و تەنیا کەسێ بوو کە رەنگ بوو ئیزنی ئەوەمان پێ بدا شریتەکەی بخەینە سەرو گوێی لێ بگرین.

دوانیوەڕۆیەکی گەرمی هاوین بوو. زۆربەی ئەندامانی ماڵ خەوتبوون. شریتەکەم نایە جانتاکەم و چوومە ماڵە پوورە ماه.

ماڵە پوورە ماه لەبارترین پەناگا بۆ من و رۆستەم بوو. لەوێدا دەمانتوانی ئازاد بین. هەرچەند پێمان خۆش بوایە دەمانتوانی کایە بکەین. گەلێ ڕۆژان ئەوەندە بە دەوری کانیدا هەڵدەسووڕاین کە پشوومان لێ دەبڕا. قەبرغەکانمان وەژان دەکەوتن و بە هۆی ئێشی زۆرەوە دووقەد دەبووینەوە و لەژێرەوە چاومان لە یەکتر دەکرد، یان لەخۆرئاوابووندا لەسەر تەختی نیۆحەسار لە پاڵ پوورە ماه و غولام خان رادەکشاین. ئەوان خەریکی خوێندنەوەی کتێب یان راستە و پاستەکردنی وەڕەقەی تاقیکارییەکان بوون و ئێمەش ناومان بۆ هەورەکان و شکڵ و شێوەی سەیر و سەمەرەیان دەدۆزیەوە. کێبەرکێیەك کە هیچ کات کۆتایی نەدەهات و هیچ کام لە ئێمەش براوە یا دۆڕاوەکەی نەبووین.

پووره پەری و غولاّم خان له پێکەنینه بەرز و دوورودرێژ و چپه و سرتەکانی ئێمه نارەحەت نەدەبوون و بۆڵەشیان لێوه نەدەهات و پۆلیس ئاسا چاویان به سەرمانەوه نەبوو. قەت نەیان دەوت دەبێ بێدەنگ بین و بەدفەڕی نەکەین.

غولاّم خان جارێکیان به پووره ماهی وت: ئەم منالاّنه بەدفەڕن، بەلاّم بەدئاکار نین.

پووره ماهیش وتی: دەنگ پاژێك له ژیانی منالاّنه و بێدەنگیش دەبێته پاژێك له ژیانی گەورەکان.

بۆ تێگەیشتن له واتای وتەکەی ئەو دەبوا سالاّنێکی زۆر تێپەڕیبایه. بێدەنگی و کپبوون ئیمڕۆ شێوەیەکی دیکەی بۆم بەخۆوه گرتووه. قەت پێی خۆشحاڵ نەبووم. بێدەنگی یەکەم به هەڵبژاردن نەبووەو هێنده پێی سەربڵێند نیم.

لەسەر ڕێگادا تووشی ڕۆستەم هاتم که دووکانی باوکمی دادەخست، وتم لەتەك مندا بێ گوێ له شریتەکەمان بگرین. زەردەیەکی هاتێ و وتی: له ئێستاوه بۆته شریتەکەمان.

-سەبر گره گوێی پێ بده تا له مەبەستەکەم بگەی.

پووره ماه و غولاّم خان تازه فراوێنیان خواردبوو، غولاّم خان که شریتەکەی دی ئاماژەی بۆ تەسجیلەکەی سەرتاقەی کردو وتی: دەزانی کاری پێ بکەی؟

وتم: بەڵێ.

وتی: زۆر چاکه.

ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و بەرەو هۆدەی دەم دەرگه چوو.

پووره ماه قاب و قاچاخی فراوێنی لەسەر مێز کۆکردەوه. ڕۆستەم ویستی لێی وەرگرێ و بیانباته چێشتخانه. وتی خۆی دەیانباو دەچێ نەختێ بخەوێ.

شریتەکەم خسته سەر تەسجیلەکه. ڕۆستەم لای دەرگه وێستابوو.

وتم: وەره، دانیشه.

به هێمای سەری گەیاندی که جێگەی خۆشه و هەر لەوێ وێستا. ئەو پێ چەقاندنه یەکێ له تایبەتمەندییەکانی ئەو بوو. هێندێ جار لێی دڵمەند دەبووم و بڕێ جاریش سەرەدەرێم لێ دەرنەدەکرد. دواتر خووم پێی گرت. شریتەکەم خسته سەر، له ژێرەوه چاوێکم لێکرد. زۆرم پێ خۆش بوو ئەویش ئەو هەستەی منی ببێ و لێی تێ بگا. سەری داخستبوو، به سەرنجەوه گوێی پێ دەدا. لەنیوەی هەواکەدا، ورده ورده خزی و لەسەر عەرد دانیشت. له تەواوی ئەو

ماوەیەدا سەری بەردابۆوە، چی لیٚ تیٚنەدەگەیشتم. بەشی یەکەمی هەواکـە کـە تـەواو بـوو، چاویٚکم لیٚ کرد. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکیٚشاو هیٚدی وتی: جاریٚکی دیکە بیخەوە سەری.

وتم: وەرە نزیکتر دانیشە. نامەویٚ دەنگی زۆر بەرز بکەم.

وتی: گویٚم لیٚیە.

جاریٚکی دیکە شریتەکەم خستەوە سەری. جاروبـار لـە پەنجـەرەوە لـە ئاسمـانی دەڕوانـیٚ. ئاهەنگەکە کە تەواو بوو وتی: ئەوە دەبیٚ شەویٚ گویٚی پیٚ بدەی. ئەوکاتە کە مانگ خەریکـە لە ژیٚر هەورەکان سەردەربیٚنیٚ.

پرسیم: کەوابوو خۆشت لیٚی هات؟

-پیٚ خۆشبوونی شتگەلە جوانەکان فرەسانایە.

-ئەمن هەر ئەوکاتە کە بیستم کەوتمەوە بیر مانگەشەو.

-وتی: هەروەك مۆتە وایە.

وتم: هەروەك رەنگی شین، هەروەك مانگەشەو.

دەستیٚکی بەسەری داهیٚنا: جاریٚکی دیکە بیخەوە سەری.

فرۆشیاری دووکانە قەوان فرۆشییە کە پیاویٚکی بە مرخ و خۆش خولْقە. جاریٚکی دیکە کە دەچمەوە لای و لیٚی دەپرسم بیٚتهۆویٚن هەوایەکی دیکەی لەبارەی مانگەشـەوەوە نیـە، دەڵـیٚ: زۆر هەوای خۆشتری هەن کە ئەگەر گویٚتان لیٚی بیٚ بیٚ شك بە ڕادەی سۆناتی مانگەشەو پیٚتان خۆش دەبیٚ.

بیٚدەنگی لیٚدەکەم، نازانم بلیٚم چی. مۆسیقا لە ماڵی ئیٚمەدا هەر ئەوەیە کـە لـە ڕادیـۆوە دەیبیسین.

فرۆشیار باسی سەمفۆنییەکانی بیٚتهۆویٚن دەکاو دەڵیٚ: سەمفۆنی ژمارە پیٚنجەکەیم لەسەر قەواندا هەیە.

دەڵیٚم: ئیٚمە هەر تەسجیلمان هەیە.

بە بزەوە دەڵیٚ: بۆ کیژیٚکی ئۆگری وەك تۆ دەتوانم لەسەر شریت تۆماری بکەم.

کاتیٚ دەچم شریتەکە وەرگرمەوە، دەڵیٚ: چونکە جیٚگەیەکی بـەتاڵ لـە شـریتەکەدا مـابوو بەشیٚك لە سەمفۆنی ژمارە شەشەکەشیم بۆ تۆمار کردووی.

لەکاتی دانی پارەکەیدا دەڵیٚ: هەرکام لە کارەکانی خۆی حەقایەتیٚك و واتایەکی هەیە.

دەپرسم: چەشنی مانگەشەوەکەی؟

به سەمفۆنی ژمارە پێنجەکەی دەڵێن: چارەنووس بەم شێوە لە دەرگە دەدا.
لە وەڵامی نیگا تەژی لە پرسیارەکەی مندا دەڵێ: ئەگەر گوێی لێ بگری تێی دەگەی.
-و...؟

ناوی سەمفۆنی ژمارە شەش پاستۆراڵە. بە واتای سەمفۆنی شوانی. تەژییە لە گۆرانییەکانی لێڕەوار، تۆفان و هەواگەلی شمشاڵی شوان و باڵندەکان، یەکێ لە جوانترین کارە مۆسیقاییەکانی دنیایە.

کە لە ئۆگری و ناشارەزایی من دەگا دەڵێ: کتێبێك لە بابەت شرۆڤەی مۆسیقاوە هەیە. هەتا ماوەیەك بەر لەمە یەك دوو دانەم بوو. لەو کتێبەدا کارە ناودارەکان شرۆڤە و شی کراونەتەوە. بۆ خۆشویستنی بێتهۆوین شەرت ئەوە نیە مرۆظ مۆسیقازان بێ و لە رەمز و ڕازی مۆسیقا بگا.

دەڵێم: خۆش ویستنی شتە جوانەکان زۆر سانایە.

دەڵێ: حەق بە تۆیە. بێتهۆوێن وەك کانیاوێکی زوڵاڵ و لەکوڵ وایە. بێتهۆوێن بۆ هەر بیسەرێك شتێکی پێیە. هەر بۆیەشە بۆتە بێتهۆوێن.

دەڵێم: خۆزگە بە خۆت کە هەر هەوایەکی پێت خۆش بێ دەتوانی گوێی لێ بگری.

ئەو پێدەکەنێ و ئەمن تا بناگوێ سوور هەڵدەگەڕێم. تەنیا ساڵەکانی دواترە کە دەتوانم وەك فرۆشیارەکە بە ساویلکەیی خۆم پێ بکەنم.

*لەمە بەدواوە هاوڕێی مۆسیقای بێتهۆوێن*
*پێ دەنێمە دنیایەکی نوێوە و هەنگاو بە هەنگاو*
*وەشوێنی دەکەم. دنیایەکی تەواو نەناسیاو و*
*سیحرێکی لەبن نەهاتوو.*
*دەڵێم چەند جوانە.*
*دەڵێی چەندە ئەهوەنکەرەوەیە.*
*دڵێم: لە باوەڕدا ناگونجێ*
*دەڵێی: ئەمن باوەڕ دەکەم...*

دەڵێ: چ خۆش دەبوو ئەو نەخۆشانەی بۆ خۆ تیمارکردن دێنە لای دوکتۆر پێمان گوتبان لەبری خواردنی ئەم دەرمانانە بێن دانیشن و گوێ لە سەمفونیەکانی بێتهۆوین بگرن و بزانن حاڵیان چەندە باشتر دەبێ.

پێدەکەنم و دەڵێم: ئەو هنگی* باوکم و دەرمانخانەکەییت نابووت دەکرد.
بەڵام بەر لە تێشکانی، لەپێشدا منی وەدەر دەنا.
چ باشتر، ئەودەم ئیدی دڵت بە دەرمانەکان دەخێڵەوە نەدەهات.
ئەو دەم دڵ دەخێڵەوە هاتنم لەمەڕ شتێکی دیکە دەبوو.
لەمەڕ چی؟
جیاوازی نییە دەرمان بێ یان غەیرەدەرمان، هەر چۆنێکی بێ مرۆڤ هەمیشە بە هۆی شتێکەوە باری دەروونی دەشێوێ. دواتر شریتێك دروست دەکەین کە رازی من و ئەوە. شریتەکە بە دەنگی سازە هەودا دارەکانی سەمفۆنی ژمارە شەش دەست پێدەکا. دەنگ و سەدایەك لە لێڕەواردا دەتەنێتەوەو لە پاڵ ئەودا و لەهەر کەلێن و قوژبنێکدا، باڵندەیەك دەنگ هەڵدەبڕێ و بلبلێك دەچریکێنێ، پەپووسلێمانەیەك دەگمێنێ. با دەخزێتە نێوان دارەکان، بەڵام بەر لە هەڵکردنی تۆفان، لەو شوێنەدا دەنگ و سەداکان کورت و نزم دەبنەوە، تریفەی مانگ لە پڕێکی بەسەر دارەتاریکەکاندا دەکشێ، هەورەکان لە گەڕدان و بێدەنگی بەسەر چوار سووچی لێڕەوار دا کشاوە و لە کاتێکدا کە لە دوای جوانی کەوتووم چارەنووس بە هەموو هێزییەوە لە دەرگە دەدا. ئەمن و رۆستەم هەر یەکەی دانەیەکمان لەو شریتە هەیە. کەس بە رازەکەی نازانێ.
ئەم شریتە بۆ من وەك حەبی ئەهوەنکەرەوە وایە. رۆستەم لەبەر ئەم شریتە تەسجیلی کڕی. گەرەکی بوو بیدا بە من، وتم: نا.
وتی: بە مووچەی خۆم دانەیەکت بۆ دەکڕم.
وتم: نامەوێ.
پرسی: بۆچ؟
هەنووکە لەخۆم دەپرسم بۆ دەنگەکەی چەشنی هاوار لە ناخمدا دەزرینگێتەوە.
وتم: ئیتر ناخوازم.
دەنگی نەکرد. دەستی نایە نێو قژەکانی و شێواندنی و لێك و لووسی کردنەوە، شێواندنی و لێك و لووسی کردنەوە.

## ( ٣ )

*بریا بیتاقەیەکی* دایمی مان هەبووایە وبمانتوانیبا*
*هەر بەو بیتاقەیە سواری گشتی ئەو شەمەندفەرانە*
*بووباین کە لە هاتوچۆدان. بمانتوانیبا سەیری خەڵك*
*بکەین و چیرۆکی ژیانیان بۆ داهێنین. ژیانگەلێکی کە*
*شبی یەك دەدەن و چووکترین وێکچوونیشیان*
*بە یەکەوە نیە، چەشنی هەورەکان...*

ئەو لە تەمەنێکدا دەستی دایە کار کە تەمەنی سەرەتای چوونە قوتابخانەی منالانی دیکە بوو.

هەموو بەرەبەیانییەك بالاپۆشەکانمان لەبەر دەکردو جانتا و کتێبەکانمان هەڵدەگرت تا بەرەو قوتابخانە رێ کەوین، رۆستەم دەچووە دەرمانخانەی باوکم. ئەو وەك ئێمەمانان ناچار نەبوو بە درێژایی ڕۆژێ لەسەر قەنەفە دانیشێ و گوێ لەوانەکان بگرێ، وانە بخوێنێ و بنووسێتەوە، ئیرەییمان پێی دەبرد. منالْ ڕێز و حورمەتی بەختەوەرییەکانی خۆیان بە هێند ناگرن.

بەلام لە دەرمانخانەدا زۆر دەوامی نەهێنا. بۆی دەرمان دەیشێواند، حەساسیەتی پێی بوو. هەر لەبەر ئەمە جارێکیان باوکم زۆر چاکی کوتا، پێی وانەبوو منالێ گوندی دەبێ حەساسییەتی بە شتێکی وەك بۆی دەرمان هەبێ، بەلام ئەوەی کە تەوەزەل و وازی کارکردنی نیە زۆرتر جێی باوەڕ بوو. لێدانی بێ هۆ بوو. بە خۆی نەبوو.

باوکم وتی: کاکە وانابێ، ئەو منالە لێرە دابین نابێ.

له ماڵێ لەسەر دایکم پرتەو بۆڵەی دەکرد: باوکت ناتوانێ زوڵمێ لە هەمووان بکا، هێندێ فێرن بە بۆی دەرمان تێك دەچن. ئەویش بە خۆی نیــە. حــاڵی تێــك دەچــێ. وازی کــارکردنی نامێنێ. بە دەردی دەرمانخانەی من ناخوا. خەڵك لایــان وایــە بــەماددەی هۆشــبەر تووشــە، نەساخە، ئەمن زەمانەتی خەڵکی ناکەم. لانی کەم ئەگەر مەزنتر بووایە...

ئەودەم ئیدی باوکم ملی گرت و بردی داینایە لای جەوادئاغای پینەچی کــە دووکانەکــەی دوو دووکان لە خوار دەرمانخانەکەی ئێمەوە بوو.

پوورە ماه ڕۆژێك جەوادئاغا دەبینێ و دەڵێ: ڕۆستەم چەندەت کار بۆ دەکا؟

-خاتوون لەبابەت کارەوە بڵێم چی. هێندە وردەڵەیە کە ناتوانێ کەوشــێك بــە دەســتییەوە بگرێ.

-زۆر باشە کەوابوو پێویست بەوە ناکــا هــەموو ڕۆژێ ڕایگــری. حــەوتووی یــەك دوو ڕۆژ بەسە. ڕۆژانی دیکە بینێرە بچێتەوە ماڵێ.

-خاتوون، وەڵڵا ئەمن قسەیەکم نیە، هەر لەبەر ئەوە قسەی مەزن ئاغام لە عەردی نەدابێ ڕامگرت، خۆ ئێمەش لەم دووکانەمان زیاتر نیە.

-هیچ لەوە حاڵی ئەگەر بزانن ئەم منداڵە وردەڵەیەت دەکارێ بەرداوە سزات دەدەن.

-خاتوون ئێمە نەدەشیاین قسەی مەزن ئاغا لــە عــەردی بــدەین. ئێمــە بچــووکی مــەزن ئاغاین، ئەم منداڵەش کارێکی لەدەس نایە، دڵی دەخێڵەوە دێ، نازانم چ دەردێکی هەیە.

-ئەمن ئەوە وتم، دێن و دووکانەکەت تەختە دەکەن.

-خاتوون، ئێمە تاوانێکمان نیە. بێن چاو لێ بکەن. سەرەڕای ئەمە، ئەم دووکانــەی ئێمــە چی تێدایە؟

-جەوادئاغا ئەم قسانە چن. بۆخۆت دەزانی کە زەحمەتی هەموو کەوشەکانی خێزانەکەمان لەسەر شانی تۆیە، بە بێ تۆ هیچ کارێکی ئەم گەڕەکە هەڵناسووڕێ. هەر ئەوەندە چــاوت بــە سەرییەوە بێ، نابێ ئەم منداڵە بە درێژایی ڕۆژێ لە قوژبنی دووکانــدا بەنــد بکــەی. یــەك دوو سەعاتی کار کرد بەڕێیکە بچێتەوە ماڵێ.

-خاتوون، بە پێغەمبەر ئەمن قسەیەکم نیە. تەنیا ئەگەر مەزن ئاغا بزانێ...

-ئەتۆ منداڵەکە بنێرەوە ماڵێ. ئەمن بە مەزن ئاغا دەڵــێم. ئــەوەی دانــێ بــۆ مــن، لــەم بابەتەوە نیگەرانیت نەبێ.

جەوادئاغاش کە لە ترسی پاپا و وتەکانی پووره ماه، هوڕ و کاس ببوو و هیچ لە خۆی حاڵی نەبوو کە لەگەڵ مناڵێکی کە هیچ کارێکی لەدەس نەدەهات، دەبا چی کردبا. تێمابوو و ورەی ئەوەی نەبوو، بە پێی یاساو بە شێوەیێ کە خۆی حەزی لێ بوو کاری لێ بکێشێ، بە هەرچەشنێ و بە بیانووی ئەوە کە کوڕەکەی خۆی داناوەتە سەر دووکان، دەری کرد.

پاپا جارێکی دیکە ملی گرت و بردییەوە دەرمانخانەکەی باوکم و بە شانازییەوە ڕایگەیاند: وا گوێم لێ با داوە کە دڵ تێکەڵهاتنی لەبیر بچێتەوە.

ژن و پیاوێکی گەڕاوە بەسەرو پۆتراکێکی پۆشتە و پەرداخەوە بە شوێن جێگەدا دەگەڕێن، بە وردی لە قەنەفەکان دەڕوانن هەتا دوو جێگەی بەتاڵ لە پاڵ یەکتردا بدۆزنەوە. بە بەردەمی ئێمەدا تێدەپەڕن، بۆنی عەتری نرخ گرانی ژنە دەناخی کەپۆی مرۆڤدا دەگەڕێ. پیاوەکە چەند ڕۆژنامەی ناوەتە ژێر هەنگڵ و جانتاکەی بە دەستی دیکەوە گرتووە و لەپێش ژنەکەدا دەڕواو شوێنە بەتاڵەکان بەسەر دەکاتەوە. ژنەش دوو گۆڤاری ئەستووری بە دەستەوەیە و جانتاکەی خستۆتە شانی و هێدی و لەسەرخۆ وەدوای کەوتووە. چاویان لەسەر هەڵناگرم، لە چەند ڕیز دوورتر شوێنێك لە پاڵ یەکتر دەدۆزنەوە. پێم سەیرە کە بۆچ لە لای یەکتر دانیشتن، پڕکێشییانە. ئیتر بەو ڕۆژنامانەیانەوەو بە ئاوا دیوارێکەوە چ قەیدییە لە کوێ دانیشن؟ خۆ هیچیان یەکتر نابینن.

دووایین حەوتووی رەشەمەیە. کەشوهەواکە دیسان بۆنی جەژنی بە خۆوە گرتووە. شار نوقمی گوڵووکە* و لە هەموو شوێنێ خەریکی پاك و خاوێنین. گشت هزروبیرم لە لای تاقیکاری یەکانی دیپلۆم و تاقیکاریی چوونە زانکۆیە. بەڵام بە دڵ حەز بە خوێندنەوەی کتێبی چیرۆك دەکەم و نوقمی بیرو خەیاڵ دەبم. بە رۆستەم دەڵێم: مەگین وەرزی بەهار بۆ دەرس خوێندن دەبێ؟ نیگام لەنێو چاوانی ئەودا کە لێوڕێژ لە پێکەنینی شیرین بەڵام ئازاردەرە ون دەبێ. لە وتەکەم پەژیوان دەبمەوە.

جارێك چوومە دەرمانخانە هەتا ئەو بەستە دەرمانەی کە دایکم ڕایسپاردبوو وەرگرم، بەستەکەی حازر کردبوو، دەرمانەکانی کە لەسەر پێشخان وەدەستم دەدا، دەستی نایە سەر دەستم. دڵم بە توندی لێی دەدا. هێزی چاو لێکردنیم نەبوو.

وتی: ئەگەر زانیبام بۆخۆم بۆم دەهێنای.

وتم: هی من نیە، ڕێگاکەشم دوور نیە. پێویست بە خۆش خزمەتی تۆش ناکا.

پێکەنی، دیسان هەر ئەو نیگا. بەستەکەم هەڵگرت و بە پەلە وەدەرکەوتم.

فاختە وتی: گەنجایەتیمان ئاوا بەم چەشنە بە بێ هـۆ ڕادەبـرێ. ئـەو ڕۆژانـەی کـە دەبـێ ئەویندارى بکەین و لە خۆشیدا ڕابوێرین، بە هـۆی تـرس و لـەرزی تاقیکردنـەوە لـە کیسـی دەدەین.

دەڵێم: عیلاجێکمان نیە؟ هەمانە؟ پێویست بەوە نیە ئەتۆش هێندە لە ئەوین بدوێی.

-ئەوە بۆ ئەو ڕۆژانە لەگەڵ هـەموو کـەس شـەڕتە؟ ئەگـەر دەرمانـت گەرەکـە سـەر لـە دەرمانخانە هەڵێنە.

-دوێنێ هێندەی نەمابوو لەگەڵ ڕۆستەمیش بەشەر بێم. وەك بێگانەم لەگەڵ دەکا، وەکوو غەریبەکان لەمەڕ نیگایەوە هیچ ناڵێم.

لە درێژەدا دەڵێم: لەخۆم ناگەم نازانم چمە.

شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ: چارەی تەنیا تۆزقاڵێك فکرو بیری راحـەت و ئاسـوودەیە کە نایەڵن ئەویشمان ببێ. لە ماڵی ئێمەدا هەموو وەك ژاندرمە زەق چاویان لەمنە.

-ئەتۆ بۆ. خۆ ئەتۆ گرفتێکت نیە. ئێستا ئەگەر من شتێك بڵێم...

-نەك هەموو ساڵێ قوتابی یەکەم نابیتەوە. بۆت بمرم کە زۆریش گوناحی.

-ترسم لە تاقیکاری زانکۆیە.

-ترس کە نا. گـرفتی دایکیشـم هـەر ئەوەیـە، ئـەویش ئەگـەر کـارێکی نـەبێ مێهـران قورمیشی دەکا. چونکە ئەو دەرچووە، منیش ئەگەر دەرنەچم کافر بـەحاڵم نـەبێ. ئـەو یـەك سەعاتە وێژەرییەی ڕادێوش دەڵەی دڕکە لە چاوی ڕۆ دەچێ. نازانم چ دژایەتییەکی لەگەڵ ئـەم یەکەیاندا هەیە.

-خەتاکە لەخۆتەوەیە. ئەگەر توانیبات ئاگات لە زمانت بێ...

روانینی فاختە بۆ ژیان هەموو شتێکی هەڵخەڵەتێنەرانەتر لەوەی کە هەیە دەنوانـد. هـەر ئەو حەکایەتەکەی «گوێلکی خۆماڵی بـە گـا ناشـێ»یـە. چەشـنی زنجـیرە تەلەخزیۆنییـەکان چیروکگەلێکی بۆ دەگێڕاینەوە. لەبابەت وێژەرانێکەوە بۆمانی باس دەکرد کە هـەر بـە هـۆی دەنگەکانیانەوە دەمان ناسین و ئاواتمان بوو لە سووچێکی بچـکۆلەی ژیانیـان بگـەین. لەمـەڕ خراپبوونی بەرنامە و هەزارویەك بابەتی دیکە دەدوا. شتەکانی وا بە تام و چێژ دەگێڕایەوە کە دەممان دەبووە تەڵەی تەقیو و چاومان زەق دادەگەڕا. گوێمان لە وتەکانی دەگرت و خۆمان لـە کەشو هەواکەیدا دەبینییەوە. نەختێ کپ دەبوو و ئەوجار دەیوت: نابێ ئـەو شـتانە بـە ئێـوە بڵێم. ئەوان هاوکاری منن. ئێوە ئاخری ئەمن لە کاروکاسبی دەخەن.

پاشان هەرچی پڕکێشیمان لێ دەکرد فایدەی نەبوو، ڕێی دادەگرت و دەڕۆیی و بەڵێنی دەرفەتێکی دیکەی پێ دەداین، ئەویش ئەگەر رەخسابا.

براکەی ئێرەیی پێ دەبرد، هەر وەك ئەمە کە ئێمە ئێرەییمان بەو دەبرد. ڕەنگی دنیاکەی ئەو لەگەڵ دنیای ئێمەدا جیاواز بوو. رەنگەکانی دنیای ئەو درەوشاوە بوون. تۆختر و تروسکەدارتر دەینواند. هیچ کاممان بیرمان لەوە نەدەکردەوە کە ئەگەر لە جێگای ئەودا بووایەن دەمانتوانی وەکوو ئەو بین. هێندێك هەر لە بنەڕەتەوە خاوەن رۆحێکی شادوسەر زیندوون کە ئەمەیان لە فاختەدا بە یەك بۆ ئێرەیی دەبوو، خۆی دەنواند.

دەیوت لەوەتای باوکم مردووە، دایکم چاوەدێرییەکی زۆرمان دەکا، مێهرانیش خۆی لە جێگەی باوکم داناوە. بە مەرجێك ئیزنی چوونە ڕادێوم پێ دەدا کە دەرسەکەم تووشی خەسار نەبێ.

وتوویە: تەنانەت نمرەی یەکێ لە دەرسەکانت کەم بێ، دەبێ واز لە رادێو بێنی.

سەری با دەدا، چاوەکانی خومار دەکرد و دەیوت: هەر بەڕاستی دایکم و برام پێیان وایە بۆ هەر کارێ هەمێشە دەرفەت هەیە. تێناگەن هۆگریم بەم کارە هەیە. بەکارلۆسم بۆ چیە؟

دەموت: ئەگەر نەختێ مەشق بکەی و گۆرانیمان بۆ بچڕی لەوانەیە وەك نەنەگەورەت لێ بێ.

-وادیارە تۆ هەر لە فکرو بیری خۆتدای. هەر ئەوەم ماوە گۆرانیتان بۆ بچڕم.

-عەیبەکەمان لە کوێدایە؟

-ئەگەر بڕیار بووایە گۆرانی بچرم بەرێوجێ دەمچری و نەك هەر بۆ ئێوە. ئەودەم ئیتر ناچار نەدەبووم بۆ ئەم دەرسانە زەحمەت بکێشم و خۆ لێرە و لەوێ بدەم.

دەمزانی لە ڕادێودا هانیان دەدا مەشقی گۆرانی چڕین بکا.

دەیوت: لە ماڵەوە باسم لێوە نەکردووە. ئەگەر ئەوانە بزانن نایەڵن جارێکی دیکە لاقمی تێ بنێمەوە.

رۆژێك یەکێ لە کارگێڕانی رادێو، پێشنیاری کردبوو کە ئەگەر بیەوێ فێری گۆرانی بێژی بێ، بە یەکێ لە مامۆستاکانی دەناسێنێ. کە دایکی لە مەبەستەکە گەیاندبوو، دایکی ئاگاداری پێ دابوو:

هیچ دەزانی ئەگەر مێهران پێ بزانێ چ هەڵلا وبگرێك دەنێتەوە؟

دەیوت: ئەوەی لەو نێوەدا گرینگی پێ نەدەدرا دیارە هەر من بووم.

-خۆ ئەتۆ بۆخۆشت ئەوەت پێ خۆش نەبوو.

-ئەگەر پێشم خۆشبا چما* تۆفیرێکی دەکرد؟ ئەوان بە هیچ کلووجێ ئەو دەرفەتەیان پێنەدەدام قسەی خۆم بکەم. خۆیان هەموو شتێکیان گەلاڵە کردو ئیتر هیچ. بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە شوێنی هونەریمان پاك و پاقژ نیە. پێنەدەچوو کە لەو شوێنە هونەرییەدا نرخ و بایەخێك بۆ کەسێ دابنێن.

وتم: بە هیچ کلووجێ، تەنیا هێندێکیان چەند ئەویندارى سینە لەپێش دەدۆزنەوە. ئەگەر ڕاست دەکەی ئەوانە لە ماڵەوەش بلێ.

-ئا هەر ئەوەم ماوە، تکایە ئەتۆش لە لای دایکم، هۆشێکی قسەکانت بێ.

مێهران لە دوایین ساڵی دواناوەندیدا ڕایگەیاندبوو باشتر وایە کار لە رادێودا وەلا بنێ و خەریکی دەرسەکانی بێ.

بە ڕژدی و دڵمەندییەوە دەیوت: مەبەستەکەی روون نیە. ئەمن کە سەرم لێی دەرناچێ. دەزانم لەبەرچی دڵگرانە، بەم هۆیە کە من پارە پەیدا دەکەم و ئەو دەسەڵاتی بەسەر هیچ داناشکێ. بەڵام نایەڵم بە مەبەستی خۆی بگا. تەنانەت ئەگەر دەرسیشم وەلا بنێم، پشت لە کارەکەم ناکەم. دایکم هەر دەڵەی زمانی لە گۆ چووە. هەموو کارەکان لە ژێر سەری ئەودایە. بەوە دەڵێن شانس و بەخت.

لە ئێزگەیەکی نێوان ڕێگەدا وێستاوین. دە چرکە لە کاتی وەڕێکەوتنەوەی شەمەندەفەرەکە تێپەڕیوە. ئەو شەمەندەفەرانە بەرنامەکانیان هەمیشە ورد و دروستە. جیهان رۆژنامەکە وەلا دەنێ و دەپرسێ: ئیم بیانس یانی چی؟

دەڵێم: ئیم بیانس فەڕانسەوییە، یانی ئەتۆ مۆسفێر، زەختی هەوا، کەش و هەوا.

جیهان لە فێربوونی زمانە تازەکاندا گرفتی هەیە، گرفتی منیش فێربوونی زمانە تازەکانە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو. بەم هۆیە لەتەك ئەودا چوار قوڕنەی دنیا گەڕاوم هەتا بتوانێ لە شوێنێك داسەکنێ.

ئەو حەزی زمانی فەڕانسە نەبوو و دەیوت: فێربوونی دژوارە. دیارە کە گشتی لەبیر چووەتەوە.

بەڵام ئەمن دوای شەش مانگ ، وا بە سەریدا زاڵ بوومە کە بتوانم لە تاقیکاری چوونە زانکۆدا دەربچم.

جیهان دەیوت: فەڕەنسیی زمانێکی لۆژیکی نیە و فێربوونی وەبەر زەحمەتەکەی ناکەوێ.

وتم: متمانەم بە قسەکەت نیە.
-بۆ؟
-ئاخر ئەتۆ و ئەم گشتە لۆژیکەی کە پێی پابەندی
-ئەمە چی بە فەڕانسە داوە؟
-چون هەر زمانێك بایەخ و بەڵگەی تایبەت بە خۆی هەیە. کاتێ فێری بی و بتوانی قسەی پێ بکەی جوانییەکەییت بۆ دەردەکەوێ.
-هەر زمانێك ئا، بەڵام ئیدی نە فەڕەنسیی.
-ئەوەی کە فەڕەنسیی زمانێکی دژوارە شکی تێدا نیە، بەڵام یەکێ لە جوانترین زمانەکانی دنیایە، ئیدی ناشێی ئەمە لەبەرچاو نەگری، سەرەڕای ئەمەش، ئەگەر وایە بۆچ ئێرەت هەڵبژاردووە؟
چاوەکانی تێك نا، لێوەکانی لێکنا، ڕاستییەکەی بۆخۆشم تێناگەم. ڕەنگبێ لەبەر نزیکبوونییەوە بووبێ، نزیك ئێران و بۆ ئێمەی ئێرانی تاموچێژی تایبەت بە خۆی هەبوو.
زمان هەر بیانوو بوو. خوشکی جیهان کە لەتەك شووەکەیدا چووبووە ئامریکا، ساڵێك دواتر دایکیشی برد. جیهان پێی وابوو بە چوونە ئامریکا گشتمان لە دەوری یەکتر کۆ دەبینەوەو داهاتووی کارەکەشمان لەوێ خاستر دەبێ، ئەمن پێم باشتر بوو لە فەڕانسە بمێنمەوەو کۆتایی بە دەرسەکانم بێنم. بەڵام لە رووی ناچارییەوە لە تەك ئەودا چوومە ئامریکا.
دڵم بەمە خۆش بوو کە ئامریکا ئاسۆیەکی روونمان بەڕوودا دەکاتەوە. فێربوونی زمانیش دژوار نەبوو. هەرچۆنێکی بێ ئێمە هەموو لە قوتابخانە ئینگلیزیمان خوێندبوو و شارەزاییمان بوو. بە تێپەڕکردنی خولێکی ڕاهێنانی زمان، بەڕەی خۆمان لە ئاو دەرکێشین.
لە پاریسدا دنیایەك بیرەوەری. زمانێکی جوان و یەك دوو دۆست گشتی ئەو شتانە بوون کە لە تەکما بوون. نە حەسرەتێك و نە بیروخەیاڵێ لەمەڕ گەڕانەوە، بەڵام جیهان ئامریکاشی لە لا پەسند نەبوو. هێشتا دوو ساڵێ لێ تێنەپەڕیبوو گازندەی ئەوەی بوو کە ئێرە دنیایەکی بێ سەرەو بەرەیە، دنیایەکی ماشێنییە و مرۆڤ لەودا نرخ و بایەخێکی نیە. ئەمن تەنانەت لەگەڵ ئەوە دانیم منداڵەکانم لە شوێنێکی ئاوادا بار بێن.
وتم: کام منداڵ؟ هێشتا منداڵێك لە ئارادا نیە. ئەی دەرسی من؟
وتی: گرینگ کارەکەی منە، دەبێ بتوانین ژیانمان هەڵسووڕێنین؟ ئەتۆش دەتوانی دەرسەکەت درێژە پێ بدەی، کەس بەرگری ئەم کارەی تۆ نیە.

ئیدی لێم روون نەبوو تاچ ڕادە باوەڕی بە وتەی خۆی هەیەو گرینگی من و دەرسەکە بۆ ئەم لە کوێدایە، هەر بەڕاستی گرینگییەکمان بۆی هەیە؟

وتم: سەدەیەك بەر لەمە بوو خوێندنم دەست پێ کرد. ئەوجار خوا دەزانێ منالانی پۆلەکەمان جیاوازی تەمەنیان لەتەك مندا چەندە دەبێ. سەرەڕای ئەمەش ئەو گشتە ئاوات و تاسەیەی نزیك بوونەوە لە خوشکت بوو بەچی؟

دنیای ئیمڕۆ بچووکە. هەر کاتێ گەرەکم بێ بە فڕینێك دەتوانم بیانبینم. سەرم بادا. پێویست بە وەبیرهێنانەوەی هەڵەبوونی بۆچوونەکەی نەبوو. زۆر شارەزابوو و بەم بابەتانەشی دەزانی.

وتم: لەگەڵت نایەم. هەتا کۆتایی وانەکانم هەر لێرە دەمێنمەوە.

نەیدەتوانی متمانەی بە وتەکەم بێ. خۆشم متمانەم پێی نەبوو.

وتی: لە مەبەستەکەت ناگەم.

-مەبەستێکی سادەو ساکارە. دەمێنمەوە هەتا وانەکانم تەواو دەبێ.

-چەند ساڵت ماوە تەواوی کەی، دەبێ چەند یەکەی دیکە هەڵگری؟

-گرینگ نیە.

-حەز دەکەی لە کوێ بژی؟ بژیوەکەت کێ دابینی دەکا؟

-خۆم ، کار دەدۆزمەوە.

-هەروا سانا؟

-ئەگەر هەتا ئێستا لە تاران مابامەوە بۆخۆم ببوومە دوکتۆر. هەر ولاتەی یاسا و پێڕەوێکی هەیە، هیچ دەزانی ئەم شتانە چەندە دژوارن، دەتوانن تا چەندە کارەکەم وەدوا بخەن.

هەر هیچ نەبێ ئینگلیزی زمانی رۆژی دنیایە و ناچار نی زمانێکی دیکە فێر بی.

پێکەنیم و وتم: زمانی شەوی دنیا و ڕۆژی جیهانە، ئەدی بڕیار وا نەبوو بگەڕێینەوە ئێران؟

-ئەگەر بگەڕێمەوە ئێران دەبێ لەپێشدا بچمە سەربازی.

-دەی؟

-خۆ ئێمە ژیانێکمان لەوێ نیە. چوونە سەربازی من یانی دوو ساڵ سەرگەردان بوون. بەو گشتە بەربەستانەی ئاوا ژیانێك.

-دەی؟

-دەبێ سەبر گرم، هەتا ئەوکاتە کە تەمەنی سەربازیم بەسەر بچێ.

-مەبەستت ئەمەیە کە هەر مرۆڤێکی خوێندەوار بۆ ئەوە نەچێتە سەربازی، لە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی پەژیوان دەبێتەوە؟

-هەتا ئەودەمە کە یاسایێکی لە ئارادایە، چارە نیە. لەمووچەیەك کە لە سەربازی پێمی دەدەن حەوتوویێك تێرمان ناکا.

-تەمەنی نەچوونە سەربازی چەندە؟

-بە دروستی نازانم.

-بەمە دەڵێن وادەی سەرجێخوون. خۆت دەزانی کە باوەڕم بە وشەیەك لە وتەکانتدا نیە، ئەگەر ڕاستییەکەی بڵێی هەر لە سەرەتاوە پێت خۆش نەبوو بگەڕێیەوە هیچ نەبێ دڵم ناسووتێ.

بێ ئەوەی وتەکەم ڕەت بکاتەوە وتی: ئەگەر چەند ساڵێك بمێنینەوە دەتوانین، بۆ داهاتوومان شتێك وەسەر یەك بنێین. ئامریکا داهاتوویێکی بۆ ئێمەی بیانی نیە.

-تێناگەم چۆنە لە ئینگلیزدا نابینە بیانی.

-ئینگلیز جیایە. دنیایێکی پێشکەوتوو و نوێیە.

-جیهان نوێ نیە؟

پێکەنی و بە دەم ئەوەدا کە دەستی دەخستە ملم، وتی: خۆ ئەتۆ من تەنیا ناهێڵییەوە، ئەتۆ لەتەك مندا دێی؟

ئەوساتە بۆ سێیەمین جار دەرسەکەم ناتەواو هێشتەوە و لەتەك ئەوداچووم. لەحاڵێك دا کە هەست بە سەرگەردانی و پەژیوانی وەك پرسیارێکی بێ وەڵام و بزەیەکی گاڵتەجاڕانە تەوژمی دەخستە سەر زەینم.

ئەوکاتە کە لە لەندەن جێگیر بووین ئیدی هەر بەڕاست نەمدەزانی چ لەم دەرسە پچڕپچڕە بکەم. پێشینیان وتەنی ئیش و کار لە ئینگلیزدا درەنگ و زووی هەیە بەڵام ئیدی ئەوە نیە لەبیر بچێتەوە. ئەو دەرسەی کە لە ئێران و فەڕانسە و ئامریکا دا خوێندبووم توانیم لە ئینگلیزدا کۆتایی پێ بێنم، بەڵام لێم ڕوون بوو گەڕانەوەمان بۆ ئێران تەنیا هەر خەون و خەیاڵ دەبێ. کەوابوو لانیکەم دەبێ بە یەکێ لە ئاواتەکانم بگەم.

*هەر وەك بەڵێنیم پێ دابووی دەبوا*

*ببوومایە دەرمانساز...*

به فاخته دەڵێم: پیاوێك بێ ئەوە بیرو باوەڕی لە بارەی شتێکەوە دەربڕێ، دەتوانێ ئەتۆ لە کارێك پەژیوان کاتەوە کە گەرەکتە بیکەی.

بە بزەوە دەڵێ: پەژیوان وشەیەکی پڕ بەپێستە، پیاوێك دەتوانێ ئەتۆ لەو کارەی کە دەتەوێ بیکەی جاڕز بکا، تەنیا پیاوەکە بیرو باوەڕەکەی جۆری دەردەبڕێ کە جیاوازییەکی لەگەڵ دژایەتیکردندا نەبێ.

دەڵێم: دژوارترین شێوەی ژیان، ژیانێکی لەڕواڵەتدا هێندە رازاوەیە کە تەنانەت بۆخۆت بۆت ساخ نەبێتەوە دەتوانی لە چ شتێ ناڕازی بی.

چاوەنوارم بڵێ، بڕۆ و بایەخی ژیانت بزانە.

دەمێك ساڵە سەروبنی هەموو قسەکانی ئەم ڕستەیە: بڕۆ بایەخی ژیانت بزانە.

هەتا گەرەکمە دەردی دڵی لەتەکا بکەم سەرێکی با دەداو دەڵێ: ئاخ، بایەخی ژیانت بزانە. کە کار دەکەی بۆخۆت سەر بەخۆی. لە باشترین شوێنی ئەم دنیایەدا دەژی. تەنیا مناڵێکیشت هەیە. زۆریش بیری لێ ناکەیەوە. کەوابوو بایەخی ژیانت بزانە.

*تۆ تەنیا کەسێك بووی کە هیچکات بە منت*
*نەدەوت: بڕۆ قەدری ژیانت بزانە...*

## ( ٤ )

جیهان کە رۆژنامەی دەکڕی، لێمی پرسی ئاخۆ رۆژنامە یا گۆڤارێکم گەرەکە؟ ئەمن هیچم نەکڕی.

بیر لەو ژن و مێردانە دەکەمەوە کە لە هەمبەریەك دادەنیشن و بێ هیچ دەنگ و هەرایەك چێشت دەخۆن. وەك دوو بەندی کە ناچار کرابن بە یەکەوە بدوێن. ئەو بەندییانەی کە جگە لەو چێشتەی کە لە دەورییەکەیاندایە هیچ شتێکی دیکە بە هێند ناگرن. رۆژانی سەرەتایی زەماوەندم، بینینی ئەم دیمەنانەم لە لا سەیر بوو و قەبوولکردنی سەخت و دژوار. پێم وابوو ئەوان لە ولاتێکی دیکەوە هاتوون. لام وابوو دەکرێ کارێکیان بۆ بکەی.

بۆ یەکەم جار «چێك» ئەم وتەیەی پێ وتم. کاتێ بە فیزو دەمارگرییەوە لە مەڕ زەماوەندمەوە دەدوام، پێکەنی و وتی: زەماوەند وەك بەندیخانە وایە، کە هەنگاوی تێدەنێی کلیلەکەی ون دەکەی و لەوە بە دواوە بە شوێن کلیلی ونبوودا دەگەڕێی.

وتم: دلّم بەو ئافرەتە دەسۆتێ کە رەنگە رۆژێك شووت پێ بکا.

-رۆژێ تێدەگەی هیچ شتێکی ئەم ژیانە بەو ڕادە کە تۆ پێت وایە، دروست و بەجێ نیە. چێك خەلّکی چێکۆسلەواکی بوو. ناویشی چێك نەبوو، ئەمن ناوم نابوو چێك. لە وانەی فەڕانسییدا لەتەك ئەو و لیانادا ئاشنابووم، لیانا، کچە دۆستەکەی بووکە خەلّکی ڕۆمانی بوو. ئەوانیش تازە هاتبوونە پاریس.

لیانا لەگەلّ بنەمالّەکەی هاتبوونە فەڕانسە. خوشك و برایەکی لە خۆی چووکتری هەبوو. دەیوت: ئیتر ناگەڕێتەوە ڕومانی. باوکی کاری دەکرد، باری ژیانیان لەبار نەبوو و گوزەرانیان بۆ سەخت و دژوار بوو. دەیوت بێشك دەبێ لە زانکۆ دەرچێ. دەرسی دەخوێندو کاریشی دەکرد.

دەیوت: لەبەر خەرج و تێچووی زانکۆ دەبێ کار بکەم.

نیازی بوو وەرگێڕی بخوێنێ. مرخ و لێهاتوویی‌یەکی لە ڕادەبەدەری لە زماندا هەبوو و لەم ماوە کورتەدا فەرانسەیی زۆر لە ئێمە باشتر قسە پێدەکرد.

چێك بە دوای کارەساتی بەهاری پراگدا کە رووخانی دووبچێك و زاڵبوونی دەسەڵاتی کۆمۆنیزمی لێکەوتەوە، هاوڕێی برا و دایك و باوکی لەوێ ڕایانکردبوو، بنەماڵەکەیم نەدی. هەر جارێك لە زانکۆ چاوم بە براکەی کەوت. وەك خۆی پۆشتەو پەرداخ و باڵابەرز و کاڵ و کرچ بوو. چێك لە دووری وڵاتەکەی زۆر بە داخ و پەرۆش بوو. دەمارگرییەکی فرەی بۆ وڵاتەکەی هەبوو. کۆچکردنەکەیانی پێ قبووڵ نەدەکرا. باوەڕی وابوو کە مرۆظ دەبێ لە وڵاتی خۆیدا بمێنێتەوەو بەربەرەکانێ بکا.

دەیوت: باوکم بۆیە لەوێ نەمایەوە هەتا ئێمە بتوانین سەربەست بژین. بەڵام ئەمن رۆژێك هەر دەگەڕێمەوە. ئەوێ وڵاتمە. هی خۆمە، ئەمە سەردەمێکە زوو دێ و دەڕوا. ئەوەم بە گوێی دایك و باوکیشمدا چرپاندووە. ئەوانیش زۆریان حەز لە مانەوەیە. کاتێك وێنای ئەو رۆژانە دەکەم کە دایکم تێیاندا دەژی پشتم دەلەرزێ. گەلێ لەو شەوانەی کە دەچمەوە ماڵێ وای بۆ دەچم ئەو هەر لەو شوێنە جێماوە کە بەیانی لە کاتی ماڵاواییدا لێی دانیشتبوو. هەست دەکەم رۆحی خۆی ون کردووە، بەڵام بۆ ئەوە باوکم ئازار نەدا دەنگی لێوە نایە.

چێك هەر ئەو فیزو هەوایەی کە سەبارەت بە وڵاتەکەی بووی لەمەڕ خۆی و بنەماڵەکەشیدا دەری دەبڕی. خۆی لە دیتران بە کەللاتر* دەزانی و دەیوت: پێداویستی و پێشکەوتوویی ئێرە بۆ من تا ئەوکاتە لەبارە کە دواتر بە دەردی وڵاتەکەم بخوات. ئێمە هەرتکمان پێویستیمان بە یەکتر هەیە و لە دووری یەکتر هەڵناکەین.

لیانا پێدەکەنی و دەیوت: گشتی ئەمانە خەون و خەیاڵی پڕ و پووچن. سەرچاوەی لەخۆبایی بوون لە نەزانینەوەیە، ئەمن کە تازە ناگەڕێمەوە ئەوێ. مرۆظ جارێك لە دایك دەبێ و جارێك دەژی و لەم ماوەیە دا دەبێ بە کەیف و بە دەماخ بێ. ئەوانەی تۆ دەیڵێی منداڵانەیە. باوکم رایسپاردووین هیچکات لایەنی سیاسەت نەگرین و لەبیری گەڕانەوە دا نەبین.

چێك دەیتوانی خۆی لە باسی جوانییەکان و بێ هاوتابوونی وڵاتەکەی بپارێزێ.

لیانا پێدەکەنی و وتەکەی ئەوی دەبڕی و روو لە من دەیوت: لێگەڕێ با ئەمن باست بۆت باس بکەم.

ئەودەم بە ئانقەست دەستی ڕادەوەشاندو دەیوت: لەبیر نەکەی کە چێکۆسلەواکی لە دوو بەشی چێك و ئۆسلەواکی پێکهاتووە. لێڕەواری فرەی هەن. ئاو و هەوای زستانەکانی ساردو هاوینانی گەرمە. واتە باشترینە.

چێك لێی دەڕوانی و ئەو درێژەی پێدەدا: کانگای ئێجگار زۆری هەیەو پیشەسازییەکەی پێشکەوتووە. دانیشتووانی باکووری بەتایبەتی ئۆگرییەکی زۆریان بە مۆسیقایەو خاوەنی ئۆپێڕایەکی گرینگە.

بە سیلەی چاوییەوە لە چێك ورد دەبۆوە: بەڵام ئێستا دیلی دەستی کۆمۆنیستەکانە و چاوەڕێی ئەوەیە هەتا ئەوان بچن و ئەویٚ رزگار بکەن.

چێك هەولی ئەوەی بوو بێدەنگی بکا. بەڵام ئەو لای لیٚ نەدەکردەوەو دەیوت: ئێمە ئەگەر وریاو قۆچاخ بین دەبیٚ لەبیری خۆماندا بین و بەرەی خۆمان لە ئاو دەرکێشین. سیاسەت بسپێرە دەست سیاسەت بازەکانەوە.

چێك بە تووڕەییەوە دەیوت: ئەوەی من باسی لێوە دەکەم پێوەندی بە سیاسەتەوە نیە.

ئەمن لە پێهەڵاگوتنی لەباری و جوانییەکانی وڵاتەکەماندا هاوڕێییم دەکرد. لیانا گوێی هەڵدەخست و سەری با دەداو دەیوت: گشتی ئەمانەی تۆ دەیانڵێی لەسەر یەك گۆی زەویدا هەڵکەوتوون و ئەتۆ لەخۆبایی ترین فاشیستەکانی ئەم ئەردو خاکەی.

چێك بە بیستنی وشەی فاشیست دەم و چاوی سوور داگەڕا و قیژاندی: بە من مەڵیٚ فاشیست. تۆ دەبیٚ باش تێگەیشتبی کە فاشیست چی لەگەڵ کردوین.

لیانا وتی: بە بڕوای من نیشتیمانپەرستی یانی ڕەگەزپەرستی. ڕەگەزپەرستی بەهەر شکڵ و شێوەیەکەوە بیٚ، ڕەوا نیە.

چێك بە گژیدا چوو: کەوابوو ئەتۆ وڵاتەکەت دەفرۆشی بە ئەمانە؟

-یانی چی وڵاتەکەت دەفرۆشی؟ ئەمن ئەوە ژیانی خۆم رادەبێرم، ئێستا کە دایك و باوکم منیان هێناوەتە ئێرە باشترین ڕێگا ئەوەیە لەو هەلەی بۆم رەخساوە کەڵك وەرگرم، ئەگەر لە وڵاتی خۆمدا مابامەوە رەنگ بوو بێکار و بیٚ بار بووبامە، کە چاوم بە فەرانسەوییەك دەکەویٚ هیچ جیاوازییەك و دەمار گرژییەك لە نێوان ئەو و رۆمانیاییەکدا بەدی ناکەم. هەر بۆیەشە گەرەکمە لە باشترین و لەبارترین شوێنیدا بژیم و بە باشترین شێوەش لە ژیانم کەلك وەرگرم. هەر کاتێکیش لە فەڕانسە وازم بەسەرچوو، و جێگەیەکی چاترم دەسکەوت، دەچمە ئەویٚ، باشترین

ڕێگەی ژیان بۆ ئێمەی کۆچەر ئەوەیە کە لە شوێنێکدا نەمێنینەوە. ئێرە عەردی خوایە و ئێمەش بەندەی ئەو.

بەڵام دڵتەنگی چێك بۆ وڵاتەکەی قووڵتر لەوە بوو کە بەڵگەو هەجەتی لیانای قبوولْ بێ، سەری پڕ لە داخی با دەدا و دەیوت: ئەگەر وڵاتەکەمیان پاژ پاژ نەکردبا، ئەگەر زوڵم و زۆری بەم ڕادەیە نەبووبا بێگومان ئەوێی بەجێ نەدەهێشت. ژیانێکی جیاوازو باشترمان دەبوو. باوکم بۆ دابینکردنی بژێوی بنەماڵەی ئەم کارە لێرە دەکا، ئەم کارە بایەخێکی بۆی نیەو بۆی هەیە ببێتە هۆی لەکار خستنی مرۆڤێك. دایکم هەست بەوە دەکا. ئەگەر یەکتریان خۆش نەویستبا دەوامیان نەدەهێنا. ئەوان دەزانن چ گەنجێکیان بەجێ هێشتووە. ئێمە یەکێ لە باشترین زانکۆکانمان لە پڕاگدا هەیە. چ پێویستییەکمان بە مانەوە لێرەدا هەیە.

چێك ئاشقی «دۆژاك» بوو و ئەوی بە مەزنترین مۆسیقازانی ئورووپا دەزانی.

دەموت: مەگین گوێت نەداوەتە کارەکانی بێتهۆوێن.

-بێتهۆوێن بەجێی خۆی،بەڵام ئەگەر گوێ بدەیە کارەکانی دۆژاك و گوێ لە کۆنسێرتی ویلۆن سیل ئیش و سەمفۆنییەکانی بگری ئەودەم لە مەبەستەکەم دەگەی.

بە دەم ئاخێکەوە درێژەی دەدا: تەنانەت ئەتۆش ناتوانی تێ بگەی دەڵێم چی.

دەڵێم: ئێستا ئەتۆ بۆچ ئاوەزی من دەخەیە ژێر پرسیارەوە؟

دەڵێ: ئەتۆ بە ویستی خۆتەوە هاتوویە ئێرەو پێدەچێ لە یەکەم دەرفەتدا بگەڕێیەوە.

دەڵێم: گومانی لێناکرێ. ئێمە دواجار هەر دەگەڕێینەوە.

سەری پڕ لە داخی با دەدا و دەڵێ: لە هیچ شتێ، بە تەواوی دڵنیا مەبە.

لیانا دەستی دەخاتە ملی و دەڵێ: بۆخۆی هەر دەگەڕێتەوە، بەڵام بڕوای بە گەڕانەوەی تۆ نیە.

سووڕی دۆستایەتی و خۆشەویستی ئێمە لەمەدا بوو کە دەمانتوانی بە دەست و دلێکی واڵاترەوە لەبابەت گشت شانازییەکانی وڵاتەکەمانەوە بۆ یەکتر بدوێین.

لیانا لە پاڵ ئێمەدا دادەنیشت، گوێی دەدایە وتەکانمان، پێدەکەنی و دەیوت: جێی باوەڕ نیە مرۆظ ئەم گشتە شانازییانە وەلا بنێ و سەر لە شوێنێکی دیکە هەڵێنێ. ئەگەر ئەم هەموو خەڵات و بەراتە لە وڵاتەکەتاندا هەڵڕژاوە لێرە چ دەکەن؟

چێك نارەزایەتی خۆی دەردەبڕێ: باوکم بۆی نەدەکرا لەگەڵ حکوومەتی دیاریکراوی یەکیەتی سۆڤیەتدا بسازێ. هەر ئێمە نەبووین، زۆربە ئەوێیان جێ هێشت.

ئەو باوەڕی بە زۆر شت نەبوو. گەرەکی بوو رۆژنامەوانی بخوێنێ، دەیوت: لە یەکەم دەرفەتـدا دەگەڕێمەوە. هەر کە خوێندنەکەم تەواو بوو دەچمە پڕاگ، ئەوێ جێگەی منە، کارێکم لێرە نیە.

دەیوت: دەگەڕێمەوە، تەنانەت ئەگەر وەك هەواڵنێرێکی شەڕیش بێ.

بەدەم ئاخاوتنــەوە دەســتەکانی بەخرۆشــەوە رادەوەشــاند و چــاوی تــەژی لــە فیــزو هــەوای دەبریسکانەوە.

بە دوای خوێندنی وانەکاندا دەچووینە کافتەریای زانکۆ. قاوەمــان دەخــواردەوەو باســەکانمان درێژە دەدا. لیانا پێیدا دەنووساو بە نەخشە و خولیاکانی ئەو پێدەکەنین. جارێکیــان پرســیم: تــۆ کەی زەماوەند دەکەی؟

لیانا بە داخ و کەسەرەوە چاوی لەو کرد. چێك لە کاتێکدا کە لــە پرســیارەکەی مــن ســەری سوڕ مابوو، دەستی خستە ملی لیاناوبەخۆیەوە گوشی و وتی:

زەماوەند وەکوو بەندیخانە وایە. ئەودەم لێی وەژوور دەکەوی کلیلەکەی ون دەکەی.

لیانا بە دڵمەندییەوە خۆی لەو دوورخستەوە و مستێکی خێواندە* شانی. پێکــەنی و وتــی: ئیتر بە هیچ کلووجێ کلیلەکەی نادۆزییەوە.

لیانا کیژێکی کەلان* بوو و پێم سەیر بوو کە ئەوان هەر هیچ لەبیر زەماوەندا نەبوون.

جارێکیان لە خواردنگەیەکی نزیك پۆلەکەماندا فراوێنمان دەخوارد. ژن و مێردێك چەند مێز ئەولاتری ئێمە دانیشتبوون و بە بێدنگی خەریکی چێشتخواردن بوون، چێك ئاماژەی بەوان کردو وتی: چاو، ئەوانە هاوسەری شازن. هەموو دوای بیست سی ساڵ ژیان ئاوایان لێدێ.

مــن و لیانــا دەنگــی رەخنــەمان هــەڵبڕی. چــێك وتــی: چــەند جــۆر زەماوەنــدمان هەیــە، دەستەیەکیان ئەوانەی کە ئەوینێکی راستەقینەیان سەبارەت بە یەکتر هەیەو ڕێزی یــەکتریان لــە لایە و لەهەر هەلومەرجێکدا لای یەکتر دەمێننەوە، دەستەیەکیش هەن کە سەبارەت بــە یــەکتر خەمساردن و کاریان بە یەکتر نیە، ژیانیان بە پێی ڕاهاتنە هەتا ئۆگری و خۆشەویستی. دەستەی دیکە ژیانێکی تەژی لە رق و قین بــە یەکــەوە تێپــەڕ دەکــەن و جگــە لــە جەزرەبــەدانی یــەکتر کارێکیان نیە.

من و لیانا هەر وا ڕەخنەمان دەگرت و هەوڵمان دەدا بەر بە وتەکانی ئەو بگرین.

وتم: ئەتۆ ئەو شتانە لە کوێ دەزانی مەگین تا ئێستا چەند جار زەماوەندت کردووە؟

وتی: پێویست ناکا مرۆظ زەماوەند بکا هەتا لەم مەبەستانە بگا. چاو لە هەر لایەك بکــەی پڕیەتی لەم مرۆڤانە.

پاشان به پێکەنینێکی بزۆزانەوە درێژەی دایە: ئەمن هێشتا نەختێ مایەم بۆ داناى. چونکە دەستەی یەکەم دەگمەنن.

لیانا وتی: چەشنی دایك و باوکی تۆ؟

دایك و باوکی من هەر رێك لەو کەم وێنەکانن. هی نەوەیەکی دیکەن کە تەمەنیان بەسەر چووە.

لیانا وتی: ئێستا ئەتۆ بۆیە دژی زەماوەندی، مەگین کەسێ ویستوویە زەماوەندت لەگەڵ بکا؟

وتم: لیانا راست دەکا، مەگین کەسێ دەیەوێ زەماوەندت لەگەڵ بکا؟

پێکەنی و وتی: مەبەستم لیانا نیە. مەبەستم ئەتۆی کە وا بە فیزوئیفادەوە لە ئەویندارى و زەماوەندەوە دەدوێی و مرۆظ توورە دەکەی.

وتم: دەڵەی ناتوانی بڕوات بێ کە لە نەوەی ئێمەدا کەسێ بە هۆی زەماوەندەوە بەختەوەر بووبێ.

-بۆچی، بەڵام تەنیا ئەگەر بە ڕادەی تۆ کەلان و دەلال بێ.

بە وتەکەی ئەو وەها گێژ بووم کە تا ماوەییێك نەمدەزانی چ پەرچەکردارێکم هەبێ.

*هیچکات هیچ کەس پێی نەوتبووم کەلانی،*

*تەنانەت ئەتۆش...*

تەنیا شتێکی کە لە منالێیەوە بیستبووم کەلان و دەلال بوونی ناهید بوو و پاشانیش کە کیژەکەی پوورە پەری لە دایك بوو، بوو بە دووهەمین کیژی کەلان. لە بنەماڵەی ئێمەدا دابەشکردنێکی گشتی هەبوو کە مووی دە کەلێنەوە نەدەچوو. خانم خانمێ جوانترین ئافرەتی بنەماڵە بوو و پوورە پەریش کە شێوەی ئەوی دەدا و ئەو کیژانەی کە لە ئەو دەچوون. لە سەردەمی منالێیدا لە خۆمم دەپرسی بۆچ کەس لەبابەت منەوە هیچ نالێ؟ پێم خۆش بوو لە دایکم بپرسم بە بڕوای ئەو منیش کەلانم؟ بە ناهیدیان دەوت خاتوونە دەلالەکە و بە منیان دەوت، رەشە خوێن شیرینەکە.

بە بێ بڕوایی لە چێك دەڕوانم، دڵم توندتر لێدەدا. ئەو کە هەروا لێمی دەڕوانی لە درێژەدا دەڵێ:

هەموو کیژەکانی ئێرانی وەك تۆ دەلالن؟

هەناسەیەکی قووڵی بۆ هەڵدەکێشم: نا ئەمن تاقانەم.

لیانا بۆی مات بووە، بە دڵ ئێشییەوە لێـی دەڕوانـێ و دەڵـێ: مـەگین نـابینی زەماوەنـدی کردووە. سەرەڕای ئەمە کیژەکانی چێکۆسلەواکی چی، ئەوان کەلان نین؟

بە لووت گرژییەوە وتم: تۆ خوا بەسە واز بێنە. ئەمن نە کـەیفم بـەم گاڵتانـە دێ و نـە لـەو شتانەش داهەم.

چێك پێکەنی و دەستی خستە ملی لیانا و بە دەم راموسانی کوڵمـەکانی سـەیرێکی مـنی کرد. سەیرکردنێك کە هێندێ جار مرۆظ دەتوانێ تەمەنێك نوقمی خەون و خەیاڵەکانی بێ.

لیانا هەر لەو کاتەدا کە خۆی بە باوەشی ئەوەوە رێك دەگوشی بە منی وت: وازی لێ بێنـە، ئاوەزی خۆی لە دەست داوە.

ماوەیەك لەمەوبەر چەمەدانێك کە جلوبەرگی بـووکێنیمی تێـدابوو کـردەوە. جلوبـەرگێکی سپی کە سی ساڵ لەمەوپێش لەبەرم کردبوو، تۆزێکی زۆری لەسـەر نیشـتبوو و ئەگـەر قـامکم بەسەریاندا دەهێنابا شڕ و دڕ دەبوون.

جیهـان لاپـەڕەی رۆژنامـە هەڵدەداتـەوە، لـە دەسـتەکانی ورد دەبمـەوە کـە لـە دوو لاوە رۆژنامەکەیان ڕاگرتووە. ئاڵقەکەی لە قامکدایە. دەستەکانم بە یەکەوە ڕێك دەگووشم و ئاڵقەکـە لە قامکمدا هەست پێدەکەم. ئاڵقەکانمان وێك دەچن و ڕێکەوتی زەماوەندی سی ساڵ لەمەوبـەری تێدا نووسراوە.

لەو ڕۆژە بە دواوە، هەموو جارێ بە شوێن فاختـەدا دەچـم، لـە نزیـك ماڵەکەیانـدا دڵـم وا دەکوتێ کە ترپە ترپی دەگاتە گوێم. لەسەر پێچی کۆڵانەکەیانـدا  دەکەومـەوە بـیر شـتێکەوە و هەزار تووك و نزا لەخۆم دەکەم. بەڵام دیسان بیرو نیگام هەر بە شـوێن کەسـێکدا دەگـەڕێ کـە چاکەت و شاڵواری رەنگ کرێمی لەبەردایە، چاویلکەی دژە هەتاوی لێداوەو لەبـەر دەم دەرگـەی ماڵە فاختە، لە پاڵ مندا وێستاوە. نازانم تا کەی لە تاران دەمێنێتەوە، هەر ئەوەنـدە دەزانم کـە هێشتا نەڕۆیشتۆتەوە. حازرم هەموو تەمەنی خۆم بدەم هەتا ئەو جارێکی دیکە لەوێ وێستابێ.

هەر کە با دەدەمەوە کۆڵانەکەیان ، هەست دەکەم لە پشت سەرمەوەیە. هەنگاوەکانم تونـدتر دەکەم، لاقم تێك دەهاڵێن، دەڵەی ڕێگە ڕۆیشتنم بـیر دەچـێتەوە. وەختـە جـەرگ و هـەناوم بـە سینگمدا بێنە دەرێ، دەگەمە ماڵە فاختە و لە زەنگی دەرگەیان دەدەم. زۆر بە پارێزەوە لە دەور و بەری خۆم دەڕوانم کەس بە دیارەوە نیە. بە خۆم دەڵێم ئیتر نایبینمـەوە. بێشـك ڕۆیشـتۆتەوە. فاختە وتبووی پەلەی گەڕانەوەیەتی.

حەسرەتی بینینی ئەو، حەسرەتێك كە لەخۆیدا بوو بە پێویستییەك، وازم لێ ناهێنێ. شـەش ڕۆژی حەوتوو و هەموو ڕۆژێ دوو کەڕەت* لەسەر ڕێگەی ماڵە فاختە سـەرقاڵی ئـەم جـۆش و خرۆشە دەبم. لە قوتابخانە ڕا دەگەڕێمەوە سـەردەمی پـڕ لـە هـەرا و هوریـا و سـۆز و هەسـتی گەنجایەتی و وانە خوێندن. بەڵام كە لە قوتابخانە دەردەكەوم و لە شەقام و كۆڵان و ماڵی ئەوانەوە نزیك دەبمەوە، دیسان تووشی هەناسەبڕکێیەكی توند دێم. لە ڕۆژانی هەینی و ڕۆژانـی پشـوودان بێزارم. پشوودانەكانی جەژنیش یانی دوو حەوتوو بە بێ هیوا ژیان بەسەر بردن.

ورده ورده عەقلم دێتەوە بەر. تاقیكارییەكان نزیك كەوتوونەوەو جگە لەوە ئیدی نابێ بیر لـە شتی دیكە بكەمەوە. تا ئەوەی ڕۆژێك لە نزیك ماڵە فاختـە دەیبیـنم كـە لەوبـەری شـەقامەوە دەگەڕێتەوە. هەنگاوەكانم توندتر دەكەم و لە كۆڵان بـا دەدەمــەوەو وا دەنـوێنم نەمـدیوە. وا بـە هەشتاو دەڕۆم كە هێندەی نەماوە وە عەردی كەوم. لەخۆم ناگەم. دەمگاتێ و سڵاوێ دەكا.

وردەچەرخێم. حەز دەكەم بڵێم سڵاو بەڵام دەنگێكی ناڕوون لە قورگمەوە دێتەدەر. لەخۆم، لە بێ ورەیی خۆم بێزار دەبم. هەنگاوەكانی لەگەڵ من ڕێك دەخاو دەڵێ: دیسان وەدرەنگ كەوتووی؟

ئەمجارە باشتر تێدەگەم كـە ئاخاوتنەكـەی لەگـەڵ دیـتران جیـاوازە. وشـەكان تـەواو و پتـەو دەردەبڕێ و كۆتایی هیچ وشەیەك ناقرتێنێ، پێم وایە شێوەزاری فەڕانسەیی بـە فارسـییەكەیەوە دیارە. بێشـك بـە هـۆی ئەمەوەیـە كـە لـەفەرانسـە دەژی و فەرانسـەوی دەئـاخوێ. شـاڵواری بۆروچاكەتی شین و كەشخەی لەبەر كردووە. بە بۆنی ئۆدكلۆنەكەی وەختە لەخۆ ببمەوە.

چاوەنواڕی وەڵامی منە. بەڵام دەنگ ناكەم و ناتوانم هیچ بڵێم. سێحرم لێ خوێندراوە، تـەنیا سەرم با دەدەم، دەپرسی: ئەتۆ و فاختە هاوپۆلن؟

بە ئەسپایی دەڵێم: بەڵێ.

زۆر شوكر كە توانیومە وەقسەبێم. دەڵێ: ئەمن جیهانبەخشم.

دیسان لێم ڕوون نیە جیهانبەخش ناوەكەیەتی یا ناوی بنەماڵەی. بریا توانیبام لێـی بپرسـم، بەڵام ورەم نیە.

ناوی من دەپرسێ.

وەختە بڵێم: نازانم.

*ئەگەر بەتۆم گوتبا وەختابوو ناوی خۆم*

*لەبیر بچێتەوە. بێشك دەتوت: بە بوونی*

*ئەم گشتە ناوە دیسان لەبیرت چووبوو. خۆ*

*دەتوانی یەکێ لە ناوەکانت بڵێی. زۆر شوکر*
*کە لەم بابەتەوە کەمایەسییەکت نیە...*

گەلێ جار لەبەر ئاوێنەدا مەشقی ئەوەم کردبوو کە لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەودا چۆن لەسەر خۆ بم. بەڵام ئاکامی گشت ئەم تێکنیکانە* ئەمە بوو کە تەنانەت ناوی خۆشم لەبیر کردبوو. سەرەڕای ئەمە دەبووا کامیانم وتبا؟

هەوڵ دەدەم بەسەر خۆمدا زاڵ بم، لەژێر لێوەوە دەڵێم: سەناعەت جەمشیدی.

دیارە کە لەمن گەیشتووە. سەری بۆ لای من لار دەکاتەوە، دەڵێ: سەناعەت جەمشیدی ناوی بنەماڵەتانە. ناوی چکۆلەتان چیە؟

-ئەمن ... ئەمن... ئەمن چەند ناوم هەیە.

نازانم بۆچ وادەڵێم. هەر ئەوە بەس بوو بڵێم، پەرتەو، یا شیرین، یا شووڕا.

دەڵێ: باشە، تێکڕای ناوەکانت بڵێ.

-ئاخر...

لە دڵی خۆم دا دەڵیم: ئاخر و ژەهرمار.

دەڵێ: ئاخر چی؟

لەشم شەڵاڵی ئارەقە، دەڵێم: پەرتەو.

-ئەمەیان کام یەك لە ناوەکانتە؟

-ناوی جنسییەکەمە. دایکم شیرینم پێدەڵێ. دیتران شووڕا.

هەناسەیەك دەکێشم. لەپی دەستم ئارەقەی کردووەو کتێبەکانم ئەوە دەبنە هەویر. هەست دەکەم لەژێرەوە لێم دەڕوانێ. ناوەکانم دووپات دەکاتەوە. دەڵێ: خۆزگەم بە خۆت کە ئەم گشتە ناوەت هەیە.

دەپرسم: بۆ؟

دەڵێ: کارێکی فرە خاسە کە مرۆظ مافی هەڵبژاردنی ناوی خۆی هەبێ.

لێوەکانم لێك دەگوشم: ئەمن مافی هەڵبژاردنم نەبووە، دیتران بوویانە، ئەمن.

جارێکی دیکە ناوەکانم دووپاتە دەکاتەوە. پێدەچێ بیانچێژێ و گەرەکییە لە زەینی خۆیدا تۆماریان بکا کە دەگەینە جێ. هەر دەڵەی گەلێك ساڵ بە ڕێگاوە بووینەو لەچاوترووکانێکدا هەموو شوێنێکمان بەزاندووە.

ڕادەوەستم، ئەو لە زەنگ دەدا. فاختە دەرگە دەکاتەوە و بە بینینی ئێمە واقی وڕ دەمێنێ. پێم وایە لەمەڕ دیتنی ڕواڵەت و دیداری منە، دەزانم کە دەمو چاوم سوور هەڵگەڕاوە و وەك گێژانم لێهاتووە. براکەی بانگ دەکاو بەرەو لای من دێ و قۆڵی باڵا پۆشەکەم دەکێشێ. وەخۆ دێمەوە، لەتەك ئەودا دەچم و بە خۆم دەڵێم بریا ئیتر نەمدیبایەوە. ئاوا ئاسوودەترم، بەڵام دەزانم هێشتا نەگەیومەتە سەری کۆڵان، دەزانم حازرم بۆ دیتنەوەی سەر لە نوێی هەرچی هەمە لە پێناویدا بدەم.

فاختە دەڵێ: ئێستا نۆرەی تۆیە. واباشتر نەبوو ئێمەمانان کەسانێکمان خۆش ویستبا کە زۆرتر لەبەر دەستمان بوون و لێمان نزیکتر بوون؟ ئاخر خۆ بێ عەقڵ و ئاوەزنین؟

ئەو ئاشقی کوڕی یەکێ لە دۆستەکانی خۆیان بوو، کوڕە دوای وەرگرتنی دیپلۆمی دواناوەندی چۆتە ئامریکاو فاختە ئیتر لێی بێئاگا بووە، باسێکیشی لێوە نەدەکرد. ئەگەریش لێم پرسیبا دەیوت: وازی لێ بێنە حەوسەلەم نیە. ئەوین و ئەویندارییەکانی سەردەمی منالی دەبێ لەبیر کەینەوە.

دەڵێم تێناگەم ئەو دەڵێ چی و بۆ پێی وایە ئەمن ئاشق بوومە. سەری با دەداو سەبارەت بە جیهان دەدوێ. ئەگەرچی دڵم دەڕوا، بەڵام دەستم بە زارییەوە دەگرم و دەڵێم: وازی لێ بێنە. ئەمن پێم خۆش نیە ئەم وتانە ببیسم.

بەڵام ئەو هەتا قوتابخانە لابەلا دەڕواو هەر چاوی لە منە. دەمخاتە ژێر بارانی پرسیارەوە. دەڵێ: خۆ ئەمن دەزانم. ئەگەر دانی پێدانەهێنی پێی دەڵێم:

پاڵی پێوە دەنێم و دەڵێم: ئەم قسە پڕوپووچانە چن. نازانم باسی چ دەکەی.

وازم لێ ناهێنێ، هەتا دەگەینە بەر دەرگەی قوتابخانە جاڕزم دەکا. دەڵێم: وازم لێ بێنە، چیتر قسەم لەگەڵدا مەکە.

ئەو ڕۆژە ئیدی لای لێ ناکەمەوە. قوتابخانە کە تەواو دەبێ، بێ ئەوە چاوەنواڕی بم وەڕێدەکەوم، هێشتا نەگەیشتوومەتە سەری شەقام خۆی دەگەیەنێتە من و بێ هیچ قسەیەك پێ بە پێی من دەڕوا. لەسەر پێچی کۆڵانەکەیاندا دەچرپێنێتە بناگوێم: ئەگەر ئێستاش هەروا لە مالی ئێمە بێ دێیە ژووریَ؟

بێ هیچ وەڵامێك لێی جیا دەبمەوە. هەر لەوێ دەویستێ و بەر لەوە لەبەر چاوی ون بم هاوار دەکا: سبەی بەیانی وەرە شوێنم، چاوەڕێتم، باشە؟

## ( ٥ )

شەمەندەفەر لە ئێزگەیەکی چکۆلە دەوێستێ. پێم وانەبوو لە ئیزگەی شەمەندەفەریشدا بۆیاغچی لەبەر دەمت قوت دەبێتەوە. لە سووچی لای ڕاست، لە دەرەوەی هۆدەی چاوەنواڕیدا، پیاوێکی گەنج لەسەر کورسیلەیەکی قاچ کورت دانیشتووە. کەلوپەلی بۆیاغەکەی لە پێش خۆی ڕیز کردووە، جگەرەیەکی بەلالێویەوەیە، وێناچێ دڵەڕاوکێی نەبوونی کڕیاری هەبێ. لای لێ دەکەمەوە و دڵم توند دەگوشرێ.

هەنیەم بە پەنجەرەوە ڕێك دەگوشم و بەو پەڕی سەرنجەوە تێی دەڕوانم. جیهانیش ئەوە تێدەگا، چاوم لێ دەکا و بە بزەوە دەڵێ: لە راستیدا ئەمە لەو شتانەیە کە ئەتۆ حەزت لێیان نییە.

جیهان بۆی وێنا ناکرێ، ناتوانێ قبووڵی بکا کە من پێڵاوەکانم قەت بۆیاغ ناکەم.

دەتوانم کەوشێ تورهەڵدەم بەڵام ناتوانم بۆیاغی لێدەم. تەنانەت کڕینی قوتووە بۆیاغێکیشم پێ چەتوونە.

*ئاخ، تۆ دەزانی، هەر تەنیا تۆ باوەڕ دەکەی...*

ڕێگەی قوتابخانەمان بە بەر دووکانی جەواد ئاغادایە. براکانم و کوڕەکانی پوورە پەری فێر ببوون هەموو ڕۆژێ لەسەر ڕێگەی قوتابخانە و لەبەر دووکانی جەوادئاغا ڕابوەستن و چاو لە ڕۆستەم بکەن کە لەپاڵ کۆمەڵە کەوشێك دانیشتبوو و لەسەر بڕیاری جەوادئاغا بزماری دەکوتا یا بۆیاغی لێدەدا. جارو بارەش دەچوونە لای و لە تەنیشتی دادەنیشتن و هەوڵیان دەدا کەوشێکی کە بە دەستییەوە بوو لێی وەرگرن و بزمار ڕیژی بکەن. ئەوهیچی نەدەوت و بە ئانیشکی وەلای دەنان و کەوشەکانی لێ دەستاندنەوەو لە پشت سەری خۆی دادەنان.

کە دەگەیشتمە ئەوان، رادەوەستام، ڕۆستەم سەری هەڵدێنا، کە چاوی پێم دەکەوت سەری بەر دەداوە. هیچکات نەدەچوومە نێو دووکانەکەی.

براکان و کوڕە پوورەکانم لەتەك دوو کەس لە هاوپۆلەکانیان لەبەردووکان وێستاون. یەکیان دەڵێ: ڕۆستەم، پێڵاوی پێی ڕۆستەمت هەیە؟

ئەوانی دیکە پێدەکەنن. سەری هەڵدێنێ، هەر کە چاوی پێم دەکەوێ سەر دادەخا. یەکێکی دیکە لە کوڕەکانی دەڵێ: ڕۆستەم، چەندەم لێ دەستێنی پێڵاوم بۆیاغ بکەی؟

کوڕە گەورەی پوورە پەری دەڵێ: ڕۆستەم ، هەر بەڕاستی کەوشی ڕۆستەمی بەچ ماوەیێ بۆیاغ دەکەی؟ دیسان قاقای پێکەنینیان بەرز دەبێتەوە.

دەچمە پێش و دەڵێم: خۆتان بێ تام مەکەن دەنا بە پوورە پەری دەڵێم.

کوڕەکان بە دەم پێکەنین و لاقرتێ* کردن، ڕێگەیان دەگرنە بەر و دەڕۆن. ڕۆستەم تاکەوشێکی کە بۆیاغی دەکا وەلا دەنێ و تایەکەی دیکە کە هەڵدەگرێ دەست بۆ چاوی دەبا.

ئەو پێ ئەو پێ دەکەم. جانتاکەم لە عەردی دادەنێم و پاڵ وە شیپانەی دەرگەی دووکانەکە دەدەم و دەڵێم: قەیدی نیە لە ماڵی ئێمەدا هەموو بە ناوەکان پێدەکەنن. تەنیا هەر ناوی تۆ نیە.

دەسماڵێك لە کەوشەکە دەدا، سەری دەبەر خۆی ناوە. دەڵێم: بە ناوەکەی منیش پێدەکەنن. بێ ئەوە سەری هەڵێنی دەڵێ: بۆ؟

- تێناگەم، بەڵام هەرکات دایکم بانگم دەکا شیرین باوکم پێدەکەنێ. دایکیشم پێدەکەنێ.

-خۆ ناوی تۆ شتێکی بۆ پێکەنین تێدا نیە.

-مەگین نازانی، ئەمن خۆ هەر دوو ناوم نیە، سێ ناوم هەیە. ڕەنگە هەر لەمەڕ ئەمەش پێبکەنن کە ناوم شیرین نیە.

*ئەو دەم سەرت بەرز کرد و پێکەنێت...*

وتم: دیتت ئەتۆش پێکەنیت.

لەپڕ بەری بە پێکەنینەکەی گرت. وتم: قەیدی نیە.

پرسی: حەز دەکەی کەوشەکانت بۆیاغ بکەم؟

کەوشی سووری قەیتاندارم لەبەر دابوو، چاوێکم پێداخشاندن و وتم: نا.

جارێکی دیکە سەری بەرداوە. پرسیم: حەزت لە بۆیاغ لێدانە؟

وتی: نا، وەك بۆی دەرمانخانە حاڵم دەشێوێنێ.

ڕوانیە دەرەوەی دووکان، شوێن نیگاکەی کەوتم. جەوادئاغا بوو.

کەلێم نزیك کەوتەوە سڵاوم کرد. جەوادئاغا وتی: سەلام خاتوونە چکۆلە، ڕۆستەم کەوشەکانی خاتوونە چکۆلەت بۆیاغ کرد؟

دیسان چاوێکم بە کەوشەکاندا گێڕاوە، جانتاکەم هەڵگرت و بە هەموو هێزەوە بەرەوماڵەوە دەلینگانم وەرێنا.

شەمەندەفەر شار بەجێ دەهێڵێ. سەرم وە شووشەکەیەوە دەنێم، لە مەزرا سەرسەوز و ڕێك وپێك و ئەو ئەسب و مانگا تەنبەڵ و تەوەزەلانە دەڕوانم کە لە سووچێك وێستاون. پیاوێکی هاوتەمەنی جیهان بە دالآنەکەدا دەڕوا. کورسیلەی لای جیهان بەتاڵە. چاوێکی خێرا بە کورسیلەکەدا دەگێڕێ و تێدەپەڕێ. پێم خۆش بوو لە لام دانەنیشت. ئەویش بەستە ڕۆژنامەیەکی لە ژێر هەنگڵ دایە. دیوارەکان حاڵم تێك دەدەن. لە جیهان ورد دەبمەوە. نازانم ڕۆژنامە چەندەمین قۆناغی بێدەنگی نێوانمان بووە.

سەیری ئەو خانووە وەرزێڕییانە دەکەم کە چەشنی خاڵگەلی پرژ و بڵاو تەنیاو دوور لە یەکتر دەنێو زەوییە مەزنەکاندا هەڵکەوتوون. دەکەومەوە بیر وتەکانی پوورە پەری کە دەیوت: هەرکەس لەهەر کوێ لە دایك بێ هەر لەوێش دەمرێ. بیروباوەڕێکی سەیر و سەمەرە بوو کە لەناخی گەورەتر بوو. لەکاتی زەماوەندی مندا بە دایکمی وتبوو: خوشکێ ڕێگە مەدە مناڵەکەت بەرنە غەریبایەتی. کە ڕۆیی هەر لە غەریبایەتیدا دەمێنێتەوە.

لەوە بەو لاوە دایکم هەرکات تاسەم دەکا دەست لەسەر دەست دادەنێ و دەڵێ: وەی لەدەست چارەنووس. ئەو کیژەش چارەنووسی لە غەریبایەتی نووسرابوو.

هەر ئەوە دەزانێ کە تەنانەت ئاوڵەمەم* لە غەریبیدا گووراوە.

باوکم لە کۆمپانیایەکی دەرمانیدا خەریك بوو. ساڵێکی کە لەتەك گرۆپێکدا بۆ دیتنی خولێکی فێرکاری نێردرایە ئاڵمان. دایکم لە دوایین حەوتووەکانی مانەوەی باوکمدا دەچێ و خۆی پێ دەگەیێنێ. کە دەگەڕێنەوە تاران، منی وەزگ کەوتبوو.

پاشان لە لای هەمووان وتبووی ئەگەر مناڵەکە کیژ بێ ناوی دەنێ شیرین. شیرین ناوێکی کەلان بوو کە کەس دژایەتی لەگەڵدا نەدەکرد. کە لە دایك ببووم باوکم وتبووی: هەر بەڕاستی پێت وایە دەتوانی ناوی ئەم بەرسولکە ڕەشە بنێی شیرن؟ ئەگەر ئەم مناڵە ئەسمەرە وردەڵەیە شیرین ناو بنێی پێمان پێدەکەنن. ئەم بەرسولکەیەی من خوێی هەیە بەڵام شیرین! چۆنە ناوی بنێین شووڕا.

دایکم دەنگی هەڵبڕیبوو: ئەو قسانە چن، شووڕاش بووە ناو؟ شووڕا یانی چی؟

-شوورِا ناوێکی بە ڕەگەز رووسییە.
پوورە پەری پرسیبووی: ئاغای دوکتۆر شوورِا ناوی کیژە یا کورِە؟
باوکم دەڵێ: هێندێ ناو کیژو کورِی بۆ نییە.

بە برِوای دایکم شوورا زیاتر بۆ کورِ دەبوو تا کچ.

بە برِوای باوکیشم جیاوازییەکی نەبوو کە ئەگەر ناوەکەم زۆریش کیژانـە نـەبێ. سـەرەرِای ئەمەش لەسەر ناوی من ساغ نابنەوەو لە ئاکامدا یەك دوو مانگ بـێ پێناسـە دەمێنمـەوە. هەتا ئەوەی کە ناوی پەرتەوم لێدەنێن کە غولاّم خـان وتبـووی دەکـرێ نـاوی کـورِیش بـێ و هیچکاتیش کەس بەم ناوە بانگی نەکردووم، لە قوتابخانە نەبێ کە ئەویش مامۆستاکان.

فاختە دەیوت: لە بابەت چارەنووسی ناوەکانی تۆوە دەکرێ کتێبێك بنووسرێ.

دایکم دەیوت: باوکت ئەوەندە بە داو دڵ بانگی دەکردی شوورِا و ئەو ناوەت لـێ دەهـات کە ناوی شیرین رەنگ و بۆیەکی پێوە دیار نەبوو.

ئەو تەنیا کەسێکە شیرین بانگم دەکا، ئەویش نەك هەمیشە، بۆ دیـتران شـوورِام. پـوورە ماه و رِۆستەم شۆشا بانگم دەکەن. دیارە ئەوەدەم کە تەنیاین رۆستەم بەم نێوە بانگم دەکا.

لەتەك جیهاندا کە ئاشنا بووم، بووم بە شووریدە.

بەم پێیە، ئەمن، شیرین، شوورِا، شۆشا، پەرتەو سەناعەت جەمشیدی، لەپرِ رِۆژێك بـووم بە شووریدەی جیهاندار. مرۆڤێکی تەواو تازە کـە بـە نیگـاییێکی جیـاوازەوە سـەیری دنیـای دەکـرد. تـەنیا ناوەکـەم نـەبوو کـە گۆرِابـوو، گشـت لایەنـەکانی ژیـانم گۆرِابـوو، تەنانـەت نیشتمانەکەشم.

لەو رِۆژەوە کە پوورە پەری وتەنی بردوومیانەتـە غەریبایـەتی سـی سـاڵ بەسـەر دەچـێ. ئەویش وتەنی تەرە* بوونم کە دەستی پێکرد ئیتر سێسەرەم لەسەر هەڵناگرێ.

سی ساڵە بوومەتە خاتوون جیهاندار. کەمتر لە ناوبانگی خۆم کەڵك وەردەگرم.

لەهەر شوێنێ وتوومە: سەناعەت جەمشیدی، هەر لەجێوە پرسیویانە: دەبـێ بـە کامیـان بانگت بکەین؟

یەکەم جار لە قوتابخانە بوو بەرەو رووی ئەم پرسـیارە بوومـەوە. پاشـان لەگـەڵی رِاهـاتم. دەموت: کامەی ناوێ، بەهەر دووکیان.

جارێکیان بیرم لەمە دەکردەوە ئەگەر ڕۆژێك بمرم و لە ڕۆژنامەدا بنووسن پەرتەو سەناعەت جەمشیدی. ڕەنگە بۆ سبەی ئەو ڕۆژە دۆستێك تەلەفۆنم بۆ بکا و بیەوێ لەتەك یەکدا بچینە سینەما، یاکوو بانگ بکرێینە میوانی.

*ئەمن و تۆ هەرتك تامی ئەم تەرەبوونەمان*
*چەشکە کردووە. تۆ لە منالّییەوە هەتا دەمی*
*گەڕاوەیی، ئەمن هەتا دوایین ڕۆژەکانی ژیانم...*

خانم خانمێ بە پوورە ماه دەڵێ: باوکت ئەمەی هێناوە، هێشتبای لە دێ بمێنێتەوە، باوکی وەکوو کەرێك کاری لێ دەکێشا و باوەژنیش دەیچەوساندەوە. هەنووکە ئەگەر بزانن بردۆتتەوە ماڵی خۆت و گەرەکتە دەبەر خوێندنی بنێی داوای دەکەنەوە، وازت لێ نایەنن. ئەوانە منالّ بۆ دەکار کردن دەخوازن نەك خوێندن.

پوورە ماه لەچکەی سەری راستە و پاستە دەکا و دەڵێ: بەڕاستی هەر لەبیرم چوو کە بۆچی هاتبووم.

-جارێ وەرە دانیشە چایەکی بخۆوە.

پوورێ کەوشەکانی لەبەر دەرگە دادەکەنێ. خانم خانمێ چای بۆ تێدەکا. دەچم لە لای هەڵدەتووتێم. دەڵێی ئێستا بە بوونی منی زانیوە، ڕوومەتم ماچ دەکا و دەستێك بە قژم دادێنێ. خۆم داوێمە باوەشی. ئەمن بەخۆیەوە دەگووشێ و ڕوو لە خانم خانمێ دەڵێ: چاو، هاوبەژنی ئەمەیە، مەگین منالّ جیاوازی لەگەڵ منالّدا هەیە؟

-باشە باش، هەموو هەر یەك چەشن نین. کەسیش کاری پێی نیە. ڕۆژانە کارێکی دەکاو شتێکی فێر دەبێ.

-شتێکی کە فێری دەبێ، سەرکۆنەکردن و بیستنی دەستوور و فەرمانی نەنکەکانە. بەوە دەڵێن کار؟ سەرەڕای ئەمە لاتان وایە بەم خێرکردنەتان دوارۆژی خۆتان دەستەبەر کردووە.

خانم خانمێ سەیرێکی هۆدەی پشتەوە دەکا کە پاپای لێیە. پوورە ماه ئیستکانە چا بە دەستەوە دەڵێ: خۆ دەکرێ شەوانە بچێتە قوتابخانە.

-شەوانە بینێرە قوتابخانە.

پاپا لە هۆدەی پشتەوە دێتە دەرێ، دەکۆخێ. پوورە ماه بە دەم ئاخێزەوە سلاوێ دەکا.

-یا ئەڵڵا ماه موونیر خاتوون ، عەلەیکومەسەلام.

خانم خانمێ چای بۆ پاپا تێدەکا. پوورە ماھ چـایەکەی زوو دەخواتـەوەو ڕادەبـێ و دەڵـێ: ئیشم بە نەنە دەدری بوو.

خانم خانمێ دەڵێ: خۆ دەدری دەناسی، لای خۆی بۆ نان کڕین ڕۆییو، دوو سەعاتی پێچووە.

-کەوابوو ئەگەر هاتەوە پێی بڵێن سەرێکم لێ بدا.

قژم دەگرێ و سەبر دەیکێشێ و سەرم مـاچ دەکـا. چـاوێك لـە ڕۆسـتەم دەکـا کـە نزیـك چێشتخانە لەسەر عەردی دانیشتووە و لووسی دەلاوێنێتەوە. کە لە هۆدە دەچـێتەدەر بـانگی نەنەگەورە دەکا، پارەیەك لە کیفەکەی دەردێنێ و شتێکی پێ دەڵێ. خانم خانمێ چاوی لەوانە، پاپا چایەکەی هەڵدەقوڕتینێ: دەسەڵاتی ژیانی خۆمان نیە.

خانم خانمێ دەڵێ: وست...

پاپا مرۆڤێکی ڕووناخۆش و بێ حەوسەلە بوو، بەڵام لە حاست خانم خانمێدا وەك مۆم نـەرم بوو. جاروبارە کە تووڕە دەبوو و دەیگوڕاند، یا قسەیەکی دەکرد کە بـە کـەیفی خـانم خانمـێ نەدەبوو، خانم خانمێ بێ ئـەوە لایـەکی لـێ بکاتـەوە، سـەری بـەر دەداوە و وەدەر دەکـەوت، هەرچەند هاواری دەکرد خانم خانمێ گوێی پێ نەدەدا. پاپا لێی روون بوو کار و باری ماڵێ بێ ئەو هەڵناسووڕێ و هەتا دوواین رۆژەکانی ژیانی هەر ئۆگری بوو. دیارە هـەر بـە ڕادەی ئـەو مرۆڤانەی کە وەك پاپا دەشێن ئەویـنداری کەسـێك بـن. پاپـا بـەر لەهـەر شـتێ راحـەتی و ئاسوودەیی خۆی گـەرەك بـوو، پاشـان بابـەت و مەبەسـتگەلی دیکـە. خـانم خانمـێ چـاکی تێگەیشتبوو و هەر بەم ڕادەیەش بە هێز و تونایی خۆی زانیبوو. ئەگەر ویستبای بێ ئەوە پاپا پێ بزانێ دەیتوانی خولخولە ئاسا هەڵیسووڕێنێ. لەوە ڕا هەستم بەمە کـرد کـە پـوورە پـەری لەبنەوە پێدەکەنێ و خانم خانمێ هەوڵی دەدا بێدەنگی بکا، بەڵام بۆخۆشـی نەیـدەتوانی بـزەی سەر لێوی بشـارێتەوە. گـەلێك جـار هەرکـە یـەکێك لـە ئێمـە منالـەکان لەگـەڵ ئەوانـەوە پێکەنیبایین، زوو تووڕە دەبوون و بە تانە و تەشەرەوە لێمانیان دەویست بێدەنگ بین. بۆ وێنـە پاپا هەروەك گشت پیاوانی سەردەمی خۆی بە ئاواتی بوونی کوڕێك بوو، بەڵام لە حاست خـانم خانمێدا کە سێ کیژی بۆ ببوو زمانی نەگەڕابوو، هەر ئەوەی وتبوو کە بەسمە ئیتر.

لووسی هەروا لەپاڵ ڕۆستەم لەسەر عەردی بۆی تخێڵ ببوو و چاوەکانی نـابووە سـەریەك و رۆستەمیش دەستی بە پشتی دادەهێنا، ناتوانم سێرەی لەسەر هەڵگرم، دەڵـێم خۆزیـا براکـانم لێرە بوونایەو ئەم دیمەنەیان بینیبا.

کاتێ براکانم و کوڕەکانی پوورە پەری بە یەکەوە بووباییێن هیچ شتێ باشاری نەدەکردن. ئیزنیان بە منیش نەدەدا کایەیان لەگەڵ بکەم. لەوەی کە سەرنجێکی ئەوتۆیان پێنەدەدام بە دەماخ بوون. دەیانوت: خۆ کایەی کیژۆڵانە نیە.

نەنە دەدری جار و بارە لێیان تووڕە دەبوو و دەیوت: دەبێ لەگەڵ کیژەکەی منیش کایە بکەن.

هەرکە دایکیشمی دەدی دەیوت: خاتوون کیژەکەم تەنیای تەنیایە. دەبێ یەکیشیان بۆ ئەمەیان بزێی، مناڵەکەم هاوکایەی نیە.

دایکیشم هەر بە ئاماژەی دەست وەڵامی دەدایەوەو دەیوت: حەی حەی ئەتۆش دەنگت لەجێیەکی گەرمەوە دێ.

نەنە دەدری دەیوت: وەڵڵاهی خاتوون هەر بۆ خۆم گەورەی دەکەم.

زۆر بەلەز خۆم دەگەیەنمەوە ماڵێ. هەلێکی لەمە لەبارترم بۆ نەدەڕەخسا کە خۆم بنوێنم و حەکایەتی کوڕێك بۆ براکانم بگێڕمەوە کە پاپا لە دێ هێناویە و قژی بەڕادەییك زۆرە کە دەم و چاوی نابینرێ. سەرەڕای ئەمەش لەتەك لووسیدا بۆتە هاواڵ. ئەوان خێرا ئەم هەواڵە بە گوێی کوڕە پوورەکانم ڕادەگەیەنن.

دەڵێم: لووسی لە باوەش گرت و لووسیش توند خۆی پێوە نووساند.

براکانم کە ئاواتیان بوو تەنانەت جارێك لەتەك لووسیدا کایە بکەن، متمانەم پێ ناکەن و پەیجوویانە دەمخەنە ژێر پرسیارەوە. هەتا ئەوەندەی بۆم دەلوێ بەتام و چێژێکی فرەترەوە حەکایەتەکە دەگێڕمەوە. هەر لەو دەمەی شەوێدا لێدەبڕێن بچنە ماڵە خانم خانمێ کە دایکم پێشیان پێ دەگرێ: ئەو دەمەی شەوێ بۆ کوێ دەچن؟ مەگەر سبەی ڕۆژ نابێتەوە.

هێشتا لەنان خواردنی بەیانی نەبووینەوە کە لەتەك دوو برا و کوڕە پوورەکانم دەچینە ماڵە خانم خانمێ.

خانم خانمێ کە دیتی بە پەلە پڕووزە و زۆر بە وردبینی و سەرنجەوە لە دەورو بەری خۆمان دەڕوانین، بزەکەی شاردەوە، بێ گرینگی دان بە نیگا پڕ لە چاوەنواڕی یەکەماندا وتی: چ بووە، موویان لێ ئاور داون. بۆچ هاتوونە ئێرە؟ ئەگەر نانتان نەخواردووە، نەنەگەورە هێشتا سفرەی کۆ نەکردۆتەوە.

بەڵام ئێمە هەر هیچ هۆشمان لەلای ئەو نەبوو. چاوەنواڕیمان گەلێکی نەخایاند. نەنە دەدری دەستی منالێکی لە دەستدا بوو کە بە عومری خۆم نەمدیبوو، هاتە ژوور. کوڕێکی داڵ

گۆشت کە سەریان لەبنەوەڕا تاشی بوو. ڕیشۆڵەی حەمامی هێشتا هەر بەسەر مل و دەستەکانییەوە دیار بوو. شاڵوارێکی درێژ کە دەلینگەکانیان بۆ قەد کردبۆوەو کراسێکی کە پێشتر دەبەر براکانم یا کوڕە پوورەکانمدا دیبوو، لەبەریان کردبوو. کوڕە سەری داخستبوو و لە دواوە وێستابوو، نەنە دەدری دەستی کێشاو وتی: ئەها خاتوون، چەند پاك و خاوێن بۆتەوە؟ لەمە سپیتر نەبۆوە.

کوڕە دەستی بە سەریدا هێناو کە دیتی کەوتۆتە ژێر چاوەدێری ئێمەوە رووی وەرگێڕا. یەکێك لە کوڕەکان لێی نزیك کەوتەوەو بە سەرنجەوە لە جلو بەرگەکەی ورد بۆوە و سووچی قۆڵی کێشا، بەڵام بەر لەوە قسەیەك بکا، خانم خانمێ هەستا بە نەنە دەدری وت کوڕەی ببا نانی بداتێ. ئەوجار رووی لە ئێمە کرد و وتی: واپێدەچێ ئێوەش کارێکتان لێرە نەمابێ.

تووڕە بوو و بە بێ وازی ئێمەی بەرێکردەوە ماڵێ. وتم: خانم خانمێ دەکرێ ئەمن لە لات بمێنمەوە؟

زۆر بە ساردی چاوێکی لێکردم و وتی: نا، لەتەك براکانتدا بڕۆ. بەڵکوو دایکت کاری پێت بێ. دەتوت لەگەڵ خۆی دەدوێ، لەژێر لێوەوە وتی: مناڵی لاپرەسەنی شۆڤارە.

نەنەگەورە لە چێشتخانە دێتەدەرو چاو دەگێڕێ، نەنە دەدری بانگ دەکا: وەرە پاروە نانێك بێنە ئەم مناڵە بیخوا، بەستەزمانەی لە خورێنی بردۆتە حەمام. بۆیە دەڵێن: بە نەبوونی ئاوەز رۆح لەپرسەدایە. و بە بۆڵە بۆڵ دەگەڕێتەوە چێشتخانە.

هێشتا لاقم نەناوەتە ئەو دیوی دەرگە دەگەڕێمەوە، دەبینم کە نەنە دەدری دەستی دەکێشێ بیباتە چێشتخانە. رادەوەستم هەتا بڕوا و کوڕە پوورەکانم دوور دەکەونەوە. رۆستەم لەلای نەنەگەورە دانیشتووە، سەری بەرداوەتەوە و چایەکەی دەخواتەوە. نەختێ نان و پەنیری لەپێشە. نەنەگەورە بانگم دەکا. دەچم لە لای دادەنیشم. چام بۆ تێدەکاو خەریکە پارویەکم بۆ بگرێتەوە کە دەڵێم: نامەوێ.

پارووەکە دەداتە روستەم. لێی دەڕوانم بەڵام ئەو سەیرم ناکا. سەری بەرداوەتەوە. چایەکە دە زیرە* دەکا، بە وریایی بۆ زاری دەباو ئاگای لێیە نەڕژێ. ڕێك لەو دەمەدا لووسی لەبەر دەرگەی ژوورێدا پەیدای دەبێ، کە دەیەوێ هەستێ نەنەگەورە دەگوڕێنێتە سەری: لەجێی خۆت دانیشەو چایەکەت بخۆوە. نابێ دەست لەم پشیلەیە بدەی.

لووسی سەیرێکی ئێمەو دەور و بەری هۆدە دەکا. رۆستەم سەری بەرداوەتەوە بەڵام لە بنەوە هۆشی لای پشیلەکەیە. لووسی بۆ ماوەیێ لەبەر دەرگە دەوێستێ پاشان هەر لەوێ

بەرەو تاو لەسەر عەردی ڕادەکشێ. نەنەگەورە ئیستکانەکە لەپێش ڕۆستەم هەڵدەگرێ، سفرەی نان خواردن کۆ دەکاتەوە و لە هۆدە دەچێتە دەرێ.

ڕۆستەم چاوێك لەمن دەکا، رادەبێ و بەرەو لووسی دەچێ. پشیلە بە بینینی ئەو خولێك لێدەدا و خۆی لەبەر یەك دەکێشێتەوە. رادەبم و دەچمە لای ئەوانەوە. لووسی تا چاوی پێم دەکەوێ گوێیەکانی قووت دەکاتەوەو لەجێی خۆی ڕادەبێ، ڕۆستەم دەستی دەباتە بەر زگی پشیلە، لە باوەشی دەگرێ و دەڵێ: پێت خۆشە بیلاوێنیەوە، وەرە رامگرتووە. وەرە وەرە، هێدی هێدی بیلاوێنەوە.

*بۆ یەکەم جار بوو دەنگتم دەبیست، لەسەرخۆ*
*دەست بە سەری پشیلەکەدا دێنم و هەتا سەر*
*پشتی دەیهێنم، لووسی سەری وەرسووڕاندووە.*
*بێ بڕوا ئاگای لە بزاڤی دەستی منە. ئەتۆ*
*دەستت دەخەیە سەردەستم و لەسەرخۆ*
*پشیلەکە دەلاوێنییەوە. ئێستاش قورسایی*
*و گەرمی ئەو دەستە بچکۆلەیەم کە هێشتا*
*ڕیشۆلەکەی حەمامی هەر پێوە بوو، لەبیرە...*

جیهان دەڵێ: ئەمن لە دوو خووی تۆ سەر دەرناکەم. یەکیان ئەمە کە کەوشەکانت هیچکات بۆیاغ ناکەی.

دەڵێم: چ قەیدییە: مەگین ئەم کارە زیانی بۆ کەس هەیە؟

واقی وڕدەمێنێ، دەڵێ: بەلاتەوە گرنگ نیە چەندەت بە کەوشێك دابێ. تەنانەت ئامادەنیت دەسماڵێك بەسەر گرانترین کەوشەکانیش دابێنی. ئامادەش نیت بیدەی بۆیاغت بۆ لێ بدەن.

گریانم دێ، لێوەکانم بە یەکەوە لێك دەگوشم، دەڵێم: ئەمن قەت کەوشەکانم بۆیاغ نەکردووەو نایکەم. نەك هەر ئێستا، سەد ساڵی دیکەش، ئەمە پێوەندییەکی بە نرخی کەوشەوە نیە.

-ئەوە ئیتر عوزری بەترەف* تر لە گوناحە. مرۆڤ دەتوانێ ئاڵووگۆڕ لەخۆیدا پێك بێنێ، ناتوانێ؟

دەڵێم: نازانم.

لێوەکانی بە یەکەوە لێك دەگوشێ و روو لە لای پەنجەرە دەکا. یەکەم شتی سەرنج ڕاکێش لە هۆدەی میواناندا، جووتێك پێڵاوی کیژانەیە کە نراوەتە سەرکوورەکە. پێڵاوی کۆنە کە هەروا بابەتی باسەکان بووە. پێڵاوی قەیتانداری سوور کە هەرکەس دەیانبینێ دەپرسێ: ئەم پێڵاوانە چەند جوانن، بێشك هی کیژەکەتانن، جیهان دەڵێ: نا، هی ستارە نین. پێڵاوی شووریدەن.

-چ یادگارێکی بەجێ و چ کارێکی سەرنجڕاکێش؟

کەسانێکی کە زۆرتریان دیون دەڵێن: مرۆظ دەتوانێ لەنێو ئەم پێڵاوانەدا شووریدە بێنێتە بەرچاو، ئەرێ هەر بەڕاستی چەند ساڵت تەمەن بوو؟

-زۆر چاکت ڕاگرتوون.

جیهان بە پێکەنینەوە دەڵێ: ئەوانی لە من خۆشتر دەوێ.

-ئەم کەوشانە ئێستا پەیدا نابن.

-هەنووکەش هەر شتێکی وەك ئەمانە لە ئێراندا دروست دەکەن، بەڵام ئیتر چەرمی رووت نیە. پێڵاوەکان بوونەتە مەکینەیی.

-ئەو کەرەستەیەی کە دەکاریشی دەکەن دەسکردە.

جیهان دەڵێ: کەوابوو دەبێ بووبێتە ئەنتیکە.

وا دەڵێ ئەنتیکە کە زۆرتر لەگاڵتە پێ کردن دەچێ.

پێم وابێ باشترە لەسەر کوورەیان لابەم.

تەنیا شتێکی کە لەو ڕۆژانەم بۆ ماوەتەوە ئەو جووتە پێڵاوەی سەر کوورەکەیە. پاپۆچەی حەوت، هەشت ساڵانەم کە هەر جارێك بۆیاغیان بەخۆیانەوە دیوە. گەرەکمە تەنانەت ئەو تۆزوخۆڵەی کە چەند ساڵە نیشتۆتە سەریان هەروا ڕاگرم.

دایکم پرسی: کوا پێڵاوەکانت؟

-دڕاون.

-دڕاون؟ یانی چی دڕاون، تازە کڕیبوومن.

-نا، تازە نەبوون.

-تازە نەبوون، نوێ نەبوون؟ چۆن شتی وا دەبێ. ئێستا لە کوێن؟ چیان لێهات؟

-قەیتانەکەیان پچڕاوە.

-قەیتانیان پچڕاوە پچراوە، خۆ تووڕت نەداون؟ بیاندە نەنە دەدری بیانباتە دووکانی جەواد ئاغا بۆتیان بدووریتەوە.

-ئەمن پێڵاوی دیکەم هەیە، پێویست بە دروونەوەیان ناکا.

-هەروایە سوورەت دی سەمات لەبیر چوو. ڕۆڵە بڵێ کەوشەکانت چ لێکردوون؟

نابوومنە نێو جلو بەرگەکانم و خستبوومنە چەمەدان. لە یەکەم دەرفەتدا سەریان دەدەم و باشتریان دەشارمەوە. ڕۆژی دواتر کە چەمەدانەکە دەکەمەوە دەبینم نەماون، دەزانم دایکم هەڵیگرتوون.

خۆم سوور دادەگێرم و دەچم لێی دەپرسم: پێڵاوەکانموو چ لێکردووە. کوا لەکوێن. وەختە لە حەیفان بگریم.

دەڵێ: ئەم پێڵاوە گەمار گرتوو و چلکنانەت بۆچ لەنێو لیباسی پاك و خاوێندا حەشار داوە؟

لاقم دە عەردی دەکوتم و دیسان دەپرسمەوە.

بێ ئەوە سەر لەسەر کارەکەی هەڵبڕێ دەڵێ: چیت کردووە و ژاریمار. دامنە نەنە دەدری بردنیە دووکانی جەوادئاغا. ئەگەر بۆی کرا دروستیان بکاتەوە، ئەگەریش بۆی نەکرا دایاننێ بۆخۆی. هەتا ئیتر پێڵاوی پیس و گەمارگرتوو نەخەیە پاڵ جلوبەرگی شۆراوە.

بۆ یەکەم جار هەست بەوە دەکەم ترسم لێی نیە. هیچ شتێ بە ڕادەی پێڵاوەکان بۆم گرینگ نیە. دەگوڕێنم: پێڵاوەکانی خۆمم دەوێ، کەس هەقی نەبوو هەڵیانگرێ.

دایکم لە دەوروبەری دەڕوانێ، ڕۆژنامەیەك کەلە بەردەستی بوو تووڕ دەداتە لام: وست، مانای چیە کیژ دەنگ هەڵبڕێ، ئەویش بۆ جووتە پێڵاوێك. هەڵە لەمنەوەیە داومە دروستی بکەنەوە.

فرمێسك دەخزێتە سەر گۆنام، بە هەموو هێزمەوە دەنگ هەڵدەبڕم: پێڵاوەکانم دەوێ، ئەمن هەر پێڵاوەکانی خومم دەوێتەوە.

دایکم ڕادەبێ بۆ لام دێ و دەستی هەڵدێنێ. نەنەگەورە پێشی دەگرێ و دەڵێ: خاتوون وازی لێ بێنە. منالەکەم لە قوتابخانە گەڕاوەتەوە، ماندوو و برسیە. پێڵاوەکانی دەخوازێ دەچم لە جەوادئاغای دەستێنمەوە.

دەستی من دەگرێ و دەڵێ: ئەوە ئیدی گریانی نـاوێ. هەنووکـە دەچـم. چـاو چـاو، ئـەوە ڕۆیشتم... دایکم دەڵێ: نەنێ ئاخر عەیبە. بە شوێن جووتە پێڵاوێکی کۆنەدا چـوون چـی لـێ دەبێتەوە؟ کیژیش بەم ڕادەیە ڕوو هەڵماڵڕاو...

-باشە خاتوون، منالّە پێڵاوەکانی خۆش دەوێ ئیدی. چ قەیدییە.

بەڵام نەنەگەورە نەچوو، هەرچی چاوەنوار مام لە چێشـتخانە دەرنەکـەوت، پرتـەو بۆڵـەی منی کە بیست وتی: ڕۆڵە مەگری، هەنووکە کارم تەواو بێ دەچم.

هەر ئەودەم زیز بووم و بۆ فراوێنیش کەس بانگی نـەکردم. نەنەگـەورەش دەنـگ و باسـی نەبوو. هێندە گریام هەتا لە سووچێکی هۆدەدا لەخەو ڕاچووم. دوای نیـوەڕۆ نەنـە دەدری بـۆ خۆی و قاپێك چێشتەوە لێم وەژوور کەوت. لە باوەشی گرتم و دەم و چاومی ڕامووسی و وتـی: رابە ڕۆڵە، رابە فراوێنەکەت بخۆ دڵت لـەخۆ دەبێتـەوە. پێڵاوەکانیشـت هـەر ئێسـتا رۆسـتەم دەیانهێنێتەوە.

*تۆ پاکەتێك بەدەستەوە پەیدا بووی. دایکم*
*بە دیار سەماوەرەوە دانیشتبوو، سڵاوت کرد،*
*نەت دەزانی پاکەتەکە بدەی بەو یا من. ساتێ*
*وێستای پاشان پاکەتەکەت بۆلای من راداشت و*
*لەسەرخۆ گوتت:پێڵاوەکانتن،بۆیاغم کردوون...*

دایکم بە بزەیەکی گاڵتەجاڕانەوە ئاماژەی منی کرد و وتی: بڕو بیدەیێ. لەنیوەڕۆوە هـەتا ئێستا بۆ جووتە پێڵاوێك هەر نووکاندوویە.

گۆنام بە پشتە دەستمەوە سڕیەوە. نەنێ هەتا هات پێڵاوەکانی لێ وەرگرێ، لەجێوە ڕابووم ، رۆستەمیش دەستی لەو کێشاوە.

دایکم وتی: ئیدی ئەو ئەنتیکەیە دیسان نەبەی بیشاریەوە.
*بەهێواشی وتم:پێویست بە بۆیاغکردن نەبوو.*
*ئاخر ئەتۆ حاڵت تێك دەچوو. پاکەتەکەت*
*کە دەدایە من سەرت با دەدا و دەتوت: نا...*

پێڵاوەکانم بە پاکەتەوە خستە نێو چەمەدان، ڕۆژی دواتر بردمە ماڵـە پوورەمـاە بۆمیـان تاقەت بکا. پرسی: ئەوانەت بۆ هێناوەتە ئێرە؟

-ئاخر ئەم پێڵاوانەم زۆر خۆش دەوێن و نامەوێ لە پامی بکەم بـدڕێن. دایکـم بیانبینـێ تووڕیان دەدا و گوێشم پێ نادا.

پوورە ماه سەرێکی باداو وتی: بڕۆ بیانبە هۆ ئەو هۆدەیە و بیانخە نێو دۆلابەکەی من.

دواتر کە دۆلابێکم بۆ جلو بەرگ و کتێبەکانم پەیدا کرد، کەوشەکانم لە ماڵە پـوورە مـاه وەرگرتەوە و خستمە ناوی و دەرگەم گاڵە داو کلیلەکەیم لەگەڵ خۆمدا دەبردە قوتابخانە. دایکم ڕۆژێکیان پرسی دۆلابەکەم لەبەرچی گاڵە دەدەم؟

وتم: دۆلابی خۆمەو کلیلەکەشی دەبێ لای خۆم بێ. شتی واشی تێـدا نیـە کـەس بـۆ لای بچێ.

وتی: بێشك دیسان چەند جووت پێڵاوی کۆنەت تێدا حەشار داوە؟

-چەند جووت نیە. هەر جووتێکەو کەسیش هەقی نیە دەستیان بۆ بـەرێ. بـە بـزەو بۆڵـە بۆڵەوە وتی: زۆر روو هەڵماڵاوی. ئەو پێڵاوە کۆنانە بە کەڵکی چیت دێن. خۆ دەلاقتەوە ناچن.

-چ بەکەڵکم بێن و چ نەیێن هی خۆمن و کەسیش هەقی بەسەرەوە نیە.

هەر بە بزەوە رووی لێ وەرگێڕام و وەشوێن کاری خۆی کەوت. ئەمنیش رووم لێ وەرگێڕا و چوومە هۆدەکەی خۆمەوە. ئەو رۆژە سنووری نێوان مناڵ و دایك لەنێو ئێمەدا بەزی. ئەو ڕۆژە چەشنی دوو مرۆڤی مەزن لە هەمبەر یەکتر وێسـتابووین. بـە هـۆی پێڵاوەکانـەوە یـەك ڕۆژە مەزن ببووم.

لێمشتی فرمێسك لە پشت چاوەکانمەوە هەست پێدەکەم و دەسەڵاتێکم نیە. جیهان کە لـە پەنجەرەوە سەیری دەرەوە دەکا دەڵێ: بێدەنگی تۆ لە هەمبـەر بیتاقـەکانی شـانس و بەختـدا. ئەمەش لەم بابەتانەیە کە من چی لێ تێناگەم.

هەوڵ دەدەم لەسەر خۆ بم و دەڵێم: بێدەنگی من؟ مەگین ئەمن بەرپرسی بیتاقەکانی شانس و بەختم؟

-تۆ بەرپرس نیت، خۆ لە مەبەستەکەم دەگەی.

-نا تێی ناگەم. روانگەکان لە حاست پـارە دا جیـاوازن. تەنانـەت ئەگـەر پێویسـتی بـە دروست بوونیش نەبێ. ناکرێ بە پێی ویستی دیتران یا بنکەیەکی کە خەڵك بە مەبەستی پارە پەیداکردن دەکاتە ئامرازی خۆی، ئاڵوگۆر لەبیرو هەستی خۆمدا پێك بێنم.

-ئەمە چەشنێك بە تاوانبار زانینە.

-هیچکات بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە یەکێك تاوانبار بکەم. خۆ ئەمن بەرپرسی کاروباری خەڵك نیم.

-هەر ئەو رەخنەگرتنە خۆی چەشنێك تاوانبارکردنە.

-بیرو باوەڕی من چی لە رەخنەگرتن داوە. باشە ئەمن لەسەر بیرو باوەڕی خۆم سوورم، دڵ ئێشی تۆ لە چییەوەیە؟

-ئەمە بە واتای مەودا دروستکردنە.

-مەودای چی؟ من هەقت پێدەدەم، تۆ بۆچ هەق بە من نادەی؟ بۆ تۆ پێت وایە ئەمن وەدێهینەری ئەم مەودایەم؟ مەگین مرۆڤەکان بۆیان نیە لەتەك یەك بن و لەتەك یەکیش سەربەست بژین؟

بە دڵ ئێشییەوە دەڵێ: مەبەستت لە سەر بەستی چیە؟ بێدەنگی تۆ چەشنێك بێدەنگی تاکەکەسییە، جۆرێ دژایەتی بێ دەنگە. مرۆظ هەست دەکا تاوانبار ناسراوە. لەحاڵێکدا ئەم شتانە پاژێك لە ژیانن. گەشت و سەیران و شایی خۆشی ژیانە.

بیتاقە نەکڕینی من لەکەیەوە بۆتە بەرهەڵستی خۆشییەکانی ژیانی خەڵك؟

بە بێ وازی دەستەکانی ڕادەوەشێنێ: ئەتۆ بۆچ قسەت لەگەڵ ناکرێ؟

هیچ ناڵێم، دنیای ئەو پینەچییەکەی خۆی لەدەست نەداوە کە پارە ئیتر گرینگییەکی بۆی نەبێ. ئەو تێناگا کە پارەکانی دنیا بە گشتی ئەو هێزو توانایەیان نیە تەنیا ساتێکی دیداری پینەچییەکەم پێ بدەنەوە. لە دنیای ئەودا، چێك نەکەوتۆتە بەستێنی بیرەوەرییەکان و هیچ شتێ ناتوانێ تەنیا بۆ ساتێ دیداری نەگونجاوی ئەوم بۆ ڕێك بخا. چاوەکانم دەنێمە سەریەك هەتا دیمەنی ئەوان لە ناخی خۆم دا بپارێزم.

گەرەکمە بڵێم: ئێمە بە نەبوونی زۆر شت دەتوانین بژین. بێ فەلسەفە، بێ شانۆنووس، بێ نووسەر، بێ پێڵاو، بێ رۆژنامە. رەنگە هەر نەختێ ئاو و نیسکێك چێشتی کەمتر و بڕووکەیەك هاودڵیمان بۆ ژیان پیویست بێ.

بەڵام ئەو هەروا رووەو پەنجەرەیە.

حەزم لێ بوو عەردێکم بووایە تەژی لە خاڵخاڵۆك و قالاو و ئاسمانێکی پڕ لە هەوری گەواڵ گەواڵ، هەتا بیرەوەرییەکانم بۆیان گێڕابایەوە. ئەگەر لە شوێنێ خاڵخاڵۆکێك بدۆزمەوە هێدی و هێمن لە سەر لەپی دەستمی دادەنێم و هەڵیدەفڕێنم. ئەوان بێ دەسەلاترین و خوێن شیرینترین بوونەوەری سەرعەردن. ئەوان بەینەتدارانی* کڕ و کپن. کاتێ دەیانخەمە نێو دەستم هەر

دەڵەی دەبنە پاژێك* لە گیان و لەشم و بۆ جیابوونەوە و ڕۆیشتن هەوڵێك نـادەن. لـە دوورەوە لە قالاّوەکان دەڕوانم، باڵندەگەلێکی مەتین و لەخۆبایی کە بە سەربەستییەکەیانەوە پێبەنـدن. کە لێیان دەڕوانم  لام وایە هەر هەنگاوێك کە هەڵێدەگرن لێوڕێژە لەسەر بەسـتی و لـەخۆبایی بوون، کە ڕەنگە لەمەڕ ئەوە بێ کە کەسانێکی کەم خۆشیان دەوێن، ناشێن متمانەیان بە کەس بێ. هەمیشە بە ترسەوە لە مـرۆظ ورد دەبنـەوەو یەکـەم بزاڤیـان بۆخـۆ دوورخسـتنەوە لـە ئێمەوەیە.

*شەمەندەفەر وردە وردە وەڕێدەکەوێ، بەبەر*
*دەم گەنجێکی بۆیاغچیدا  تێدەپەڕین.*
*هیچ جێیەکی  شبی  پینەچییەکەی من نادا.*
*سەروە پاڵگەی سەندەڵی دەدەم و چاوەکانم*
*دەنووقێنم...*

بەر لە ئێمە، یاساو بەربەستگەلێکی قایم و پتەو لە ئارا دابووە کە تەنیا کارێکی کـە لـە دەستیان دەهات پێشگرتن لە دیتران بوو.

هەر بە هۆی ئەم ئەگەرەو بەربەستانەوە بـوو کـە لـە ڕێـورەسمی تازیـەباری خـانم خانمێـدا نەمدەتوانی لەبری بلاّوکردنەوەی شریتی ئایینی، هەوایەکی دابنێم کە خـۆی زۆری پـێ خـۆش بوو و هەموو جاری لەژێر لێویەوە نارەناری دەکرد.

بۆ نەمدەتوانی دەستی پاپا بشکێنم هەتا نەتوانێ لـە ڕۆسـتەم بـدا؟ ئەگـەر لـە باوەشـی دەکردم دەستەکانیم با دەداو پێم وابوو دەتوانم بیانشـکێنم. بـیرم لـەوە دەکـردەوە کـە ئەگـەر ڕۆژێك بمرێ پەرۆشیم نابێ. ئەودەم دەستم دەخستە ملی و دەم و چاوم بە سینگییەوە دەناو بۆنم بە لەشییەوە دەکرد کە هـەمووی هـەر ئاسـایش و هێـز بـوو. باوەگەورەیـەکی کـە چەشـنی دێوەزمەکانی نێو حەکایەتەکان بوو و هێزی تەنیا بەسەر منالاّنی هەتیوی بـێ دایـك و بـاوك دەشکا.

*باوکمم هەتا ئەوکاتە خۆش ویست کە تۆ*
*نەهاتبووی، لەوە بەولاوە ئیتر لەنێوان*
*خۆشویستن و نەویستندا تەرە بووم. لەو*
*نەدەترسام، لەبەر تۆ لێی دەترسام...*

## (٦)

شەمەندەفەر لە ئیزگەیەکی چکۆلەی جەرگەی ڕێگەدا تێدەپەڕێ. جیهان بە قەراخ ڕۆژنامەکەیدا چاوێك لە ئیزگە دەکا، پاشان دەڵێ: بیتاقەکانم دا بە تۆ؟

کەوتمە بیر بیتاقەیەکی دیکەوە کە چەندین ساڵ لەمەوبەر پێی دابووم.

هەوڵ دەدەم ئیتر بە شوێن فاختەدا نەچم. هەجەت* دێنمەوە و لە ڕۆژان زووتر دەچمە قوتابخانە. فراوێن هەر لەوێ دەخۆم. تووك و نزای خۆم دەکەم و لێدەبڕێم هەموو شتێ لەبیر بکەم. بەڵام فاختە وازم لێ ناهێنێ. هەروا لەگەڵم پێدادەچێ و بیرەوەرییەکی کە لە جیهانی هەیە و سەردەمێکی کە لەتەك براکەیدا دەچوویە قوتابخانەو دەگەڕاوە ماڵێ بۆمی دەگێڕێتەوە. دژایەتی لەگەڵ ئەودا بێ کەڵکە. ئەگەر گوێ بدەمە بیرەوەری یەکانی مەچەکم دەگرێ و سوێند دەخوا کە ئاشق بووم. سوێند دەخۆم هەتا هەم قسەی لەگەڵ نەکەم. چەند ڕۆژێك ناچمە شوێنی. وا بە دەرس و دەورەکانم ڕادەگەم کە دەڵێ: شەرتێ دەبەستم ئەمساڵ لە سەرانسەری پارێزگادا قوتابی یەکەم دەردەچی.

بەڵام دەرسێکی کە دەیخوێنم چاکی تێناگەم. هەستێکی بەهێز و ماندوویی نەناس و ئاگا و بە جۆش و خرۆش لە ناخمدا وەگەڕ کەوتووە. دەڵێی عەردی ژێر پێم هەست پێ ناکەم. بۆ تاقیکارییەکان هێندەی نەماوە، ڕۆژێك فاختە دەڵێ: جیهان هەواڵی تۆی دەپرسی.

دڵم دادەخورپێ بەڵام دەپرسم: جیهان کێیە؟

پێدەکەنێ، برۆکانی هەڵداوێ و دەڵێ: جیهان کێیە؟

ئەوجار مستێکی توند لە باسکم دەدا، ڕوو بە ڕووم دەوەستێ، دەست دەنێتە سەرشانم و لە جەرگەی پیادەڕێدا ڕام دەگرێ و دەڵێ: جیهان، جیهانبەخش، ئا لەبیرت چۆتەوە. کەوابوو ئەگەر لەبیرت چۆتەوە هیچ.

-مەگین لە فەڕانسە نەبوو؟

بە هەڕ و گیفەوە دەپرسێ کێ؟

ڕوو وەردەگێڕم و دەڵێم: کەس، وازی لێ بێنە.

-باشە دیسان هاتۆتەوە، بۆ پشوودانی هاوین هاتۆتەوە.

-سەرو چاوم گەرم داهاتووە، دەڵێ: ئیمڕۆ لە ماڵی ئێمە بوو.

بێدەنگ دەبم هەتا لە بابەت ئەوەوە بدوێ. لەبنەوە چاوی لێمە.

-ئیمڕۆ لە حەیفی مێهران هەر پیشم خواردۆتەوە. هەر پێم دەڵێ دەبێ کتێب بخوێنمەوە و هێندەش خەمسارد نەبم. ئەمەی لە لای دایکم و جیهانەوە وت. دەڵێی سەرپەرشتی منە. وازم لێ ناهێنێ. دایکیشم هەق بەو دەداو چاوی لە زاری ئەوە. ئیدی ناڵێم چ باش بەڵام خوا ڕوحمی کرد باوکم مردووە. ئەگەر ئەویش زیندووبووایە بێشك قەفەزێکیان دەکڕی منیان تێدا بەند دەکرد. خۆزگەم بەخۆت کە کەس کاری بەسەرتەوە نیە.

کارێکی پێم نیە؟ لە ماڵدا بە تێکڕایی کاریان بە منە. بەڵام دەرفەتیان پێ نادەم پێی ڕابێن کە بە حیساب و کتاب لەگەڵیان بجوولێمەوە، دەنا حیسابی نۆکەری ماڵم بۆ دەکەن.

پێدەکەنێ: نۆکەر، نانا.

-ئا نۆکەر نا.

بە بەدفەڕی دەستی لە قۆڵم دەخاو دەڵێ: جیهان...

بەبێ دەسەڵاتی پێی دەڵێم: تۆخوا باسی لێوە مەکە.

-یانی چی؟ بۆ؟

ئەگەرچی لە ناخەوە کەیف خۆشم، دەڵێم: وازی لێ بێنە با بە وانەکانمان ڕابگەین.

-وانە، چی بەوانە داوە؟ سەرەڕای ئەمە مێهران دەیوت: شانۆیەکی خۆش لە زانکۆ پێشان دەدەن. دەیوت بڕیارە لەتەك جیهاندا بچن دەیوت جێی خۆیەتی ئێمەش بچین ببینین.

دەڵێ: مێهرانمان کەم بوو جیهانیشی پێوە زیاد بووە. باوەڕ دەکەی کە لیستەیەکەی لە کتێبە تازەبڵاوکراوەکانی وەرگرتووە، بە منیشی داو گوتی دەبێ ئەمانە بکڕم. حەوسەلەی هەیە، بە کامە کات وسات؟

دەپرسم: چ کتێب گەلێك؟

-هێشتا بە دروستی نەگەیوەتە جێ. ڕوون نیە ڕیزی کتێبەکانی لە کوێ هێناوە. پێدەچێ کاری مێهران بێ لەسەرەوە ڕاسپێردراوە. نازانم بۆچ بە تێکڕایی وای بۆ دەچن ئەمن نەخوێندەوارم و دەبێ ڕێنوێنی بکرێم.

دیسان دەپرسمەوە: چ کتێب گەلێك؟

-شانۆی چی، دێی؟
-نازانم بەم تاقیکارییانەو کاتە کەمەوە...
قۆڵم دەگووشی: وەی ئەتۆش، لەگەڵ ئەم دەرسەت منت کوشتووە، بڕیارە جیهانیش بێ.
خۆمی لێ دوور دەخەمەوە: نانا، پێم ناکرێ بێم.
بزەی دێتێ: ئەدی بە گیانی خۆت، کەوابوو بێشك هەر دێی. بە گیانی دایکم هەر دەبێ بێی.
-بۆ لە خۆوە گیانی دایکت سوێند دەخۆی.
-سەعات شەشی ڕۆژی پێنج شەممە لێرە بە.
-ئاخر ئەمن وتم بۆم ناکرێ بێم.
-لەتەك مێهراندا دەچین.
-ئەمن نایێم.
بە بزاڤێکی شانۆکارانەوە دەڵێ: جیهانیش لێرە دەبێ.
-دەڵێی گوێت گران بووە. نەتبیست وتم نایێم؟
-بۆچی بیستم، سەعات شەش لەبیر نەکەی.
دایکم و باوکم کە یەکەمجار ناوی ئەویان بیست، باوکم پێکەنی و وتی:
هەم جیهانبەخشە هەم جیهاندار؟
ئەو ڕۆژە جوانترین مۆسیقایەکی کە بیستم دەنگی ئەو ناوە بوو. یەکەم جار کە وتی: ئێستا ئیتر خاتوون جیهانداری. نەمدەزانی دەتوانم ئەم بەختەوەرییە بە چ شتێ پێوانە بکەم.
سەیری جیهان دەکەم و لەخۆم دەپرسم ئاخۆ دەتوانی لە دڵەخورپێ و بێتاقەتییەکەی ئەو ڕۆژانەی من وێنا بکات؟
لە بەیانییەوە هیچم نەخواردبوو. هیچ خواردەمەنییەکم بە گەرودا نەدەچۆوە خوار.
بە خۆشییەوە لە ماڵەکەی ئێمەدا کەس دەربەستی خواردن و خۆراکی ئێمە نەبوو. هەموو دەیانزانی هەر چۆنێکی بێ لە یەکێك لە ماڵەکان دا شتێ دەخۆین. دەنا بە پێچەوانەوە بێشك یەکێ ئاگای لە بێ ئیشتیایی و گۆڕانی سەرو وەزعی من دەبوو. جلوبەرگەکانم هەزار کەڕەت هەڵگێڕ وەرگێڕ پێکردبوو و هەزار جار وتبووم باشترە نەچم. لە نزیك ماڵە فاختەدا هەستم کرد لاقەکانم توانای ڕاگرتنی لەشمیان نیە. کە لە زەنگی ماڵەکەیانم دەدا دەستم دەلەرزی. فاختە زوو دەرگەی کردەوە. دیسان هەر ئەو بزە سەیر و سەمەرەی پڕ لە ڕیچ بوونەوە شاراوەی

کە ئێجگار تووڕەی دەکردم، بە دەموچاوی یەوە خۆی دەنواند. وتی: مێهران لەبەر دەرگەی زانکۆدا بەوادەی بە جیهان داوە.

لەبەر دەرگەی زانکۆدا چاوەنواری ئەوم. مێهران لە دەوروبەری دەڕوانێ و دەڵێ: هەر ئێستا پەیدا دەبێ، گەلێك جار زۆری پێناچێ.

سەرمامە، قۆڵەکانم بە دەستەکانم دادەپۆشم. فاختە دەڵێ: هەوا سارد نیە کە تۆ سەرماتە. زۆر بە سەرنجەوە لێم ورد دەبێتەوە. لێوەکانم لێك دەگوشم، گەرەکمە بڵێم: بێدەنگ بە. بزەی ئەو وەك تابلۆیەکی مەزن بە بەرچاومدا دێ و دەچێ. سەرم پێی دەگێژەوە دێ. لێم نزیك دەکەوێتەوەو دەستی لە قۆڵم هەڵدەکێشێ. گەرمای هێورکەرەوەی لەشی ئەو بە تەواوی هەست پێدەکەم، دەڵێم: نەدەبووایە هاتبام.

توند بە قۆڵمەوە دەنووسێ و دەڵێ: ئەمەش جیهان.

سەرهەڵدەبڕم و لەو شوێنە دەڕوانم کە ئاماژەی پێکردووە. چەند هەنگاوێکمان لێ دوورە. تاڤگەیەك لە ناخمدا وەگەڕ دەکەوێ. بشێویەکی هێندە شیرینە کە حەز دەکەم لە درێژایی تەمەنمدا دەوامی بێ. پۆشتەو پەرداخ، بالآبەرز، لەگەڵ تێکڕای ئەو کەسانەی کە تا ئەو رۆژە دیومە جیاوازە. کە دەگاتە لامان سڵاو و چاك وخۆشییەکی بێ سەرەوبەرە دەکەین. سپاس بۆ خوا کە ناچار نەکراوم قسەیەك بکەم. ترسم لەمە بوو نەکوو دەست و پێی خۆم ون کەم و زمانم تێك بهاڵێ و دیسان ناوی خۆمم لەبیر بچێتەوە. بۆ ساتێ لە چاوانی ورد دەبمەوە. فاختە راستی دەوت چاو سەوزە. ئەمجارە جیاوازییەکەی ئەو باشتر هەست پێدەکەم.پیاوێکی تەواو ئورووپاییە. جل لەبەر کردن و ئاکاری شازە*. بۆی هەیە هەر بە بزاڤێکی دەستی، مرۆظ ئەویندارى خۆی بکا. ئەمجارەش هەست بە بۆنی ئۆدکلۆنەکەی دەکەم و هێدی و بێدەنگ لەناخەوە هەناسەیەك دەکێشم هەتا عەترەکە لە تەواوی لەشمدا بگەڕێ. فاختە باسکم دەگووشێ و لەژێر لێوەوە پێدەکەنێ. وەخۆ دێمەوەو خۆم هێمن و لەسەرخۆ دەنوێنم. بەڵام ئەو دیسان باسکم دەگرێ و لەهەر دەرفەتێکی دەستی دەکەوێ خۆی ڕیچ دەکاتەوە. حەسرەت بە* لەسەرە خۆیی و بێ خەیاڵییەکەی دەخۆم. خۆم بە باسکییەوە دەگوشم.

لە هۆڵی شانۆدا کوڕەکان لە دوو لای ئێمە دانیشتوون. جیهان کە ئێستاش لێم روون نیە ناوی چکۆلەی جیهانە یا ناوبانگی — هەوڵم داوە لە فاختە شتێ نەپرسم و ئەو ئاورەی کە چاوەڕوانێتی، خۆشتری نەکەم — لە پاڵ من دادەنیشێ.

کپ و بێدەنگم ، سەهۆڵ ئاسا ڕەق هەڵاتووم. فاختە وەك هەمیشە خەریکی چەقەسرۆیی* خۆیەتی. زۆر شوکر کە لەجیات هەمووممان دەئاخۆێ. مێهران شتێ لە جیهان دەپرسی. جیهان رووی تێدەکاو لێواری چاکەتەکەی لەسەر کورسییەکە ڕا دەکەوێتە سەر باسکی من، قۆڵی چاکەتەکەی لە باسکی من دەسوێ. لە سەندەڵییەکەدا ڕۆدەچم. دەڵێی کارەبا گرتوومی ورەی خۆ بزاوتنم نیە. حازرم گشت دنیا پێشکەش بکەم هەتا قۆڵی چاکەتەکەی بۆ هەمیشە هەروا لەسەر باسکمدا بمێنێتەوە.

ئاخۆ دەزانێ؟ پێم وتووە؟ تێناگەم.

ستارە دنیایەك لە بیرەوەری یەکانی من دوورە. بێ بڕوا و بەبزەیەکی ماقوولانەوە سەری با دەدا و دەڵێ: مەگین ئێوە لەچ سەدەیەك دا دەژیان؟ دەڵێی باسی دووسەد، سێ سەد ساڵ بەر لەمە دەکەی. درك پێکردنی ئەوەی من تاقیم کردۆتەوە، ژیان لە دنیایەکی لێوڕێژ لە توندوتیژی و بەربەستە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەو نەلواوە. ئەو راست بینتر لەو سەردەمی منە بەڵام لە دنیاییێکی دەسکرددا دەژی.

دەڵێ: ئێوە لە خەون و خەیاڵدا ژیاون و بە هۆی فیلمەکانەوە فێری ئەوین بوون ئەگینا ئەویندار بوون ئەم گشتە گێرەو کێشەیە ناخوازێ.

ئەوین ئیمڕۆ و دوێنێی بۆ نیە. ئەوین هەموو ساتێ هەر ئەوینەو تەژی لە جۆش و خرۆش. ئەوەی دژوار بوو جێخستنی ئەو لە چوارچێوەی ئەخلاقییەکاندا بوو.

دیسان بزەی دێتێ: بەڵام پێدەچێ ئێوە پێوانەکانیشتان زۆر لەبەرچاو نەدەگرت. بەم پێیە پێوانەیەکی زۆر بەرێوجێش نەبووە.

دەڵێم: باشە هۆکاری تایبەت بە خۆی هەبوو.

دەزانم بۆم نالوێ چیەتی ئەو لۆژیکەی بۆ شی بکەمەوە کە لە پێکهاتەی کۆمەڵگا و لە تانوبۆی ئەرێ و نەرێ کاندا تەنراوە.

بەسەربادانەوە دەڵێ: ئێمە دەرفەتی ئەم چەشنە ئەویندارбوونەمان نیە، هەرکەس نیەتی.

دەڵێم: بەداخبوونی ناوێ؟

برۆکانی هەڵداوێ: تێناگەم. ئەوینیش هەروەك شتەکانی دیکە لەگەڵ زەمان و لەتەك ئێمەدا دەگۆڕێ.

هەرکە چراکان دەکوژێنەوە، جیهان لە کورسییەکەدا ڕۆ دەچێ و پشتی بەکورسییەکەوە دەنێ. گشت هەول و تەقەلام ئەمەیە بە سەرنجێکی باشترەوە لە کایەو ئەکتەرەکان ورد ببمەوە.

بەڵام مەگەر دەکرێ. لە تەنیشت کەسێ دانیشتووم کە بۆی ئۆدکلۆنەکەی گێژی کردووم. خۆی مەحوی تەماشای شانۆیە. ئەگەر نـەختێ بجووڵێمـەوە لاقـم وەلاقـی دەکـەوێ یـا دەسـتم وە باسکی. بە چەشنێ وڕو کاس بووم هەر دەڵێی لەسەر ئەم دنیایە نیم.

تێناگەم چ ماوەیێ لە دەسپێکی شانۆکە تێپەڕیبوو کە کاغـەزێکی بچـکۆلە لەبـەر چـاوم ڕادەگرێ، سەری دێنێتە پێش و دەڵێ: ئەم بیتاقەیە هی تۆیە. حەز دەکـەی وەکـوو دیارییـەك لای خۆتی ڕاگری؟

بە ترسەوە رووی تێدەکەم. درەوشانەوەی چاوەکانی لەم تاریکانییەدا دەبیـنم. ئێسـتا ئـەم پرسیارە لەخۆم دەکەم، ئەوشەوە چاوەکانی شین ببوون؟

بیتاقەکە وەردەگرم و گەرمای دەستی لەسەر بیتاقەکەدا هەست پێدەکەم. حەز دەکـەم بـە روومەتمەوەی بنێم و بۆی عەترەکەی هەڵمیسم.

بیتاقەکە لە ماڵدا بە سینگمەوە دەنێم و چـەند سـەعاتێك سـواری شـاباڵی خـەیاڵ دەبم. یەکەم جارە کە بوونی جەستەیی ئەو هەست پێدەکەم. هەتا بەر لەمە تەنیا خەیاڵ بوو و ئێستا ببووە خەیاڵێك کە دەکرا هەستی بکەی. بیتاقەکەم گەڵێك ساڵ هەر لە لا بوو. ئەگـەر لـە لام نەبووایە نە ناوی شانۆکەم بیر دەکەوتەوە، نە نووسەر و ئەکتەرەکانی.

ئەو شەوە هەتا بەری بەیانی وەخەبـەر دەمێنمـەوە و بـیر لـە مرۆڤـانی ئەوینـداری دنیـا دەکەمەوە کە لە ژیانی خۆیاندا هیچکات نەنوستوون. بەرەبەرەی بەیانی خەریکـە خـەوم لـێ بکەوێ. دەنگی دایکم دەبیسم کە دەڵێ: وادیارە ئەمرۆ بیری چوونە قوتابخانەت نیە؟

وەك کارەبا لەجێگاکەم دەردەپەڕم. بیتاقەی شانۆ دەخەمە نێو جانتاکەم و لەتـەك خۆمـدا دەیبەم.

ماوەیێ بەر لەمە بە شوێنیدا دەگەڕام، دواجار دۆزیمـەوە. بـەڵام ئێسـتا نـازانم لـە کـوێ دامناوە.

# ( ٧ )

حەز دەکەم چاوێکی بۆ گەرم بکەم، بەڵام نێو شەمەندەفەر شوێنێکی لەبار بۆ بێدەنگی و تەنیایی نیە. مسافیرەکان هەروا سوار دەبن و دادەبەزن، شەمەندەفەر لە گەلێك ئێزگەدا دەوێستێ و دەرفەتێکی وا بۆ بێدەنگی نامێنێتەوە. لێم ڕوونە خەوم لێناکەوێ. تا ئێستا لەنێو هیچ شەمەندەفەرو فرۆکەیەکدا نەخەوتووم. هەرکە پێلکەکانم نایە سەریەك ، یادو بیرەوەرییەکان هێرش دەکەنە سەر زەینم و لەپێش چاومدا رزە دەڕۆن.

وڵاتی ئێمە ئێران بوو...

مەڵبەندی شێران و دلێران بوو...

لەگەڵ ڕۆستەم بە دەوری حەساردا ڕامان دەکردو شێعرێکی کە تازە فێری ببووین بەیەکەوە دەمانخوێندەوە. دەنگمان وردە وردە بەرزتر و سەرتر دەچوو. لەو کاتەدا هەرکەس بەلامانەوە تێدەپەڕی دەیوت: وازبێنن، هێندە مەقیژێنن.

-مەزن ئاغا خەوتووە.

- خاتوونە گەورە خەوتووە.

-مێشکمان چوو.

-مەگەر هەواڵی مردووتان پێیە؟

-ماڵتان وەسەر یەك گێڕاوە.

لەگەڵ هەرکام لەو هۆشدارانەدا دەنگمان نزمتر دەبۆوە، بەڵام دیسان هەمان هەمان. ڕۆژێك لە ماڵە پوورە ماهـ بووین و بەخەیاڵی ئاسوودە دەمانخوێندەوە کە پوورە ماهـ دەنگی داین. لە یەکترمان ڕوانی. دیار بوو هەر بەڕاستی ماڵمان هەموو وەسەر یەك گێڕابوو و ئاگامان لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو. سەرمان داخست و هێورهێور* بەرەو لای چووین: وتی: چیە دەخوێننەوە؟

بۆ ساتێ بێدەنگ بووین. تووڕە دەینواند بەڵام قەستی شەڕی لەگەڵمان نەبوو. لە نیگایەوە دیار بوو. هەناسەیەکی بە ئاسوودەییمان کێشا. بێ هیچ دڵەڕاوکێیەك دەست لەناو دەست سینگمان وەپێش خست و شێعرەکەمان بۆ خوێندنەوە:

**وڵاتی ئێمە ئێران بوو، مەڵبەندی شێران و دلێران بوو.**

بزەی هاتێ و وتی: ئەوە دروست نیە، دەبێ بڵێین: وڵاتی ئێمە وڵاتی ئێران بوو، مەڵبەندی شێران و دلێران بوو.

چەند جار خوێندمانەوە، کاتێ دڵنیا بوو کە فێری بووین وتی: زۆرباشەو خەریکی کاری خۆی بوو.

مانای شێعرەکەمان زۆر بە باشی بۆ لێك نەدەدراوە و کەسیش نەبوو پێش بە خوێندنەوەمان بگرێ و بە خۆشی و دڵنیاییەوە دیسان دەستمان خستە نێو دەستی یەکترو وتمان: دیتت پوورە ماهـ چی نەوت و لە دەوری حەساردا دەستمان کرد بە ڕاکردن و خوێندنەوە. جارێك کە بە لایدا تێدەپەڕین وتی: بخوێننەوە بەڵام هات و هاوارێ مەکەن، هاوسێکان وادەزانن ئێمە کێوین.

وتم: مەگین ئەوان نامانناسن؟

دەستی بە زارییەوە گرت، بەڵام من دیم کە پێدەکەنێ ووتی: چون نامانناسن باشترە هەراو هوریا نەکەن.

حەز دەکەم بۆ جیهانی بخوێنمەوە، لەمەڕ ئەو ڕۆژانە بۆی بدوێم. بەڵام بەم مەرجە کە ئەگەر ڕۆژنامەکەی بە بەرچاوییەوە نەگرتبا. بەڵام ماناو مەبەستی بنەماڵە بۆ من و ئەو یەکجار جیاوازە. بنەماڵە بۆ ئەو لە بوونی دایك و خوشکی دا مانا دەداتەوە. باوکی ئەفسەری ژاندرمەری بووەو ساڵانێك پێش، ئەوکاتە کە ئەو تەنیا دوو ساڵی تەمەن بووە، لەکاتی بەڕێوەبردنی ئەرکێکی سەربازی دا دەکوژرێ.

خوشکەکەی دوای شووکردن، ئەوساڵە کە جیهان بۆ زەماوەندەکەی هاتبووە تاران، دەچێتە ئامریکاو ساڵی دواتریش دایکی دەباتە لای خۆی.

جیهان خزم و کەسێکی نزیکی خۆی لە ئێران دا ناناسێ و هاندەرێکیشی بۆ گەڕانەوەی بۆ ئێران نیە. لەحالێکدا شایی و خۆشی ڕاسەقینە بۆ من ئەو کاتەیە کە لای نەنە دەدری دادەنیشم. بە یادی ئەو سەردەمە کە لەژێر چارشێویدا خۆم حەشار دەدا، سەرم وەزگی گۆشتن

و گەرمەکەی دەکرد. نەنە دەدری باشترین و خۆشەویستترین مرۆڤی گۆشتنە کە دیومە. ئامادەم نیوەی تەمەنم بدەم هەتا جارێکی دیکە دەستێکی بە قژم دابێنێ و متمانەم بێ دەکرێ بە هەموو شتێ پێ بکەنی. زۆرجار لەخۆم دەپرسم لە خانم خانمێ، پاپا، دایەگەورە و نەنە دەدری، کامیانم زێدەتر خۆش دەویست.

نەنەگەورە و نەنە دەدری لەگەڵ شووەکانیان لە حەساری پشتەوە دەژیان. عەلی خان شووی نەنەگەورە بوو کە هەر لە سەرەتاوە پێمانیان وتبوو هەرکات ئەومان دی سڵاو کردن لەبیر نەکەین. عەلی خان باڵابەرز و چوارشانەبوو و وەك پاپا سمێڵێکی چڕو پڕی بوو کە شکۆیەکی تایبەتی دەدایە سەروچاوی. هەر دەمو ساتێ لەتەك پاپادا بوو و ئەگەر لەگەڵی بە رێگادا دەڕۆیی زۆر لەو کەڵەگەتتر دەینواند، بەڵام هەمیشە دوو هەنگاو دواتر رادەوێستاو تەنیا فەرمانی لەو وەردەگرت. تەنانەت خانم خانمێش عەلی خانی پێدەوت و هەرکە دەیدی سڵاو و چاك و خۆشییەکی تەواوی لەگەڵ دەکرد. ئەوان کوڕێکیان هەبوو کە ژن و منداڵی بوو، لە دێ دەژیان و بەدەگمەن دەمدی.

ئەڵڵاوێردی شووی نەنە دەدری بوو کە هەموو ئاغاوێردی بانگیان دەکرد جگە لە پاپا کە کەسی پێ ئاغا نەبوو.

ئاغاوێردی سێبەرێکی بە تەواو مانا بوو. سێبەرێك کە کەس هەستی بە هاتوچووەکەی نەدەکرد. خانم خانمێ دەیوت خوا سێبەری ئاغاوێردی لەسەر ئەم ماڵ و باخچەیە کەم نەکا.

کارو باری حەسار و باخ و باخچە بە دەست ئەو بوو. کەمتر لە ماڵێ وەدەردەکەوت، ئەگەریش چووبایە دەرێ هەر بە مەبەستی کڕینی پێداویستییەکانی باخەکە بوو. خانم خانمێ دەیوت: هەرکەس لەگەڵ ئەم دەدرییە تێکەوێ ژیانی لەمە باشتر نابێ.

نەنە دەدری پێدەکەنی.

نەنەگەورە دەیوت: خاتوون، جگە لە ئاغاوێردی، کێ لەگەڵ ئەم دەدرییە هەڵدەکا. بە قەد هەموو کەسێ قسە دەکا. ئەو پیاوە بەستەزمانە ئیتر چی بۆ وتن پێیە.

کەس دەنگی ئاغاوێردی نەدەبیست. تا ماوەیەکی زۆر پێم وابوو لاڵە. رۆستەم دەیوت: لاڵ نیە، من خۆم دیومە لەتەك نەنە دەدریدا دەئاخوێ. لەتەك مەزن ئاغاشدا هەروەتر، ئەگەر لاڵە چۆن سڵاویان لێدەکا؟

دەڵێم مرۆڤی لاڵیش کاتێ پاپا دەبینێ لەترسان زمانی دەکرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی شایەتی بۆ قسەکەم دەدا بەڵام دەڵێ: بەخوا لاڵ نیە.

ئاغاوێردی لەتەك ئێمەدا فرە دلۆڤان بوو، دەیزانی قولێنە* چکۆلەکەی ژێر دارەکە هەی کێیە و میوەی بۆ تێدەکردین و دەیوت: ئەوانە کاکە مشکە یا قالاوەکە هێناویە. ئێمە پێدەکەنین و ئەو سەرێکی با دەداو دەڕۆیی.

ئەوان کیژێکی چکۆلەیان بوو کە ڕۆژێك دەکانی کەوت و خنکا. منالەکەیان بە دیار کانییەکەوە درێژ کردبوو و دەیانشورد. هاوسێکان کۆ ببوونەوە. پێم وایە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ منالێکی خەوتوودا نەبوو. بە دروستی لە واتای مردن نەدەگەیشتم، تەنیا لە گریانەکانی نەنە دەدرییەوە هەستم پێدەکرد کە مردن شتێکی خراپە. تا ئەوەی کە یەکێك دەستمی گرت و لەوێی دوور خستمەوە.

بە دوای ئەمەدا نەنە دەدری چووە دێ و هەتا ماوەیەك سەرو سۆراخێکی نەبوو. ئاغاوێردی هاتووچۆی دەکرد. پاشانیش وتبوویان ئیدی منالّ ناخوازن یان ئەوەتا خۆیان منالّیان نەدەبوو.

## ( ٨ )

حەز دەکەم زۆر رۆژان و گەلێك حەوتووان سواری شەمەندەفەرێك بم کە هـیچ ئێزگەیـەکی دابەزینی نەبێ.

پێت وایە لەو سەردەمەی کە گشت شتێ تا هەتایی دەینواند چەند سالّی نووری تێپەڕیوە. بە بیرمدا نەدەهات کە رۆژێ لە دەست ئەم دنیا پڕ لە هەوراز و نشێوە تووشی ئەم نامتمانەیی یە هیوابڕە دێم و تلەکانم بەشی ژماردنی مردووەکانم ناکەن.

جیهان لە ئێزگەدا سێ رۆژنامەی کڕی. ئەم رۆژنامانە بێزاریان کـردووم، ئـەم رۆژنامانـە. بریتین لە چەند پاژ و هەر پاژەی نزیك بیست لاپەڕەیە. جگە لـەو رۆژنامەیـەی دەیخوێنێتـەوە دوانیشی لە پالّ خۆی ناوەتە سەر کورسییەکە. پێم وایە رۆژنامەی بۆ گشت کات و ساتەکانی سەفەر هەیە. هەر بەڕاسـتی کـەس هـەموو بابەتـەکانی رۆژنامـەکان ناخوێنێتـەوەو ئەگـەر رۆژنامەکان پڕژابانە سەر نووسینی وتارگەلی گرینگ و سەرەکی، بێشك لـەبری بیسـت هـەتا سی لاپەڕە، یەك دوو لاپەڕەیان زێدەتر نەدەبوو. تێناگەم بۆچ تا ئێستا کەسێ لەبیری ئـەوە دا نەبووە کە ئەوان لە بە فیرۆدانی ئەم گشتە لاپەڕەیە بگێڕێتەوە.

جیهان ناتوانێ ئەمە تێ بگا کـە مـن لـەبری خوێندنـەوەی رۆژنامـە، دەتـوانم بـە دیـار پەنجەرەوە دانیشم، لە دەرەوە، بڕوانم و بە بیری چیرۆکی هەورەکان دا بچمەخوار.

*لێم ڕوون نیە سەردەمی منالّیم زۆرتر لە مالّە*
*خۆمان بەسەر بردووە یا مالّە خانم خانمێ یا*
*مالّە پوورە ماهـ دا.*
*لە یەکێ لەم مالانەدا هەمیشە شوێنێك هەر*
*هەبووە کە دەمانتوانی سەرمانی لی وەسەر*
*سەرین کەین و بخەوین.*

*گەلێك دواتر بۆم دەركەوت كە نەنە دەدری*
*نیوەشەوانە یەك یەكی ماڵەكانی بەسەر*
*دەكردەوەو منداڵەكانی دەژماردن.*
*لەسەردەمی منداڵیمدا پێم وابوو خەڵك هەمووی*
*هەر ئاوا بەم شێوەیە دەژین، هەتا ئەوەی كە*
*تۆ هاتی و دایكم بیری كەوتەوە كە من كیژم...*

گیروگرفتەكان بە گشتی لێرەوە دەستی پێ كرد كە ئێمە چەشنی منداڵەكانی دیكە نەبووین، ئەگەر وەك ئەوان كایەمان كردبا و لە یەكتر زیز بووباین و ئاشتمان بووبایەوە، سەرنجی كەسی ڕانەدەكێشاو لە ڕاستیشدا دۆستایەتی ئێمە جگە لە دایكم بۆ كەس بەرچاو نەبوو. دایكم هەتا من و ڕۆستەمی بە یەكەوە دەدی بۆڵەی دەهات و دەیوت نابێ بچمە ماڵە خانم خانمێ، نابێ هێندە لەتەك ئەم كوڕە گوندییەدا كایە بكەم.

باوكم لەسەر خۆ دەیوت: ئافرەت بۆ هێندە لەشتێك دەپێچی. دوو منداڵن و لەتەك یەكدا كایە دەكەن و هیچی دیكە.

پوورە ماه دەیوت: ئەو بیانوویەت لە چیە. ئەگەر ئەمە منداڵی من بوایە دیسان ئەمەت دەوت، جیاوازیت بۆ دادەنا. ها؟

-بۆچی جیاوازی بوو.

-هەر وابزانە منداڵی منە. مەگین منداڵ لەگەڵ منداڵی جیاوازی هەیە. دوو منداڵن و لەتەك یەكدا كایە دەكەن، كام جێگەی ئەم كارە ئازارت دەدا؟

-ئاخر ئەم كوڕە گوندییە... خوا دەزانێ چی فێر دەكا.

-پوورە ماه دەیوت: كیژی تۆ چۆن شت لەو فێر دەبێ؟ بۆ بە پێچەوانەوە بیر ناكەیەوە؟

-بە پێچەوانەی؟

-كە بۆ وێنە ئەم كوڕە گوندییە نەختێ لە داب و نەریتی شاری لە كیژەكەی تۆ فێر بێ؟

دایكم سەرێكی بەبێ تاقەتییەوە با دەداو دەیوت: خوشكێ ئیدی حەوسەلەی چەقەچەقم نیە. هەرچی بڵێم قسەیەكی دیكەم دە دەستی دەنێی. ڕاستییەكەی، حەزم لێی نیە ئیدی، هەر شتەی ڕەسمی خۆی هەیە.

هەتا دەیدی گوێیەكم لە لای ئەوانە ئاماژەیەكی دەكرد و بێدەنگ دەبوو.

*كاتێ بە چوار سووچی حەساردا ڕامان دەكرد.*

*یا لە کڕینی ئەو شتەی بەتۆیان ئەسپاردبوو*
*بە ڕاکردن دەگەڕاینەوەو بە زمانی تینوو*
*هەڕامان دەکردە سەر بەلوعەی ئاوێ، هەر کە*
*شێرەت دەکردەوەو ئاماژەی منت دەکرد*
*لەپێشدا ئاو بخۆمەوەو دەموت: نا لەپێشدا*
*ئەتۆ، سەرێکت با دەدا و لە قەراخێك*
*دەوێستای.*
*حەزم دەکرد دایکم لەوێ بووایە و دیبای ...*
دەموت: ئەمجارە ئیتر لەپێشدا نۆرەی تۆیە.
-نا.
-بۆچی؟
-ئاخر دەبێ لەپێشدا چکۆلە ئاو بخواتەوە دەنا دەچیتە جەحەننەمێ.
-مەگین تۆ لەمن گەورەتری؟
-ئەدی.
-بەچی دەزانی؟
-چونکە هەمێشە کوڕەکان لە کیژەکان گەورەترن.
قسەیەکی دروست و بەجێ بوو کە سەلماندنەکەی بۆ ئێمە وەك ئاوخواردنەوە وابوو. پاشان دادەنیشتین و بیرەکانمان بە گشتی دەکردە یەك کە ئەگەر وایە، کەوابوو ئەو لە خانم خانمێ و نەنە دەدریش گەورەترە.
ئەویش سەری با دەداو هەوڵی دەدا پێنەکەنێ و دەیوت: بەڵام ئەگەر لەسەر ئاو خواردنەوەبێ، ئەوان ئیزنمان نادەن ئێمە لەپێشدا ئاو بخۆینەوە.
-ئاخر ئەتۆ لەوان گەورەتری ئیدی، وەنیە؟
-بەتایبەتی لە نەنەگەورە.
پێدەکەنین.
*ئەودەم دەستی منت دەگرت یا دەستت دەنایە*
*سەرشانم، حەزم دەکرد دایکم بمانی دیبا. بەڵام*
*جارێکیان کە بینی وتی: ئیدی هەقت نیە بچیە*

*ماڵەخانم خانمێ و ئیتر نەبینمەوە لەتەك ئەم*

*کوڕەدا کایە دەکەی...*

دایکم دەنگی لێ هەڵێنابوو و دەیوت ئەگەر تەنانەت ئەم کوڕە گوندییەم بەڕێ کردبێتەوە گوندی، هێشتا ناهێڵم جارێکی دیکە چاوتان بە یەکتر بکەوێ. بۆ کیژێکی منداڵ دروست نیە لەگەڵ کوڕێکی منالی، ئەویش...

*ئەو تێنەدەگەیی تۆ منالێکی بەهەشتی بووی کە*

*لە بەهەشتەوە بۆم بە ڕێ کرابووی...*

ئەوجار بە باوکی وت دەبێ ئەو بەڕێ بکاتەوە گوندی، باوکم وتی: ئافرەت ، بە مـن چـی، مەگین ئەمن هێناومە کە بینێرمەوە، باوکیشت خۆ ناکرێ قسە لەسەر قسەیدا بکەی.

-نابێ، ئەم قسانەم بە گوێدا ناچێ.

-دەنا ئەگەر دەکرێ خۆت ڕەوانەی بکەوە.

دایکم گوڕاندییە سەرم کە هەقم نیە لاقم لە ماڵە خانم خانمێ بنێم، هـەقم نیـە لـە ماڵـێ وەدەرکەوم و حاڵیم دەکا ئەم کوڕە گوندییە خۆی لە کوێ دەبینێتەوە.

*بەیانی هەموو ڕۆژێ کە لە خەو ڕادەبووم*

*دەترسام ڕۆیشتبییەوە...*

دایکم لە ئاکامـدا بـاوکمی ناچـار کـرد ڕۆسـتەم ڕەوانـەی گونـدی بکاتـەوەو ئەمنیشـی حەوتوویێك لە ماڵەوە بەند کرد. پوورە ماه بە دایکمی وت: سەرچاوەی هەمووی ئەم کارانە لە بینینی ئەم فیلمە ئێرانییانەوەیە. فیلم گەلێکی کە فێری شتی پڕ و پووچیان دەکـەن. ئـەگینا دۆستایەتی دوو منـاڵی پاك و پاقژ نازانم چی لە ئێوە کردووە. وازیان لێ بێنەو ئەها.

*دایکم حەزی بەمە دەکرد پەندو ئامۆژگاریم*

*پێ بدا، پەندو ئامۆژگاری لەمەڕ ئەمەوە کە*

*تۆ دەستت نابووە سەر شانم کە ئەگەر لە*

*جۆگە پەڕیمەوە نەکەوم. ئەگەر لە شەقام*

*دەپـەڕمـەوە وەبن مـاشێن نـەکـەوم.*

*تێنەدەگەیشتم کە چۆن بوو بۆ من خۆشحاڵ*

*نەبوو...*

ڕۆژی دوای چوونەوەی تاوم گرت و قورگم وەژان کەوت. نەنـە دەدری دەیـوت: لـە خـەم و خەفەتەوەیە. باوکم حەبی دژە ئێشی پێدام. پوورە ماه هاتە ماڵمان و پـێم وت: ئـەمن دەبـێ هەموو ڕۆژێ چاوم بە ڕۆستەم بکەوێ. ئەگەر ڕۆژێك نەیبینم شەو دێتە خەونم. ئەودەم ڕادەبم و دەگریم حەز ناکەم بگریم، بەڵام گریان و نەگریان بەخۆم نیە.

پوورە ماه منی بردە ماڵە خۆیان و بەڵێنی پێدام هەر ئەوڕۆ و سبەی ڕۆستەم دەگەڕێتەوە. بە دایکیشمی وت ئیدی هێندە ناشارستانییانە نەجووڵێتەوە و وازمان لێ بێنێ.

*حەز دەکەم زۆربەی ڕۆژان و ساڵان بە دیار*
*پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە دانیشم و بیر لە تۆ*
*بکەمەوە کە دەکرا ئەڵێرە لەهەمبەر من دانیشی،*
*دەشیای لە یەکێ لە شەمەندەفەرەکاندا بی و*
*گەڵێك سەفەر بکەی. ئیش و کاری*
*دڵخوازی خۆتت ببێ، تەنیا ئەگەر ناوت ڕۆستەم*
*نەبووبایە...*

نا، تاوانەکە هی ئەو نەبوو کە ناوی ڕۆستەمی لێ نرابوو و ماوەیەکی دوورو درێژ هـەموو پێی پێکەنیبوون. خۆی دەیوت: ئەمن زۆرتر شبی خاڵخاڵۆکـە دەدەم هـەتا ڕۆسـتەم. ئـەویش ڕۆستەمی دەستان.

*کایەی ناو ناوێن بۆ من و تۆ لەبڕان نەهاتووبوو.*
*هەروەك ئەمە کە یەکەم هـەڵتەقێنـی* من*
*نەبوونی ناو بوو. یەکەم هەڵتەقێنی تۆش بوونی*
*ئەو بوو...*

پاپا کە پێی وابوو سەرپەرشت و دەسەڵاتداری گشت مرۆڤانی دنیایە، هەر کـە منـاڵێکی کزەلۆکە و داڵگۆشت لە باوەشی **محەممە**دا دەبینێ، دەڵێ: **محەممە**د، چ ڕۆستەمێك.

**محەممە**د سەری دادەخاو مناڵەکە بەخۆیەوە دەگوشێ، پاپا دەڵێ: **محەممە**د ئەمە ڕۆستەمە یـا کوڕی ڕۆستەمە. و ناوی ڕۆستەم بەسەر مناڵەکەدا دەبڕێ.

**محەممە**د کە لەسەر بڕیـاری پاپـا، دەسـتی کـوڕە داڵگۆشـت و ڕەشـتاڵەکەی دەگـرێ و بـۆ وەرگرتنی ناسنامەی خۆی و کوڕەکەی دەچێ؛ فەرمانبەری بەشی تۆمارکردنی ناوەکـان لێـی دەپرسێ: کوڕەکەت ناوی چیە؟

دەڵێ: ڕۆستەم.

فەرمانبەری تۆمارکردن پێدەکەنێ و دەڵێ: چۆنە ناوی بنەماڵەیەکی دەستان دانێین.

لەنێو پێکەنین و گاڵتەی بەڕێوەبەرانی دایرەی تۆمارکردنی ناوەکاندا، ناسنامەی پێ دەدەن.

ساڵەکان بە شوێن یەکدا تێدەپەڕن و لەو ماوەیەدا هەر کەسێ دەگاتە کوڕە، مشتێکی بە قەوەت دەخەوێنێتە قەبرغەی و بە پێکەنینەوە دەڵێ: چ ڕۆستەمێك، چ ڕۆستەمی دەستانێك، کوڕە لەم کارە سەری سوڕ دەمێنێ. بەڵام هیچکات حەزی لە گۆڕینی ناوەکەی نەبوو.

دەڵێ: ناو، هەر ناوە، چ قەیدییە.

سەهووی دەکرد، هەمیشە پێم وابوو لە سەهوو دایە. ئێستا لەخۆم دەپرسم ئەمن بەم گشتە ناوەوە چیم کردووە؟

لە جیهان دەڕوانم. ڕۆژنامەکەی جۆرێ لێك واڵا کردووە کە بۆم ناکرێ دەم و چاوی ببینم. بە بیانووی دەست بە ئاوگەیاندن ڕادەبم. چەند سانا دەتوانم خۆ لەو دەموچاوەی کە لە ژێر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەدا حەشار دراوە دوور خەمەوە. لە داڵانەکەدا بە هۆی جموجۆڵی شەمەندەفەرەوە تێدەگەم خەریکە لە ئیزگەیەك نزیك دەکەوینەوە. لەپڕ لێدەبڕێم لە ئێزگە دابەزم و هەر بە پێیان بەو شوێنەدا بگەڕێمەوە کە پێیدا هاتووم. لەبەر دەرگەی دەرەوە دەوێستم. شەمەندەفەر ڕادەوەستێ، دەرگە دەکەمەوەو دادەبەزم. بەبەر ئەو پەنجەرەیەدا تێدەپەڕم کە بە درێژایی سەفەرەکەماندا بەرەو ڕووی جیهان دانیشتبووم. جیهان لە دەرەوە دەڕوانێ. لەو بەرەوە چاوی بە من دەکەوێ، دادەچڵەکێ، بە سەرسوڕماوی و دڵەراوکێوە ئاوڕێك لە کورسییەکەم دەداتەوە. بەبەر پەنجەرەدا تێپەڕیوم.

فەرمانبەری شەمەندەفەرەکە لەبەر دەرگەی واگۆن وێستاوە. لە دەوروبەرم دەڕوانم. فەرمانبەرەکە ئاگای لێمە و دەڵێی چاوەنواڕمە. بێ هزر و بیر چاوی لێدەکەم. هەزار ساڵ تێدەپەڕێ. هەزار ساڵە هەرتك چاوەنواڕی یەکترین. هێور هێور لێی نزیك دەکەومەوە. بە دەست فەرمووم لێدەکا. بە ئاماژەی سەرسپاسی دەکەم. وەختە بگریم. قۆڵم دەگرێ، بزەی لەسەر لێوە، دەرگە بە دوامدا دادەخا. ئاوڕ دەدەمەوەو لێی ورد دەبمەوە. فیقەنە بە لێوییەوەیە. چاوێك دەترووکێنێ و دیسان بزەی دێتێ. شەمەندەفەر نەرم نەرمە ڕادەخوشێ، بە پێش یەکتردا تێدەپەڕین.

به داڵانەکەدا دەڕۆم، لە یەك یەکی مسافیرەکان ورد دەبمەوە. دەگەمە کورسیەکەی خۆم و لەسەرخۆ دادەنیشم. جیهان کە چاوی پێم دەکەوێ ئاخێزێك دەکا، گەرەکیە شتێ بڵێ، بەڵام دەنگ ناکا. جموجۆڵێك دەکاو لە دەرەوە دەڕوانێ. شەمەندەفەر لە ئێزگە دوور دەکەوێتەوە. ڕۆژنامەکان قەد دەکاتەوەو دەڵێ: ئەهـ! هەتا کەی هەر ڕۆژنامە، سەرم ماسا.

ڕۆژنامەکان وەلادەنێ. تلم بە لێواری پەنجەرەی تەمگرتوودا دەخشێنم. دەڵێ لە کوێ بووی؟

وەڵامی نادەمەوە. با وابزانێ بە خەیاڵ منی لەوبەر پەنجەرەوە دیوە. چ جیاوازییەکی هەیە چ شتێ لێکمان جیا کاتەوە، ڕۆژنامە یا پەنجەرە، جیاوازییەکەی لە کوێدایە. ئێمەش هەر دەڵێی وەك ئەو منالانەی مەزن دەبن و ماڵە باوانیان بەجێ دەهێڵن، سەردەمی بە یەکەوەبوونمان بەسەر چووە.

دەستێك بە قژی دادێنێ و دەڵێ: ئا، کارێکی چاکت کرد لەتەك منا هاتی.

بزەم دێتی. دیسان دەڵێ: ئا، کارێکی چاکت کرد لەتەك منا هاتی.

چاوێکی لێدەکەم بەڵکوو چاوەکانی شین بووبن. ئاواتەخوازی ئەمەم کە بریا چاوەکانی دەبوونە شین.

# (٩)

بەرقلیانەکەم* لە بەیانییەکی هەوراوی و تاریك و لـە تەنیاییـدا ئامـادە دەکـەم. یەکـەم رۆژی دەست لەکار کێشانەوەم لەو کۆمپانیای دەرمانسازییە بوو کە گەلێك سالْ خزمەتم تێیدا کردبوو. ئەگەر بۆم نەدەلوا دەست لە ژیانێك هەلْگرم کە نزیك بە سی سالْێك دەبوو لەم بەشەی دنیٚ* دا دروستم کردبوو، لانیکەم دەشیام دەست لەو کارە بکێشمەوە کـە دلْـم هـیچ پێیـەوە نەبوو.

*پێم وابوو بە دامەزران لە کۆمپانیایەکی دەرمانسازی*

دەتوانم بە ئاواتەکانم بگەم...

بە گومانم کارکردن لەکۆمپانیایەکی دەرمانسازی یانی سـەرەدەریٚ دەرکـردن لـە ڕەمـز و ڕازی فۆرمۆلْە دەرمانییەکان. گومانی ئەمە کە دەتوانم بخزێمە بەشی لێکۆلْینەوەو پەیجوویی و بۆ دروستکردنی دەرمانگەلێکی بیٚ بۆن خەریکی توێژینەوە بم، گومانێکی بیٚ هۆو و دوور لـە ڕاسەقینە بوو. تەنانەت ئەگەر پلەی دوکتۆریشم بووایە نەمدەتوانی ڕەخنە بکەمـە نێـو تـۆڕە نهێنی و تایبەتی کومپانیا دەرمانسازییەکانەوە.

تۆڕێکی یەکلایەنە کە تەنیا قازانجی ئەو کەسانەی مەبەست بوو کە تێیدا بەشیان هـەبوو، ئەگەر زیانێکیان وێکەوتبا، یەکەم قوربانی کاربەدەستەکانیان بوون کە وەدەرنانیـان بـە پێـی ڕێککەوتنامەکان بە قازانجی کۆمپانیاکە تەواو دەبوو. هیچ کـام لـە ئێمـە بەهـەر پلەیـەکی خوێندەواری و پێشینەی کارەوە لە هەمبەر ڕووداو و کارەساتە پێشـبینی نەکراوەکانـدا بیمـە نەکرابووین. ئەم کۆمپانیا گەلە دەیـانتوانی بـە هـۆی ژیـان وێککـەوتنی مالْییـەوە سـەدان کاربەدەست لەکار بێکار بهێلْنەوەو هەر لەو کاتەشدا قازانجێکی ئێجگار زۆر بدەن بەو کەسانە کەتیایاندا خاوەن بەشن...

*لە ئاوا شوێنێك دا ئیشم دەکردو بیرم*

*لەتۆ دەکردەوە کە چۆن بە هۆی بۆنی*
*دەرمانەکانەوە دڵت دەخێڵەوە دێ و ئەوەی*
*من دەیکەم بێ ئەوە یارمەتییەکی چکۆلەی*
*بە تۆ کردبێ گیرفانی هێندێك تەژی دەکا کە*
*هەر ئێستاکەش لێورێژی پارەیە...*

هەموو ڕۆژێ کە دەچمە سەرکار ناتوانم ئەم بیرە لە مێشکم دوور خەمەوە کە کارکردن بۆ ئەم کۆمپانیاگەلە غەدرە. جیهان دەڵێ: کار لە هەموو شوێنێ هەر بەم پێیەیە. لەم گێرە شێوێنییەدا ئێمە مۆرەگەلی بچکۆلەین کە توانای بەربەرەکانیمان نیە. ئەوانە لە دەوڵەتان بەهێزترن. تەنانەت ئەوانەی خاوەن کارێکن بۆ رۆژێکیش دڵنیانین کارەکەیان هەتا سەر بە دەستەوە بمێنێ و لە هەلومەرجی تۆدا...

دەڵێم: هەلومەرجی من؟

دەستەکانی بە یەکەوە هەڵدەگلۆفێ و لێم ورد دەبێتەوەو بزەی دێتێ.

دەڵێم: مەبەستت هەلومەرجی تەمەنە یا بیانی بوونمە؟

-تۆ ئیتر بیانی نێت.

ناکرێ ببوورێم. دەکەومە بیر پاپاوە، و لەم بیرئانینە وەڕەزم.

هەر بەم شێوە لێم دەڕوانێ و ئەو بزەی لەسەر لێوە کە ناکرێ لێی ببوی. رستەیەکی کە بێ تێ بینی و سەرنجەوە دەری دەبڕێ، هەر ئەو شتەیە کە خۆم بیرم لێکردۆتەوەو بیستنی لە زمان ئەوەوە تاڵترە. حەزم دەکرد ئەم بڕوایەی بۆ منیش لەبەر چاو بێ. رەنگبێ ئەوکاتە غەیانەتیم پێ دەکا لەتەك ئەوانەوە بێ کە لە من گەنجترن.

بۆمی نووسیبوو: خاتوون دوکتۆر، جێی خۆی بوو هاتبای دەستێکت بە دەرمانخانەکەی ئێمەدا هێنابا.

نووسیم: پیاوەتی بە ئاوی حەمام دەکەی. باوکم دەرمانخانەکەی بەم دنیایە ناگۆڕێتەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەمن دوکتۆر نیم.

لە وەڵامدا وتی: باوکت ئیتر کارێکی ئەوتۆی بە دەرمانخانە نیە، زۆربەی کارەکان دوکتۆر پترۆسیان دەیانکا. باوکت سەرپەرشتە و هەموو ڕۆژێ لەو هۆدەی پشتەوە هەر لەتەك دۆستانیەتی. پێویست ناکا ئەتۆش بەم ڕادەخۆبە کەمزان بی. لێرە هێندێ بە منیش دەڵێن ئاغای دوکتۆر، ئەو غەریبانەی کە بۆ کڕینی داو و دەرمان دێن، و ئەو مرۆڤە ساویلکانەی کە

گومان دەکەن هەر کەس لە دەرمانخانە کاری کرد دوکتۆرە. ئەمنیش وەڕووی خۆمی ناهێنم. کارەکانیان ڕێك دەخەم و چۆنایەتی خواردنی دەرمانەکانیان هێندە بۆ دووپات دەکەمەوە هەتا زۆر باشی لێ تێبگەن. ئەم جارە ئەگەر دیسان ڕێگەیان دەولایانە کەوتەوە نوسخەکانیان هەر دەدەن بە من. دوکتۆر پتروسیان گەلێ جار چاوێك دادەگرێ و دەڵێ ئاغای دوکتۆر، یەکێ لە مشتەری یەکانت هاتووە، برۆ.

نامەکەی دەخوێنمەوەو لە خۆشییان هاوار دەکەم: رۆستەم...

پاشان هەتا چەند رۆژ هەست بە هێمنایەتی لە کارەکەمدا دەکەم. شەوانە راحەت دەخەوم و کەمتر بیر لەو دێوەزمە مەزنەی بێ عەداڵەتی دەکەمەوە کە بەسەرماندا زاڵ بوو.

سەرلەبەیانی رۆژێك ڕادەبم و هەست دەکەم بە بۆنی دەرمانگەلێکی کە ئیتر بۆنیان پێوە نیەو بۆنەکەیان لە دەرمانگەلی دیکەوە گرتووەو ئەوانیش بۆ مرۆظ زەرەرو زیانیان هەیە دڵم لەخۆ دەبێتەوە، ئەوددەمە دەست لە کار کێشانەوەکەم بە نووسراوە رادەگەیەنم کە ئیتر لەمەودوا لە هیچ کام لە کومپانیا دەرمانسازییەکاندا ئیش ناکەم. ئێستا بۆم روون بۆتەوە چۆن دەکرێ مرۆظ دڵی بە هۆی شتێکەوە لەخۆ ببێتەوەو کەسیش باوەڕی بەوە نەبێ.

*تۆ دەتوت: دەرمانەکانی ئێستا بۆنێکیان نیە.*
*دەرمانخانەکانی ئێرەش ئیدی بۆنیان پێوە نیە.*
*ئەوان قەت بۆنی دەرمانخانەکەی باوکمیان*
*نەبووەو نایانبێ، هیچ دەرمانخانەیەك بۆنی*
*دەرمانخانەی باوکمی نابێ...*

سەعاتێك خەریکی بەرچاییەکەم دەبم. بەرچایی لە ماڵی ئێمەدا ڕێورەسمێکی بەڕێوجێی بوو کە چووکترین وێچوونێکی لەگەڵ ئەم بەرچاییدا نیە، هەرکە لەخەو ڕادەبووم سەماوەر قوڵتەی دەهات و نانی تازە و پەنیر لەسەر مێز بوو. یەکێ لە منداڵەکان چایەکەی خواردبۆوەو خەریك بوو دەڕۆیی، ئەویتر بابۆڵە بە دەستەوە سەری بەسەر کتێبەکەیدا گرتبوو. بۆڵەی دایکم دەستی پێدەکرد کە دەرسی شەوی پێشتر دەخوێنن. ئەویتر هێشتا لەخەو ڕانەبووە، دایکم دەیگوڕاند: ئەدی قوتابخانەت نیە؟ دەستی لێك دەسووت و لە باوکم ورد دەبۆوە کە لەسەرخۆ چایەکەی فڕ دەکرد. لەژێر لێویەوە دەیوت: بە قسەی خەڵکی ناکەن، ئەتۆش خۆ دەنگت لێوەنایە. رادیۆ کە دایسا، بەلایدا رۆیشتبا دەنگی نزم دەکردەوە. تەلەفۆن زەنگی لێدەدا، دایکم کە زۆر بە قاسیدی لە باوکمی دەڕوانی دەیوت: ئاغای دوکتۆر وادیارە کاریان بەتۆیە،

سەرێکی با دەدا و وەدەردەکەوت. باوکم باوکم تەلەفۆنەکەی هەڵدەگرت. هەر لەوکاتەدا یەکێ لە منالەکان دەنگی دەدایە ڕادیۆ، باوکم بە دەستی تێی دەگەیاندین. خوشکم نزمی دەکردەوەو دەیوت مەگین کوێری نابینی باوکم بە تەلەفۆن دەئاخوێ؟

کوێرم و چ لەوە باشتر کە ناتوانم تۆ ببینم.

گەلێ ڕۆژان لەبەر ترسی قوتابخانەو دڵەخورپێی درەنگ گەیشتنە قوتابخانە، بەرچاییم هێشتا بە تەواوی نەخواردبوو بالاّ پۆشی قوتابخانەم لەبەر دەکردو کتێبەکانم دەنایە ژێر هەنگڵم و بەرلەوە دەرگەکە لە پشت سەرمەوە داخەم، هاوارم دەکرد: ئەمن ڕۆیشتم، ماڵ ئاوا. و نیوەی ڕێگەم بە پێیان دەگرتە بەر.

نیوەڕۆیان بە گومانی چێشتێکی کە بڕیار بوو بۆ فراوین هەمانبێ دەهاتینەوە ماڵێ. لەکاتی خواردنی بەرچاییدا هەمیشە یەکێك بوو پرکێشی دەکرد بزانێ بۆ فراوێن چیمان هەیە، دایکم بە بێ وازی دەیوت: جارێ چایەکەتان بخۆنەوە. بۆ نیوەڕۆ زۆری ماوە...

پاشان تێ دەماو دەیوت: نازانم چ لێنێم؟ ئەوەش خۆی گرفتێکە. مرۆظ بەیانی هەموو ڕۆژێ دەمێنێتەوە کە چ لێ بنێ.

هەرکام لە ئێمە بە جۆش و خرۆشەوە شتێکمان پێشنیار دەکرد و ئەوەشمان دەوت کە ئاووگۆشت لێنەنێ. برا گەورەکەم دەیوت: ئەگەر ئاووگۆشت لێنێی دەچمە ماڵە خانم خانمێ یا پوورە پەری. دەمانوت ئێمەش ئەم کارە دەکەین.

دایکم پێدەکەنی و دەیوت: لە کوێ دەزانن ئەوانیش ئاوگوشتیان نەبێ.

دەموت: ئاوگۆشتی پوورە پەری لە هی ئێمە بە تام و چێژترە.

باوکم دەیوت: «گوێلکی خۆماڵی بە گا ناشێ».

پێشنیارەکانی ئێمە کەمتر واهەبوو بە دڵی دایکم بن. زۆر کەم وەبیرم دێ چێشتێکی ئێمە خوازیاری بووبین لێی نابێ. دەیوت: بلا بۆ جارێکی دیکە بێ. ئێستا فلانە شتەمان نیە، فیسارە شتەمان نیە. پاشان بۆ ئەوەی لەکۆڵ خۆیمان بکاتەوە دەیوت: باشە دەی فکرێکی لێ دەکەینەوە.

ئەگەر ڕۆژێك بەڵێنی داباو بۆ نیوەڕۆ بەجێی نەگەیاندبا، هەموو وەبۆڵە بۆڵ دەکەوتین. لەو سەردەمدا نەمدەزانی هەق بەوە. ئێستاکە تێدەگەم لە هەلومەرجی ئەو دەمی ئەودا نیم. منالێکی زۆرم نیە کە هەر کامێکیان داوایەکیان بێ. کیژێکم هەیە، تەنیا کیژێك بە ناوی ستارە.

پاشە بەرەی پوورە پەری کیژ بوو. هەر یەکەی پێشنیارێکی لە بابەت ناوییەوە دەدا. ئەمنیش وتم: ناوی بنێن ستارە.

هەموو لایان لەمن کردەوە.

پوورە پەری وتی: حەی، چی دیکە؟

دایکم وتی: ستارە، ئەدی چی دیکە؟ ئەم ناوەت لە کوێ هێناوە؟ دایکم لە هەموو شتێ بە شکە، هیچیشی پێ هەو نیە مەگین ئەوەی شتەکە تەواو بە سەلیقەی خۆی بێ.

خانم خانمێ و باوە گەورە هەرتك لە یەکتر ڕامان و پاشان لەمن. روومەتم سوور هەلگەڕابوو، خانم خانمێ پێکەنی و وتی: باشە، منالەکەم خۆشی لەم ناوە دێ، خۆ ناخۆشیش نیە.

پاپا وتی: پەری خاتوون ئەگەر کیژەکەت ستارە ناو بنەی دەبێ گەرەنتیشی بکەی وەك ئەوانەی ستارەیان ناوە، کەشخەو لەبار بێ. چاوێکی لە خانم خانمێ داگرت.

پوورە پەری بە لووت گرژییەوە وتی: ئەم قسانە چن.

دایکم سینگی وەپێش خست: ماشەڵڵا، نە بکەی نە بخۆی هەر چاوی لێ بکەی. شوکر گەرەنتی ناوێ. پاپا وتی: ئەگەر پوور پێی هەڵانەڵێ کێ بیلێ.

پوورە پەری وتی: جارێ دەرفەتمان زۆرەو لەکاتی خۆیدا ناوێکی باش و کەشخەی بۆ دەدۆزینەوە.

هەر نەمزانی چۆن لە هۆدە دەرکەوتم و هەتا نیوەشەویش خۆم پێشان نەدان و پوورە پەریش ناوێکی دیکەی بۆ کیژەکە هەلبژارد.

پاپا هەمیشە بۆ سەردانی موڵك و ماڵەکەی سەری دیێ دەدا. زۆر جار چەند حەوتوویێکی پێ دەچوو. بەلام گەڕانەوەکەی بە خانم خانمێ ڕادەگەیاند. ئەویش ئەگەر لە ماڵە خزمێك یا تەنانەت ماڵە یەکێ لە خوشکەکانی بانگێشتن کرابا دەیوت: ناتوانم. ئیمڕو حیسام دێتەوە. کاتێ دەگاتەوە ماڵ شەکەتە و ئەمنیش دەبێ لە ماڵەوە بم.

پوورە پەری هەمیشە پێدەکەنی و دەیوت: ئەتۆش شووەکەت زۆر نازا پەروەردەکردووە.

خانم خانمێ سەرێکی با دەدا، بەلام لە رۆژی هاتنەوەی باوکمدا لە ماڵ دەرنەدەکەوت.

رۆژێکی پێنج شەممە، هەر لە قوتابخانە ڕا یەکڕاست چوومە لای خانم خانمێ، زستان بوو و ئەوان کورسییان دانابوو و ئەمن ئاشقی کورسیلەکەیان بووم. دایکم چەند ساڵێك بوو کورسی خڕ کردبۆوە و شتومەکەکەشی تووڕ دابوو.

کورسی بیانوو بوو. هەر لەو کاتەوە کە ڕۆستەم هاتبووە ماڵی خـانم خانمـێ، ڕێگایەکـەی منیش بەرەو ماڵی ئەوانەوە لار ببۆوە. ئەمن باسی قوتابخانەو منداڵـەکان و وانـەکانم دەکـرد، ڕۆستەمیش لەمەڕ ئەو کارانەی کە ڕۆژانە کردبوونی و ئەو وانانەی کە شەوانە دەیخوێندن بـۆم دەدوا.

هـەموو ڕۆژێ دەفتەرچـەکانمان بـە یەکـەوە هەڵدەسـەنگاند، ئەنـدازەمان دەگـرتن، هـێڵ کێشیمان دەکردن و وانەکانمان لە یەکتر دەپرسییەوە.

پوورە ماهیش بە پێچەوانەی ویستی پاپا ئەوی لە پۆلەکانی شەوانەدا ناو نووسی کردبوو.

خانم خانمێ وتبووی: ئێستا ئەم منداڵە گوندییە قوتابخانەی بۆچیە؟ ئەمانە دەرسخوێن نـین. گیروگرفت بۆ خۆت زیاد مەکە. چووزانی غولام خان رازی دەبێ یا نا؟

-چیم بە غولام داوە، خۆم تێچووەکەی دەدەم. سەرەڕای ئەوەش غـولام کـاری بـەم شـتانە نەداوە.

کەس نانخۆری زیادی ناخوازێ. هەر ئەوەی کە لەو چارەڕەشییە ڕزگاری بووە بەسیەتی.

-بەسی نیە، هەموو شتێکی مرۆڤ خۆ هەر زگ نیە.

پاپا لەو سەری هۆدەڕا بە چەشنێك کە هەر خانم خانمێ ببیسێ وتبووی مرۆڤ تـەنیا زگ و ژێر زگە.

خانم خانمێ نەختێ سەری وەرسـووڕاند بـوو و بـە مەبەسـتی بێـدەنگکردنی ئـەو دەسـتی ڕاوەشاندبوو.

پوورێ لەسەر قسەی خۆی سوور بوو و شەوانە ڕۆستەمی دەناردە قوتابخانە و ئاگای لە وانە خوێندنەکانی بوو.

خانم خانمێ دوای فراوێن وتی ئەگـەر دەرس و دەورم نیـە لـەژێر کورسـی بخـەوم و دەنگـە دەنگێ نەکەم، ڕۆستەمیشی ناردە شوین کارێك. دەفتـەرو کتێبەکـەم بەسـەر کورسـیدا بـڵاو کردەوە. خانم خانمێ لە پێچـکی لای سـەرەوەی کورسـی خـەوتبوو. دەنگـی هەناسـە ڕێـك و هێمنەکەی ئەو بێدەنگی دوانیوەڕۆخەویان دەچاوم خزاند. ویستم ڕابم کە ئاماژەی کـرد بخـەوم. نەنەگەورە دەرگەی کردەوە. باوە گەورە بوو. خانم خانمێ بە بیستنی دەنگی ئەو لەپڕ لەجێگەی ڕابوو. چارشێوەکەی ڕێکوپێك کرد. داوێنەکەی لەخۆی شـەتەك داو بـەرەو دەرگـەی هۆدەکـە چوو. پاپا لاقی دە ژوورێ نا. نەختێ گۆشەی هەڵێنا. دیـم شـانەکانی خـانم خـانمێی گـرت و

کێشایە لای خۆی و دەستی خستە ژێر چارشێوەکەی، خانم خانمێ سەبرێکی وتی: زوو هاتیەوە، بۆ خەبەرت نەکردینەوە؟

پاپا سەری بردەپێش و ماچی کرد و وتی: وازم بەسەرچووبوو، حەزم لێ بوو بگەڕێمەوە لای ستارەکەی خۆم.

خانم خانمێ دەستی نایە سەر شانی ئەو، پێکەنی و هێمای کردە ئەو لای کورسییەی من لێی خەوتبووم و لەژێر لێویەوە شتێکی وت. زوو چاوەکانم لێك نا. پاپا پێکەنی و وتی: هەمیشە کلکێکت هەر هەیە، و بە یەکەوە چوونە هۆدەکەی ئەو.

پشووم سوار ببوو، یەکەم جار بوو کە دەمدی مەزنەکان یەکتر ڕادەمووسن. ناوی ستارە لەمێشکمدا دووپات دەبۆوە. حەزم دەکرد ڕا ببام و لەوێ ڕۆیشتبام. بەڵام ورەی ئەوەم نەبوو لە جێگەکەم ببزووم و دواتریش لەخەو ڕاچووم. بە هۆی دەنگی قوڵتە قوڵتی سەماوەرو قسەکانی نێو هۆدەوە لە خەو ڕابووم، نەنە دەدری خرتوپرتی تایبەتی چای هێنا، خانم خانمێ لەپاڵ سەماوەر دانیشتبوو. ڕابووم، کتێبەکانمیان کۆ کردبۆوە. خستمنە نێو جانتاکەمەوەو بۆ نان و چای بەرشێو لەوێ نەمامەوەو هاتمەوە.

*تەنانەت بۆم نەدەکرا باسی ئەم ڕازە لای تۆش*
*بدرکێنم. دەمزانی ئەگەر پاپا پێت بزانێ*
*دەتکوژێ...*

چوونە حەمام لەتەك خانم خانمێدا ئاواتێك بوو زۆر کەم وەدی دەهات. خەڵاتێك و بەراتێك بوو کە ئێمەی مناڵ کەمتر قسەمتان تێی دەکەوت. ئەو یەکەم کەسێ بوو کە سەری بە شامپۆ دەشوت. شامپۆ تازە هاتبووە بازاڕ و ئەگەر لەتەك ئەودا بووباین ئیزنی دەدا سەرمانی دەستێك پێ بشۆین. شامپۆکەشی وەدەست خۆمان نەدەدا، ڕایدەسپاردە نەنە دەدری کەمێکمان لەسەر سەری ڕۆبکاو دەیوت: باشە ئێستا بۆخۆت چنگی پێدا بگرە بزانە چۆن کەفێ دەکا.

بە بۆیەکەی لە هۆش دەچووم. ئێستاش هەر لام وایە ئەو یەکەم شامپۆیانە بۆنخۆشترین شامپۆ بوون. خانم خانمێ لەشیشی هەر بەو سابوونە عەتراوییانەی کە پاپا بۆی دەکڕی لیفکە لێدەدا. ئەگەر لەتەك ئەودا بام لیفکەکەیم وەردەگرت و خۆم پێ دەشوت. ئەو پێی خۆش نەبوو کەسی لەتەکدا بێ، تەنانەت دایکم یا پوورە پەریش. هێندێ جار ناهید کە نەوەی یەکەم و سەردڵکی بوو، لەتەك ئەودا دەچوو. ئەمن کەمتر دەچووم.

ئەگەر ئـەم بەختـەم بـە نسـیب بووایـە لـە نەنـە دەدریـم دەزانـی. نەنـە دەدری بـەیانی کەرەستەکانی حەمامی دەبرد هەتا هاوسەری وەستا بزانێ کە خانمی مەزن چ سەعاتێ دەچێتە ئەوێ. ئەودەم خانم خانمێ بە کاوەخۆ لەتەك نەنە گەورەدا بەرەو حەمام وەڕێدەکەوت. دوای ئەو نەنە گەورە دەگەڕایەوە و نەنە دەدری دەچوو خۆی بشواو لەتەك ئەودا بگەڕێتەوە. هەرکە ئەوم دەدی لەبەری دەپاڕامەوە منیش لەتەك خۆیدا ببا. سەری بـا دەداو نۆچـێکی دەکـردو پاشـان دەستمی دەگرت و دەیوت: هەڵێ، بڕۆ با بچین.

لەژێر لێوییەوە دەیوت: ئەی قوڕم وەسەری. ئەگەر خانمی مەزن لە ماڵ وەدەرم بنێ خـەتای تۆیە.

هەتا دەگەینە حەمام لەگەڵی هەڵدەهاتم و بە پەرێشانی و گاڵتـەکانی پێدەکـەنیم. دیـارە خانم خانمێ چی نەدەوت: بزەی دەهاتێ و بە نەنـە دەدری دەوت جـوانم بشـوا. نەنـە دەدریـش دەیوت: بانی چاو.

خانم خانمێ کەیفی بە دەللاکە کەس نەناسەکان نـەدەهات، تەنانـەت ئەوانـەی ناسـیاویش بـوون و گیـانی ئێمەشـیان دەشوشـت. ئـەو دەمانـەی نەنـەدەدری دەچـوویە گونـدو لـەکاتی دیاریکراودا نەدەگەڕایەوە ئەمن یا خوشکمی لەتەك خۆیدا دەبرد کـە هـەر نـەبێ لیفێـك بـە پشتی دابێنین. یەکێ لەو ڕۆژانەی کە لیفم لە پشتیدا وتـی: رۆڵـە بـۆ کایـە دەکـەی، مـەگین دەستت هێزیان تێدانەماوە، دەی توندتر، توندتر.

غیرەتم نایە بەرخۆم و وتم: خانم خانمێ ئەمن دەزانم بۆچ ناوی پوورە ماهتان ناوە ماە.

-بۆچ؟

-چونکە ناوی تۆ ستارەیە بۆیە ناوی پوورە ماهیشتان ناوە ماە. وەنیە؟ ئـەتۆش وەك مـن چەند ناوت هەیە.

نەختی پشتی ڕاست کردەوەو وتی: ستارە؟

لیفم بە پشتیدا هێناو وتم: دەزانم یەکێ لە ناوەکانی تۆش ستارەیە.

-بەچی دەزانی؟

-ئەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژە کە پاپا هاتەوە.

-دەی؟

-لەژێرە کورسیدا خەوتبووم.

بە بزەوە وتی: دەی؟

ویستم بڵێم تۆی ڕامووسی، بەڵام نەموت، وتم: پاپا بە تۆی وت ستارە. بەڵام ئەمن قەت لای کەس نەمدرکاند.

سەبرێکی قاپە ئاوێکی بە شانیدا کردو وتی: چاکت کرد.

-بۆ؟

لیفەکەی لێ وەرگرتم و وتی: ئەگەر گەورە بووی تێدەگەی.

ئەوجار ڕوومەتمی بەهەرتك دەستی گرت و ڕامووسی و وتی: چاکت کرد ، چاکت کرد لای کەس نەت درکاند.

ستارە کە لە دایك بوو، لە نامەیەکدا بۆم نووسی کیژەکەمم ناو ناوە ستارەو ئەو دەبێ باشتر لە هەموو کەس بزانێ بۆ.

بەڵام ستارەی من هیچ شبی ستارەی سەردەمی منالیم نادا. ستارەی من تەنانەت زۆر دژوار لە زمانی ستارەی منالییەکانم تێدەگا. هیچ بیرەوەرییەکی لەو نیە. ئەوان دوو ستارەن کە گەلێك ساڵی نووری لێك دوورن. دەستەکانم رادەهێڵم، حەز دەکەم بە دەستەکانم بیانگرم، هەست دەکەم ئەو ستارەی منالی لێم نزیکترە هەتا ئەم ستارەیە.

بیر لەمە دەکەمەوە ئاخۆ ستارە قەت بیری لەم بابەتە کردۆتەوە کە بۆچ نەیتوانیوە منالییەکەی لەگەڵ خوشك یا برایەکی بەش بکا؟ یا ئەوەتا هیچکات لەگەڵ ئەم چەشنە تەنیاییە یا غەیرەتەنیاییەك ئاشنا بووە؟

ڕۆژنامەیەکی قەراخ جیهان هەڵدەگرم. لاپەڕەی هەڵدەدەمەوە، لاپەڕەی نێوەندی تەژی لە وێنەی منالانی دواناوەندییە و وتارێکی لەبابەت ئاکامی تاقیکارییەکان تێدا بڵاو کراوەتەوە.

منالەکان دوو دوو و سێ سێ لە دەوری لاپەڕەیەکی کە وەڵامی تاقیکارییەکانی تێدا هاتووە کۆ بوونەتەوە و چاوی پێدادەگێڕن. ئەو ڕۆژانەم بیر دێتەوە کە لەتەك ستارەدا ئەم سەردەمە پڕ لە پەشێوی و دڵەخورپێی بەر لە تاقیکارییەکان و دوامین سەردەمی بەیەکەوەبوونمان تێپەڕاندووە.

جیا بوونەوەکان یەك بە دوای یەکدا هاتن، زۆر زووتر لەوەی کە چاوەنواری بووین دەستی پێکرد. بەر لە کۆتایی قوتابخانەکەی چەند جار درکاندبووی کە جیا دەبێتەوە و لەتەك منالانی دیکە دا دەبێتە هاوماڵ. دژایەتییەکەی منیش کەلکی نەبوو. جیهان هاوڕێی نەکردم و هەستۆکی* پێشان نەدەدا. هەستۆکییەکی کە هەم ئەو، هەم ستارە ئەمنیان پێ تاوانبار

دەکرد، لە ماڵی ئێمەدا دەمەقرەیەکی زۆر بوو، هەتا ئەوەی کە ڕازیم کرد هەتا چوونە زانکۆ لە ماڵێ بمێنێتەوە، گەلێ جار بیر لەمە دەکەمەوە کە بریا نەمابایەوە.

ئەو سەردەمانە ئەویان بە یەکجارەکی لە ئێمە جیا کردەوە. هیچ شتێکی ماڵەوە لە روانگەی ئەودا دروست و بەجێ نەیدەنواند. بە بڕوای ئەو مەزنترین تاوانمان ئەمە بوو کە نەمانتوانیبوو بە تەواوی لە شارستانییەتی رۆژاوادا بتوێنەوە. لە روانگەی ئەوەوە ئازادی بەواتای وازهێنان لە هەموو ڕابردوو بوو و نەیدەتوانی لەئێمە، لەمن بگا، لە منێك ببوورێ کە بە ڕابردوومەوە لکاوم. دەیوت: نەدەبووا هاتبای، ئێستاش کە هاتووی ئەشێ ڕابردوو لەبیرکەی. ئەو لە هەستی دووروڵاتی من نەدەگەیی. دەمتوانی لە تێنەگەیشتوویی یەکەی بگەم بەڵام لە سووکایەتییەکەی نا. هەبوونی ئەو سەرلێ شێواوییەکی پڕ ئێش و ژانی بە دواوە بوو.

لەمەڕ ئەو رۆژانەی حەزم لێیان نەبوو نەدەکرا لەخۆم ببوورم، گەرەکم بوو دان بە گشت تاوانەکاندا بێنم. بەڵام ئەمجارە سووکایەتیکردن ئاسوودەی نەدەکرد. لە کولتوورێکدا کە ئەو تێیدا دەژیاو جگە لەو دانی بە شتێکی دیکە دانەدەنا، جێگەی من نەدەبۆوە، زۆر جار لە بوونی ناو و ناوبانگی خۆشی دڵمەند دەبوو و کاتێ دەیوت: ئەمە هەر تەنیا بەربەستێکە، قازانجێکی دیکەی نیە، بە ترس و سامەوە تێدەگەیشتم بەو شتانەی باسیان لێوە دەکا کەیف خۆشم، کەیف خۆشییەکی لێوڕێژ لە ئێش و ژان. نسێیەکی تاری و قورس کە سەرەسووڕەم پێدەگرت.

*نازانم ئاخۆ قەت یەکترمان ناسیوە؟ قەت شارەزای*
*قووڵایی ناخی یەکتر هەین؟ شارەزای ئەو شتەی*
*کە ئازارمان دەدا و ئەوەی کە دەبێتە هۆی*
*بەدڕەسەنی و هاوارەکانمان؟ ئەو هاوارە لەخەو-*
*ڕاچوونەی کە شوێنێك بۆ خۆنواندیان نادۆزنەوە،*
*ماوەیەکی زۆر لە سینگدا دەمێننەوەو پاشان*
*کپ و بێدەنگ لەنێو دەچن و قەت کەسیش نازانێ*
*ئەوان چ بوون و چیان بەسەر ئێمە هێنا؟ ئاخۆ*
*ئەمن دەتوانم وەڵامێکیان بۆ بدۆزمەوە...*
جیهان دەڵێ ئەمانە ڕواڵەتی ژیانن.

بێ ئەوە خۆم حەز بکەم هاوار دەکەم: کە وابوو تۆش هەر بەم ڕێگەیەدا بڕۆ.

هەست دەکەم پێخۆشبوونەکەم دەگەڕێتەوە سەر چەشنێ تۆڵە ئەستاندنەوە. لەم نێوەدا هەر ئەوە کە ناوی خۆی لە کیس دەدا. بەڵام دەزانم دەبێتە لێك پچڕانی دوایین ڕایەڵ و پۆیەکان.

جیهان دەڵێ: دەبجا ئاکامەکەی، چ جیاوازییەکی هەیە.

دەڵێی شانم وەبەر کێـوێکی قـورس نـاوە. قورسـایی ئەوینگـەلێکی کـە نـوقمی قـین و هیوابڕاوییە. و لە دەست هیچ کامێکیان ڕزگاریم نایە. ناتوانم دەست لـە منداڵەکـەم بـەردەم، ناتوانم بەرەڵڵای بکەم. دەرفەتێکیشم پێ نادا هەتا پێی بڵێم خۆشم دەوێی.

زانکۆکەی لەو سەری لەندەنە، بەڵام ئەگەر دوو شەقام ئەولاتریش بووایە دیسـان تـەنیایی پێ باشتر بوو. دەڵێ: هاوڕێکانم بە گشتی جیا لە دایك و باوکیان دەژێن.

دەڵێم: ئەمە ئیدی نابێتە سەرەتی*. سەربەخۆیی تەنیا هەر ئەمە نیـە دوورەپـەرێز بـی. مرۆظ ئەشێ ڕۆحێکی سەربەخۆی بێ.

وا سەری با دەدا کە پێدەچێ بڵێ: ئەمن ئیتر لەگەڵ تۆم پێناکرێ.

گەلێ جار دەمخاتە بیر دایکمەوەو گەلێ جاریش بیر باوکم.

دەڵێ: ئێوە بە داب و نەریتێکەوە نووساون کەهی هەزار ساڵ لەمەوبەرە. زۆر سـەیرە دوای چەند ساڵ کە لێرە دەژین بەڵام هێشتا دەستتان لێ هەڵنەگرتووە.

دەڵێم: مرۆڤی ڕووناکبیر هەوڵی ئەوەیەتی داب و نەریتی دەست و پێگر و ئەوانەی بەرگری پێشکەوتی مرۆڤن تووڕیان هەڵدا، دابێکی کە ئێمە هەمانە دەسـت و پێگـر نیـە. هـەر ئـەو ئینگلیزییانەی کە خۆت لەوان نزیك دەنوێنی، مەگین واز لـە دابونـەریتی خۆیـان دەهێـنن، و ئەگەر بچنە وڵاتێکی دیکە هەموو شتێ لەبیر دەکەن؟ ئەوانە بـۆ هـەر کـوێ چـوون و دەچـن لەبری ئەوە لە کولتووری ئەو وڵاتەدا بتوێنەوە، کولتووری خۆیان بەوان دەناسێنن. سەر بەهەر شوێنێدا کەن شارە دێیەکی ئینگلیزی دروست دەکەن و ئەگەر نەنەتوانن بۆ وەشـوێن کـەوتنی داب و نەریتی ئینگلیزی خەڵکی دنە بدەن، خۆیان هەر ئەو شـێوە ژیانـە ئینگلیزییـە ڕەچـاو دەکەن. ئێستاش نموونەکەی لە وڵاتی خۆماندا هەر ماوە.

کورت و کرمانجی دەڵێ: داب و نەریتی ئەوانە بەنرخە.

- نرخی داب و نەریت چۆن دیاری دەکەن، چ شتێ دیاری دەکا؟

سەری با دەدا: ئێوە منتان ئا ئەلێرە بووە. ئەمن لێرە پێگەیشتووم، بۆ ئەوە بتـوانم لێـرە بژیم ئەشێ چەشنی ئەوانە بم.

-بۆ ژیان بەسەربردن دەبێ شوناسی خۆت بە باشی بپارێزی.

دەڵێ: باشە، ئێوە پێناسەی منن...

بە شێوەیێ دەئاخوێ کە لایەنی سووك کردنەوەی بە دڵ هەست پێدەکەم، پێم وایە دەڵێ: هەر ئەوەی کە شوناسی منن بەسم نیە؟

بەڵام دیسان لێی نابمەوە و دەڵێم: وەرگرتنی شوناسی یەکی دیکە ئەمانەتێکە ئاخری ڕۆژێك دەبێتەوە هیچ.

- ئەمن لە قسەکانی تۆ ناگەم. ئەگەر ئەم بابەتانە بەم ڕادەیە گرینگن بۆ دەستت لێیان هەڵگرت و هاتی؟

گەرەکمە بڵێم ئەم دۆزە هێشتاش بۆ من هەرجێی پرسیارە کە وەڵامێکی دروستم بۆی نیە. چاوم لە جیهانە کە بە ئاماژە تێم دەگەیەنێ چیدی قەراخی نەکێشم. ڕاست دەکا، ئەو خۆی یەکەم کەسێ بوو کە پشتی لە پێوەندییەکانی کرد. ستارە بە ڕێکەوتی ئەم هاتنە نازانێ. نا ئیتر ناتوانم، ئیدی حەز ناکەم بیلێم.

هاوڕێ یۆنانیەکەم هەتا ئەو ڕۆژەی قوتابخانەکەیان دادەخرا، مناڵەکانی دەنارده لای دایك و باوکی لە یۆناندا. دەتوت شتێ لەم مسافیرەتە بەرچاوتر لە ئارادا نەبوو. ئێمە ستارەمان دەبردە ئیسپانیاو فەرانسە. ئێرە بۆ ئەوە کە فێری زمان بێ، ئەوێ بۆ ئەوە کە لەگەڵ شارستانییەتی دنیای ئەوێدا شارەزا بێ.

هەرچی کردم بۆ خۆم لەخۆم کرد.

*لەخۆم دەپرسم لەگەڵ کام بەختەوەری، کام*
*جەزرەبە، کام یەك لەوانەی کە گەزەکی* ژیانم*
*بوون و بەبێ بوونی ئەوانەوە دەوامم هێناوە*
*تێکەڵاویم دەبێ؟*
*دەبێ لە کوێوە دەست پێ بکەین، لە*
*پاپا کە چەشنی دێوەزمەکانی نێو*
*هەقایەتەکان بوو. لە تۆوە کە هەقایەتەکانت*
*بە گشتی دەزانی هەقایەتی خۆت نەبێ؟*
*لە ژیانی ئەوانەی کە ڕۆیشتوون جگە لە دڵی*
*منەوە، یا ئەوانەی کە ماون، بەڵام لە دنیایەکی*

*تەنیادا، دوور لە یەکتر، جیا لە یەکتر...*

سەرم لار دەکەمەوەو لە سووچی پەنجەرەوە لە کیژێك دەڕوانم کە چەمەدانەکەی بە شوێن خۆیدا ڕادەکێشێ و بەرەو شەمەندەفەری سەکۆی هەمبەر دەچێ. چەمەدانەکەی قورسەو سەروسیمای شەکەت. جانتایەکیشی بە شانی چەپەوەیە. لەم سەرمایەدا تەنانەت بۆی ناکرێ دەستی بخاتە گیرفانی. لەبەر دەرگەی ڕۆژنامەفرۆشی دەوەستێ. مێری فرۆشەر خەریکە لەتەك مشتەرییەك دەئاخوێ و دەستی ڕاداشتووە کە دراوەکەی لێ وەرگرێ. کیژە هاوتەمەنی ستارەیە. بێشك ستارەش لە سەفەرەکانیدا چەمەدانەکەی بەرەو سەکۆکانی شەمەندەفەر بە شوێن خۆیدا ڕادەکێشێ. جیهان دەڵێ: ستارە گرفتێکی لە ژیاندا نیە. هەر ئەوە باشتر کە وەکوو ئێمە نیە.

ئەمن بۆ ستارە خەمی هەموو ئەو منالانەم خواردووە کە نەمبوون. خەمی تەنیاییەکەیم خواردووە. شەوو ڕۆژ لەبەر هاتنەوەو نەهاتنەوەی دڵم داخورپاوەو کپ ماوم. حەسرەتی نەبوونی ئەو خوشك و برایانەم خواردووە کەنەیبوون. بە ڕادەیەك لە خەمیدا بوومە کە هەرکات فاختە دەڵێ، برۆ، قەدری ژیانت بزانە، حەز دەکەم بە سەریدا بگوڕینم، بەڵام بە دڕدۆنگییەوە لێی دەڕوانم. ئەو ئیتر ناتوانێ تێم بگا. حەسرەتێکی شاراوە لە قووڵایی چاوە بوێرو بزەدارەکەیدا خۆدەنوێنێ. فاختە شارەزای دنیای ژیانی من نیە. ئەو هەر شارەزای ئەو دنیایەیە کە تێیدا دەژی، دنیایەکی لێوڕێژ لە ئاواتە وەدی نەهاتووەکان و داهاتوویێکی نادیار. دنیایێك کە من تێدا دەژیم تێکڕای ئەو شتانەیە کە ئەو ئاواتی بۆ دەخوازێ. ئەو نازانێ دنیای من داخ و حەسرەتی گشتی ئەو شتانەیە کە لە کیسم چوون.

*دڵم تێك دەچێ، نەك لەبەر بۆی دەرمان، لەهەر*
*چیەکی کە هەمانە لە هەر چیەکی بوومانە و*
*لەکیسمان داون. لەوەی کە نیە و نیمانە و*
*دەبووا هەمانبێ. لەوەی کە ئیتر جیاوازییەکی*
*بۆم نیە چ کەسێ لە کوێ و بۆچ دەژی*
*ڕۆستەم. ئاخ ڕۆستەم...*

ستارە لە زانکۆدا یەك بە دواییەکی بەندەکانی پچڕی و مەوداکانی فرەتر کرد. تەلەفۆنەکان و دیدارەکان کەمتر بوونەوە. تەنیا من هەواڵی ئەوم دەپرسی، ئەویش زۆرجار لەسەر مەکینەی پەیامگر، ئەمە دوایین بزمارە کەلەم تابوتە دەدرێ.

جیهان دەیوت: سەربەخۆیی.

ئەمن دەموت: غەوارەیی.*

غەوارەییەکی کە بازنەکەی ڕۆژ بەڕۆژ بەربلاوتر دەبۆوە. لە دەوروبەری خۆم دەڕوانم. کیژەکە لەمێژە بە پێش ئێمەدا تێپەڕیوەو مێری ڕۆژنامەفروشیش خەریکی ڕاس و ڕیس کردنی بنێشت و چوکولاتەکانی بەرپێشخانە. چاوەکانم لێك دەنێم.

ئازاری من لەمەڕ دووری و جیابوونەوەی ئەو نەبووە، ئەو بیرە ئاسوودەیە بوو کە دەبووایە هەستم پێکردبا کە نەمدەکرد. نەمدەویست، نەمدەتوانی دەستی لێ بەربدەم.

دوو حەوتووی بۆ جێژن ماوە، دەست و دڵم بۆ کاریێ ناچێ. وازم لەسەر نیە. غولام خان بە دوای تێپەڕکردنی خولێك ناسازی سەخت و دژوار کۆچی دوایی کرد. شوێنە بەتاڵەکەی ئەو بێ ئەوە شوێنەوارێکی لە ژیانم دا ببێ هەست پێدەکەم. ئەو بوو کە ئامۆژگاری دەکردم و دەیوت: بۆ کیژەکەت لەتەك خۆتا ناهێنی؟

-دەچێتە قوتابخانە.

برۆکانی هەڵدەتەکێنێ و دەپرسی: بە درێژایی ئەم دوازدە مانگە دەچێتە قوتابخانە؟

دەیوت: لەتەك خۆتابهێنە. مەیەڵە لەبیرمان بکا.

دەموت: نایە.

سەرێکی با دەدا و دەیوت: حەز دەکەی باوەڕم بە وتەکەت بێ؟ مندالەکان نابێ ریشەکانیان لەدەست بدەن. ئەگەر خراپین با ئەم خراپییە ببینێت و ئەگەر باشین با چێژی لێ وەرگرێ.

دەمگوت: ئاه مناڵەکان، مناڵەکانی ئەم سەردەمە زۆر گۆڕاون. مناڵەکان ئەو شتانەی کە ئێمە لامان پەسندە ئەوان بەدڵیان نیە.

-تۆ بڕیاری بۆ مەدە، لێگەڕێ خۆی ڕای لەسەر بدا. کەسێك کەریشەی خۆی نەناسێ ناتوانێ لەهیچ کوێ جێگیر بێ.

دەزانم کە حەق بە غولام خانە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە گەرەکمە سیحری ئەو وڵاتەی کە بۆ ستارە نەناسراوە، بۆ خۆمی بپارێزم.

*ترسم لەوەیە کە ئەتۆ، هەست ونەستم،*
*نیشتمانم، لە دەستەکانی ئەودا لە کیس*
*بدەم...*

ئەو هەر قەت کیژەکەی منی نەدی.

شەمەندەفەر بە نێو ئەو مەزرایانەی کە بە شێوەیەکی نارێکی هەندەسی هێڵکێشی کراون تێدەپەڕێ. لە دەشتە پڕ لە دەغڵودان و سەوزەڵانەکان دەڕوانم. لە دوورەوە مانگاکەلی لەسەرخۆ و تەوەزەل و ئەسبگەلێ دەبینرێن کە روون نیە خەوتوون یا بەخەبەرن. مێگەلە مەڕێك هەروەك پەڵەی سپی لەنێو مێرگ و مێرغوزاری تەپۆڵکەیەکدا بڵاوبوونەتەوە. نازانم کاریلەشیان لەنێودایە یا نا.

*کاریلەگەلێکی کە کاغەزیان دەخوارد و ئێمە*
*دەفتەرەکانمان بۆ ئەوان وەلا دەنا هەتا ئەگەر*
*رێمان لە دێ کەوت لاپەڕەکانیان پێ بدەین*
*بیخۆن و خوێندەوار بن. ئەوان وەك ئێمە بێ*
*گوێ بوون و ئەتۆ شێوەی دەستەمۆ*
*کردنەکەیانیت دەزانی...*

نامەیەکی تایبەتی بوو، سەری هەڵدەدڕم، نوسخەی سەرەکی وەڕەقەی دیپلۆمی دواناوەندییە. کوڕیژگەی شێت و شوور بیری بۆ ئەوە نەدەچوو ئەگەر نامەکە لە رێگادا ون بێ دەبێ بەچی؟

لە پشت تەلەفۆنەوە دەڵێ: خەمت نەبێ. ون نەبووەو ئەگەر ونیش بووایە تەنیا لاپەڕەیەك بوو و هیچی دیکە.

هاوار دەکەم: تۆ دەتوانی کۆپییەکەیم بۆ بەرێ بکەی.

نەختێ کپ دەبێ و دەڵێ: ئەودەم هەر ئەم شتە دەبوو؟

راست دەکا، پشووم دەخۆمەوەو دەڵێم: ئەو لەگەڵ مەزنترین قوتووی چووکولاتێك کە لە دنیادا دەست کەوێ بۆتی دەهێنم.

-هەتا قەپاڵ لەگشتیان داگرین و نەخواردوو بیانخەینەوە شوێنی خۆیان؟

-ئەم تەڕ زمانییانە هەر ئیشی منە نەك تۆ.

پێدەکەنێ. دەڵێم: جارێ وەختی زانکۆیە.

-ئەودەم کە هاتیە تاران باسی لێوە دەکەین. ئێرە وەکوو ئەوێ نیە، دەڵێی لەبیرت چۆتەوە.

-ئەتۆ دەشێی و دەبێ بە شوێنیدا بچی.

دەیوت: ئەوە هەر ئەتۆ ئەو قسەیە دەکەی. لێرە کەس دەربەستی ئەم وتانە نیە.
-مەگین لەمەڕ ئەمەوە کە تۆ بچیە زانکۆ، کەسێکی دیکە دەبێ دەربەست بێ.
ئەگەر پوورە ماه نەبووایە ئەو هەر ئێستاش لە بنەبانی دووکانی جەوادئاغا خەریکی کەوش بزمارلێدان بوو و ڕەنگە هەتا ئێستا بۆیاغ کردنیش فێر بووبایە.
بنەماڵەکەمان هەتا ئەوکاتە خۆیان دەورێکیان نەبوو، بە گشتی دژی خوێندن بوون. براکانم با ئەوەی چەند ساڵێکیش لە تاقیکاری چوونە زانکۆ دەرنەچووبان، بەڵام دیسان باوکم ناچاری دەکردن ساڵی دواتر لە تاقیکارییەکاندا بەشداری بکەن. ئەوەی کە ڕەنگە توان و مرخی خوێندنیان نەبێ و ئەو شتانەی بە گوێدا نەدەچوو. بۆ ئەوەی دەرمانخانەکەی دەوامی ببێ ئاتاجی ئەوان و وانە خوێندنیانی بوو، هەروەك ئەوە کە بۆ دەوامی دەرمانخانەکەی پێویستی بە نەخوێندەواری ڕۆستەم بوو.
وتم: جارێ نۆرەی زانکۆیە.
سەری خوراند و وتی: وتنەکەی لە کردنەکەی ساناترە.
هێندەی وت، هێندەی وت کە ئیتر شوێنیم نەگرتەوە، بەڵام قەت نەیوت: ناشێم. دەیوت: ناکرێ.
لێم روون بوو راست دەکا. ئەو دیپلۆمەکەی بە هەزار چەققەمەرگ وەرگرتبوو، باوکم بە پرتەوبۆلە وتبووی لە کاروباری دەرمانخانە دەمێنییەوە. پاپا گوڕاندبووی کە هەتیوە گوندییە بۆ من بۆتە خوێندەوار. لەونێوەدا هەر پوورە ماه و غولام خان داکۆکیان لێ کردبوو و ناعیلاجیان کردبوو هەر نەبێ دیپلۆمەکەی وەرگرێ. بە باوکمیان وتبوو کە ئەمە ئەبێتە هۆی باشتربوونی دەرمانخانەکەت. ئەو بە هەر ڕادە خوێندەوار بێ توانایی کاری زۆرتر دەبێ. مەزنترین کەموکوڕی بنەماڵەکەمان ئەمە بوو کە تەنیا پوورە ماهێك و غولام خانێکمان تێدابوو، نە زێدەتر.

*ئەگەر بشێ ژیانی یەکێك لە چەند ڕستەدا*
*کورت بکرێتەوە، ژیانی تۆ بۆ ئەمە نابێ،*
*خەتای تۆش نیە کە هەرکات وەبیرم دێتەوە*
*بەری فرمێسکەکانم پێ ناگیرێ...*

## ( ١٠ )

هەر لە سەرەتاوە کە ویستم لەتەك جیهاندا بیّم، هەر لەو دەمەوە لاقم دەنێمە نێو شەمەندەفەر، لێم روونە سواری شەمەندەفەرێك دەبم کە نازانم بۆ کوێم دەبا و بۆ سواری بووم و ئەم تەرەبوونە* دەبێ بەچی.

پیاوێك لە پاڵ جیهان دانیشتووە. رەنگ بێ سی و حەوت هەشت ساڵێکی تەمەن بێ، سپی پێست و قژ بۆرە. چاکەت و شاڵواری شین و کراسێکی سپی لەبەردایە و بۆینباخی* کردۆتە ملی، هەر کە وەژوور کەوت بۆی ئۆدکلۆنە هێمن کەرەوەکەی ژووری تەنیەوە. جانتاکەی نایە ژوور سەری و خێرا رۆژنامەیەکی دەرێنا، لەبنەوە چاوێکی لەئێمە کرد و خەریکی خوێندنەوەی بوو. لە دەستی ورد دەبمەوە، گەوێکی* تێدایە.

ئیتر لێم روون بوو کە ناوی جیهانبەخشەو ناوبانگی جیهاندارە.

تاقیکارییەکانی کۆتایی ساڵ دەستی پێکردووەو لە ماڵێدا تا ڕادەیەك هەموو کاتەکانم بە خوێندنەوە تێدەپەڕێ. بەبەر ماڵە فاختەدا تێناپەڕم. تاقیکارییەکانم بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی خۆم زۆر باش نەبوو. سەرەڕای ئەو پێشبینییەی کە فاختە کردبووی، نەتەنیا نەبوومە قوتابی پلەی یەکەمی پارێزگا، بەڵکوو قوتابی یەکەمی ناوچەش نەهاتمەوە. ئەو پێدەکەنێ و دەڵێ: خۆ پلەی یەکەمی قوتابخانەت وەدەست هێنا. جیهانیش بە شوێن تۆ دا دەگەڕا.

سەرەڕای ئەوەی لەخەفەتیان وەختە دڵم بتەقێ بەڵام دەڵێم: وازی لێ بێنە. ئەگەر بێتوو دەرنەچم خۆم دەکوژم و هەمووشی هەر خەتای ئەوە.

فاختە بە سەیرەوە دەڕوانێ و دەڵێ: نەمدەزانی بابەتەکە بەم ڕادەیە گرینگە.

دەستم دەخەمە سەرشانی و لێی دەپاڕێمەوە: تکایە باسی لێوەمەکە، تکایە لێگەڕێ با بە دەرس و دەورەکانم ڕابگەم، تکایە...

لاسایيم دەکاتەوە و بە درێژایی ئەوڕۆژە هەتا چاوی پێم دەکەوێ دەڵێ: تکایە، تکایە...

بیتاقەی شانۆ لە شوێنێك حەشار دەدەم و بە وانەکانمەوە خەریك دەبم.
سامناکترین کارەساتێکی کە بەسەرم هات ئەمە بوو کە واتای ئەوینم بۆ دەرکەوتبوو، ڕۆژانی پێشتر هەمیشە لە ئەوین دەدواین، شێعرو ڕۆمانگەلی ئەویندارانەمان دەخوێندەوە. پەرتووکی بیروڕامان دروست دەکرد و دڵمان بۆ هەنووسکە ئەوینێك شابالی لێ دەدا، ئێستاش لەپڕ بە تەواوی هەست و نەستەوە هەستم پێدەکرد. ئەو هەستە گشتی لە بیتاقەیەکی شانۆ و ئەم ڕستەیەدا کە، ئەگەر حەزت لێی بێ وەکوو یادگارێك لە لات بێ، جێ کرابۆوە. ئەم ڕستە ساکارە بو من ببوویە کتێبێکی سەرانسەر تەژی لە واتا. بە خۆمم دەوت: بۆ ئەو قسەیەی کرد. مەبەستی چ بوو؟
بە فاختە دەڵێم: قسەی لێ مەکە. حەز دەکەم لە تەنیایی خۆمدا بم. ساتێ کپ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەم ڕۆژانە وەك شاعیرەکانت لێ هاتووە.
لاسایی من دەکاتەوە، حەز دەکەم لە تەنیایی خۆم دابم.
ساڵەهای ساڵ ئەم ڕستەیەی مەتەڵ ئاسا بەگاڵتە دەگێڕایەوە.
دەڵێ: لەخۆتەوە هەڵمەچوو. ئەشێ لقێك هەڵبژێری، کە هەڵتبژارد دەردەچی یا دەرناچی، لەمە زیاتر نیە. ساڵی یەکەم کە دەرنەچووین ساڵی دواتر خۆمان تاقی دەکەینەوە. سەرەڕای ئەمە، مەگین من و تۆ چیمانە کە دەرنەچین.
لەو بڕوا بەخۆبوونەی کە هەیەتی سەیر ماوم و پێکەنینم پێی دێ، دەڵێم ئەمە دەزانم، بەڵام.
-بەڵام چی؟ دەڵێی چ بکەین. خۆپێشاندانێك وەڕێ بخەین؟
دایکم کە وشەی خۆپێشاندانی بیست، گوێی قووت کردەوەو هەر لێی دەپرسیم خۆپێشاندان یانی چی؟ کیژێ سەرت بەردەوەو دەرست بخوێنە. ئێمە چیمان بەم شتانە داوە.
وتم: دایە: خراپی لێ حاڵی بووی.
وتی: دێن دەرمانخانەی باوکت تەختە دەکەن.
پێکەنینم راناوەستێ: دەرمانخانەی باوکم تەختە دەکەن؟ بۆچ، لەمەڕ چی؟
-هەر ئەوەی کە وتم. ئیتر ئەم قسانە لە ماڵەوە نەبیستمەوە.
بە فاختەم وت: دایکم لەو ڕۆژەوە کە وشەی خۆپێشاندانی بیستووە، تووڕەیە.
-هەر دایکی تۆ وانیە. دایکی منیش هەر دەزانێ بڵێ مەکە، مەڵێ، مەچۆ، جگە لەمە زووتر بە شوومدا هیچ ئاواتێکی لە دڵدا نیە. بۆیشی گرینگ نیە بەکێ.

بە دوای ئەودا بزەیەکی شیرینی دەنیشێتە سەرلێو.

ساڵانی دواتر کاتێ پێم وت: حەز دەکەم هاوار بکەم و بڵێم لێگەڕێن لە تەنیایی خۆمدا بژیم، بزەیەکی خەماوی هاتێ و سەری بادا.

بەخۆم دەڵێم: خۆزگە ئەم وشەیە ئیمڕۆش هەر ئاوازی رۆژانەی دەبوو. ئەم قسانە لەو رۆژانەدا تەنیا لێوڕێژ لە هیوا و ئەوین و کایەیەك بوون و هیچی دیکە. بەڵام ئیمڕۆ خەم و پەژارەیەکی ڕاستەقینەیە. واتایەکی دروست کە کەس ناتوانێ تێی بگا.

ئیمڕۆ ئەو تەنیا کەسێکە کە ئەم ڕستەیەی بیر دێتەوە و تەنیا کەسێکیشە کە دەشێ تێی بگا.

دوایین تاقیکاری ساڵی یەکەمی زانکۆ تازە کۆتایی هاتبوو کە فاختە بە تەلەفۆن پێی وتم: دێیە سینەما؟

-سینەما، کوێ، کەی؟

-کوێ و کەی گرینگ نیە، جیهان هاتۆتەوە.

-...

بێ شك حەز دەکەی بپرسی جیهان کێیە؟ لەبیرت چۆتەوە، ئەمن باشت دەناسم.

-بۆچ دەبێ لە هاتنەوەی ئەوم ئاگادار بکەی؟

-چون ئەویش هەواڵی تۆی پرسی. بۆیەکەی لەبەر ئەمەیە.

تەلەفوون بەدەست وشك راوەستابووم، گەلێك مانگان بە هەویا و چاوەنواڕی هەواڵێك لە لایەن ئەوەوە بووم، ئیتر هیوایەکم بە بینینەوەی نەبوو و ئێستا لەپڕ هاتبۆوەو هەواڵی منی پرسیبوو.

فاختە وتی: بڕیارە سبەی بە یەکەوە بچینە سینەما.

-منیش ئەبێ بێم؟

-نا هاتنی تۆی پێویست نیە. بەڵام ئیدی هەروا بزانە هیچ قسەیەکت لەمن نەبیستووە.

-ئاخر...

-باشە کەوابوو، سبەی دێمە شوێنت. خۆت ئامادەکە.

-ئاخر...

-ئاخر و سندان، سەعات شەش لەبەر دەرگەیماڵتان.

نەمدەزانی هەتا سبەی چ بکەم. بیر و وێناکردنی دیتنی ئەو، واتا دیسان وەخەبەربوونی شەوتا بەیانی و هەسارە ژماردن. بەرە بەرەی بەیانی بوو کە لەخەو ڕاچووم ئەویش لەبەر ئەوە خەونی پێوە ببینم، خەیاڵی ئەو کە لەتەك دیتران جیاواز بوو، ئۆدکلۆنێکی کە بۆیەکەی دەشیا تا هەتایی لەبیرومێشکمدا بمێنێتەوە و ئەو چاوە سەوزانەی کە لە مرۆظ رادەمان و پێکەنینێك لە نێویاندا خۆی دەنواند. کە بیرئانینیان گەلێ چەتوون بوو. بەیانی بە چاوانی ماسیاو و لەشێکی شەکەتەوە لەجێوە ڕابووم. دایکم وتی: بێشك نەساخم و دەبێ بچمە دەرمانخانە و دەرمان لە باوکم بستێنم و بە ڕۆژیش لە ماڵەوە داسەکنێم هەتا چاك ببمەوە، ئارخەیانم کرد کە هیچم نیە و ئەمشەو لەسەربان ناخەوم. بەڵام ئێستا ئێجگار باشم. ئێوارەش بەر لەوە قسەیەك بکا و نارەزایەتییەك دەرببڕێ، کورت و کرمانجی وتم فاختە هاتۆتە شوێنم و وەدەرکەوتم.

فاختە سەیرێکی کردم و بە بزەوە وتی: پێموابوو لانیکەم کەمێك خۆتی بۆ جوان دەکەی.

دڵم داکەوت و بە خەمساردییەوە وتم: من وەك تۆ نیم، هەر کارێکیش بکەم دیسان هەریەکە.

دەستی لەشانەکانم ئاڵاند.

وتم: نەدەبوا هاتبام. فاختە چاوێکی لێکردم. ڕاست دەکەی ئاخر بەم سەرو پۆتڕاکەوە...

شانەکانی لێك گووشی و وتی: سەرو پۆتڕاکت زۆریش ڕێك و لەبارە. بەڵام هەر دەڵێی زۆر چاك گریاوی. لە ماڵێ چ نەقەوماوە؟

توند قۆڵمی گرت. وتم: دوێ شەو هەرهیچ نەخەوتووم، بۆیە چاوم ماسیاوە.

-بۆچی؟

- چی بۆچی؟

-نەخەوتووی؟

-هەروا، زۆر گەرم بوو.

لە بەدفەڕییان وتی: دوێ شەو هەوا یەکجێ گەرم داهات کە هێندێك هەتا بەیانی خەویان لێ نەکەوتووە.

جیهان و مێهران لەبەر دەرگەی سینەما چاوەنوارمان بوون. جیهان هەروەك جاران بوو. بە فیز و هەوا، بەژن ڕێکوپێك، تەڕپۆش و جارێکی دیکە بۆ هەزارەمین جارو تا هەتایی عاشق بووم. هێشتا بە دروستی لەسەر جێگاکانمان دانەنیشتبووین کە ژوورەکە تاری بوو و فیلم

دەستی پێکرد. لەنیوەی فیلمەکەدا سەری لێم نزیك خستەوەو لەبن گوێمدا وتی: شووم پێدەکەی؟

تێنەگەیم دروستم بیست یا نا. پێم وابوو گاڵتەم پێدەکا یا یەکێك لە وتەکانی فیلمەکە دەڵێتەوە. ئاوڕێکم لێداوە و بە سەر سوڕماویی و نامتمانەیی لایەکم لێکردەوە. زۆر هێدی پرسیم: چی؟

سەری هێناپێش، لەپی دەستی لەدەور زاری گرت و لەبن گوێمدا وتی: شووم پێدەکەی؟

دڵم هەڵتەکا، کوڵمەکانم سوور داگەڕابوون. بە خۆمم دەوت چانیە تاریکە. فاختە سەبرێکی وتی: ئەوە چیە هێندە قسە دەکەن.

فیلم کۆتایی پێهات و ئەمن چی لێ تێنەگەیشتم. پێم وابوو لەبری فیلمەکە چاو لە من دەکا. جارێکیش ورەم وەبەر خۆم نا و بە سیلەی چاومەوە سەیرم کرد. نوقمی نیگام ببوو. دەتوت لەبیری چۆتەوە ماوەیەك بەرلەمە لە تاریکی ژووری سینەمادا داوای لێم کردبوو شووی پێ بکەم. لام وابوو دەبێ تووشی دڕدۆنگی هاتبم و ڕەنگ بێ نەخۆشی ڕەوانی بگرم، لێوەکانم لێك دەگوشی هەتا بەڵکوو دڵم بێتەوە سەرخۆ، دڵنیا بووم کە دەنگەکەی دەبیسێ. حەزم دەکرد لەجێوە ڕابم و ڕۆیشتبام. نەمدەزانی ئەگەر چراکان هەڵنەبنەوە چ دەکەم، هاوار دەکەم، دەگرییێم، نەمدەزانی، تەنانەت نەمدەزانی دەتوانم لەسەر پێیان ڕاوەستم یا نا.

ژن و مێردیك ڕۆژنامە بەدەستەوە بە شوێن جێدا دەگەڕان. نازانم جێگەیەکیان لە پاڵ یەکتر دەسکەوتووە یا نا. جیهان جانتا دەستییەکەی من و خۆی ناوەتە جێگە تایبەتییەکەی ژوور سەرمانەوە. گەیشتووینەتە ئێزگەیەکی مەزن. شەمەندەفەرێك سەکۆیەك ئەولاتر کەوتۆتە هانکەهانك. شەمەندەفەرە کارەباییەکانی ئێستا وەك شەمەندەفەرە بەردە خەڵووزییەکانی رابردوو شەقە شەق و تەقە تەقیان نیە، بەڵام دەکرێ دڵەکوتەکانیان هەست پێ بکەین. دوو فەرمانبەری ئێزگە بە تەرزو بیچمێکی هێمنەوە لە هات و چۆی بە پرتاوی مسافیرەکان دەڕوانن و بە بێ وازی لەنێو سەکۆکاندا دێن و دەچن، جاروبارە لە مسافیرێکی کە پەشێو و نیگەران بەم لاو بەولادا دەچێ نزیك دەکەونەوەو ڕێنوێنی دەکەن و هەرلەو کاتەشدا چاویان لەسەر مسافیرەکانی دیکەیە. پێدەچێ لەنێو مسافیرگەلێکی بزۆز و لانەواز خووییکی هێمن و ئارامیان وەدەست هێناوە.

ئەوین و دڵەڕاوکێی ئەم کارە ڕۆژ بە ڕۆژ دەمتوێنێتەوە. دەڵێی ڕۆژێ کیلۆیەك گۆشت دادەنێم. فاختە پێدەکەنی و دەیوت: ئەمەیان دەتوانێ وەك یەکێك لە ڕێگەکانی کزبوونەوە ڕەوانەی بازاڕی بکەی. بازاڕێکی بە برەویشت دەبێ.

دایکم بە پەرۆشەوە لێم دەڕوانێ و ئاماژە بە باوکم دەدا، باوکم دەڵێ بچمە دەرمانخانە دەرزییەکی ویتامین لێ بدەم. دەڵێم هیچ نیە بۆ خەم نابێ، هەنووکە کە تاقیکارییەکان تەواو بوون چاك دەبمەوە. باوکم بە مەبەستی دان پیانان بە وتەکەم سەری با دەداو دەڵێ: ڕاستە. بە هۆی تاقیکردنەوەکان بوو.

بەڵام هەموو هێز و توانم بە هۆی سەر لێشێواوی مەست کەرەوەیەك لەدەست دەدەم کە هیچ دەسەڵاتم بەسەریدا نیە و ناشم هەوێ ببێ. حەزم لێیە و دەشزانم کە دەبێ ئەم مەبەستە لای کەسێك بدرکێنم. جا لە پوورە ماه باشتر دەبێ کێ بێ. بۆی دەگێڕمەوەو دەبێ وای بنوێنم کە بابەتێکی کەم بایەخە و گرینگییەکی ئەوتۆی بۆم نیە. ئەوەش دەڵێم کە هەریەك دوو جار دیومە، ئەویش بە شوێن براکەیدا هاتبووە ماڵە فاختە و ئەمنیش بە هەڵکەوت تووشی هاتم.

-جارێ ئەو لەو سەری دنیایە و ئەمنیش لەم لایە.

-ڕاستییەکەی، بۆخۆشم تێماوم، بۆم ناخرێتەوە سەریەك.

-جا خۆ لە سینەمادا و ئەویش بە تاریکی و وتنی وشەیەك خوازبێنی ناکرێ؟

-ئەتۆ بەمە دەڵێی خوازبێنی؟

-ئەی بە بڕوای تۆ ئەم قسەیەی یانی چی؟

-دایکیشم وەك ئەوە شکی کردبێ دایمە لێم دەپرسێ بۆ کوێ دەچم و بۆ دەچم.

-هەق بە دایکتە. ئەو گەنجە دەبێ ئەوە بزانێ کە تۆ بنەماڵە و دایك و باوکت هەیە و نەریتی ئێمەش لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان جیاوازە. پێکەنیم و وتم: بە دایکم بڵێن ئەگەر بۆ کیژەکەی شووییێك پەیدا بێ و هەڵیگرێ و بیبا، ئاسوودە دەبێ؟ ئەدی ئەوە نیە هەمیشە حێوەت* و نیگەرانی ئەوەیە نەوەکوو بێ شوو بمێنێتەوە؟ ئەمن چەشنی ناهید جوان و بەرچاو نیم کە بۆ هەر شوێنێ دەچێ خوازبێنیکەری بۆ پەیدا بێ.

ئیتر هەموو شتێ کۆتایی هات و کات و ساتم هەست پێ نەدەکرد. گشت شایی و خۆشی و هیوام بەوکات و ساتە بوو کە ڕەنگ بوو چاوم پێی بکەوێ. دەتوت زیندووبوونەکەم هەر لەمەڕ چاوپێکەوتنەوەی بوو.

ستاره دەڵێ: گەنجانی ئەم سەردەمە لەخۆوە شێت و شەیداو دیلی ئەوین نابن. ئـەوان ژیانی خۆیان بەقوماری ئەوین نادۆڕێنن. لێکدانەوەکانیان راسـت و دروسـتە. ئێـوە لـەو رۆژگارەدا لە دنیایەکی ناراستەقینەدا دەژیان.

داوەریکردن لەبارەی ئەم دنیا راستەقینە یا ناراستەقینەیە، کە هێشتا دەتوانم هەموو وردەکارییەکانی و هێماکانی و جوولەی دەست و نیگاکانی وەبیر بهێنمەوە، لە لای خـۆم رادەگرم. دەشێم چاوەکانم بنووقێنم و جارێکی دیکە بەو گشتە دڵەخورپێ و ئەو هەستە بە هێزو جوانانەوە، خۆم لەو سەردەمدا هەست پێ بکەم.

ئەوانە لە روانگەی ستارەوە گشتی خەیاڵن و خۆیشی لە هەستێك بێبـەش دەکـا کـە بیرەوەرییەکانی تا هەتایی بۆ مرۆظ هەر دەمێنێتـەوە و هـیچ شـتێ بـە هـیچ کلووجـێ ناتوانێ وەدەستی بێنێتەوە.

بەیانی بوو، هێشتا هەر لەخەودا بـووم کـە دایکـم دەرگـەی ژوورەکـەمی کـردەوە و بەهێواشی رایوەشاندم وتی: هەستە هەستە، هاتووە گوڵی بۆ هێناوی.

وەرسووڕامە سەر کەلەکەو وتم: باشە، باش، هەنووکە هەڵدەستم.

دایکم دیسان ڕایوەشاندم: هەستە گوڵی بۆ هێناوی.

-کێ گوڵی هێناوە؟

-خۆی.

-لەجێوە دەرپەڕیم: گوڵ؟

خەوتبووم بەڵام دەتوت دەنگی دەرگەم لەخەودا دەبیست. دەرگەی ئێمە قەت لە دەنگ نەدەکەوت. هەمیشە یان یەکێك دەهات یا یەکێك دەڕۆیی.

دایکم وتی: هەستە جلوبەرگت لەبەرکە، وەرە خوارێ. ئەمن ئەوە دەچم چایەکی تـازە لێدەنێم، نەخەوییەوە.

هێشتا بە تەواوی بۆم روون نەبوو چ بووە. یانی چی خۆی هاتووە گوڵی بـۆ هێنـاوی؟ ئەو کە هەتا...

یەکجێ دەرپەڕیم، نەمزانی جلم چۆن لەبەر کرد. ئاوێکم بە دەموچاومدا کرد. دایکـم کە لە ژێرەوەی پێپلەکانەکان چاوی پێم کەوت دەستی بە روومەتییەوە نـاو هێـدی وتـی: ئەوە چیە، برۆ نەختێ بە خوتدا وەرەوە.

لە پیپلەکانەکان کە دەهاتمەخوار دەستێکم نایە نێو پرچەکانم.

وتی: هەرنەبا شانەیەکت بە پرچەکانتدا هێنابا.

دووپێپلەکانی دیکە دابەزیم و بە ئاماژەوە وتم نایەوێ. دایکم دیسان بە نیگەرانییەوە لێم ڕاما: شتێك دە ڕوومەتت هەڵسوو، بەم ڕەنگ بزرکاوییەوە؟

ئاخ، بۆچ تێنەدەگەیی چیم لە دڵ دایە. بۆ لەسەر ڕێگەم لانەدەچوو؟ لەژێر پێپلەکانەکانەوە خۆم لە باوەشی هاویشت و وتم: دایە لێگەڕێ با بڕۆم. وازم لێ بێنە.

ئەوجار ڕێگەی بۆم کردەوەو هەر بەو سەیرکردنەوە کە نیگەرانی و دەستە وەستانی تێدا بوو هەتا بەر دەرگەی هۆدە لەگەڵم هات.

باوکم لەسەر قەنەفەیەك و جیهانیش لەسەر قەنەفەیەکی دیکە دانیشتبوو. جیهان کە چاوی پێم کەوت ڕابوو. چاوێکم لێ کرد، بەڵام تەواو گێژ و هێڕ بووم، وەك یەکێك کە لەخەودا دەڕوا. وتی: ببوورە لە خەوم هەستاندی.

هەر لەپێشەوە لەسەر یەکەم قەنەفە دانیشتم. بۆنی ئۆدکلۆنەکەی لەژووری گەڕابوو و شێتی دەکردم. دەستەگوڵێکی مەزن لەسەر مێز بوو. لێی وردبوومەوە. وەك هەمیشە چاکەت و شاڵوارێکی کەشخەی لەبەر کردبوو و ئەمن یەکەم کراسێك کە دەستم پێی ڕاگەیشتبوو کردبوومە بەرم. دەستم نایە نێو پرچەکانم و بە دەست لێك ولووسم کردن.

باوکم لەتەك ئەودا قسەی دەکرد، هیچیان لێ تێنەدەگەیشتم.

دایکم کەشەفی چا بە دەستەوە لەبەر دەرگەی هۆدە چاوەنواری من بوو. سەرێکم لێ بادا. لێم ڕامابوو. هەروا سوور بوو لەسەر مەبەستەکەی. لێی قەلس بووم، بۆ تێناگا کە ئەمن ناتوانم کەشەفی چا بەدەستەوە بگرم و بیگێڕم. ئاخر ئەوەدەمە کاتی خولقکردنی چا بوو؟ خۆ بۆ خوازبێنی نەهاتبوو. هاتبوو؟ لە جیهان وردبوومەوە، ڕووی لە باوکم بوو و لە ڕاستیدا هۆشی لای من نەبوو. دایکم هەروا چاوەنوارِ وێستابوو. چاوی لێم دەکرد و بە ئاماژە تێی دەگەیاندم کەشەفی چای لە دەست وەرگرم. بۆ تێنەدەگەیی کە ناتوانم لە جیهان نزیك کەومەوە و چای خولّق بکەم. ئەگەر پوورە ماه لێرە بووایە...

باوکم لە کۆخەکەی دایکم تێگەیشت. هەستا کەشەفەکەی لێوەرگرت. دایکم مۆڕەیەکی لێکردم و ڕۆیی. باوکم چای لەپێش جیهان ڕاگرت. جیهان بە ئاخێز و بەدەم سپاسەوە چای هەڵگرت. باوکم ڕووی لەمن کرد و پرسی چای دەخۆی؟ سەرم بادا. هەم ئەو بزەی هاتێ و هەم جیهان.

دایکم هات لە پاڵم دانیشت و بەم مەبەستە کە من هۆشم وەبەر بێتەوە وتی: بەڕێز جیهاندار حەوتوویێکە لە پاریس گەڕاوەتەوە.

جیهان وتی: ببوورە لەخەوم هەستاندی، نەمدەزانی...

دایکم گوتی: شیرن هەموو رۆژێ لەم کاتەدا لەزانکۆیە. ئەورۆ پشوودانە. ئەگینا خۆ ئێستا جەنگەی نوستن نیە.

نەمدەزانی دایکم بۆچی داوای لێبوردن دەکا. ئەوەی کە خەوتبووم و هەڵیستاندبووم ئیتر حەوجەی بە لێبوردوویی نەبوو. لەمەڕ ئەم لەخەو هەستاندنەم ئامادەبووم ئیتر تا هەتایی نەخەوم.

لەکاتی ماڵاوییدا دایکم بە مەبەستی ئاگادار کردنەوەی من ئاماژەی بە گوڵەکانی کرد. ئەمن کە هەروا گێژو هوڕ بووم، جیهان وتی: دوانیوەڕۆ تەلەفۆن دەکەم.

دوای ڕۆیشتنی ئەو، هەرکە دەرگە داخرا و بەر لەوە دایکم بتوانێ قسەیەك بکا چوومە ژوورەکەم و هەتا ماوەیەك وڕو کاس بووم.

باوکم بە هۆی ئازایەتی و سەربەخۆییەکەیەوە دڵی گرتبووی. هاتبوو و خۆی ناساندبوو و پاشان وتبووی هەرچی دایکم و باوکم گەرەکیان بێ و من حەزم لێی بێ جێبەجێی دەکا. تەنیا ویستبووی بەر لەوە دایکی تێبگەیەنێ، لەگەڵ بنەماڵەی ئێمە ئاشنا بێ و ڕازییان بکا.

باوەڕم نەدەکرد لەم دنیایەدا کەس ورەی ئەمەی بووایە تەنیا بێتە خوازبێنی. ئەویش لەسەر لەبەیانییەکی بەم زوویییە. ئەم سەربەخۆییەی تا بە ئیمڕۆکەش هەروا پاراستووە. سەربەخۆییەکەی ئێجگار بە حێوەتە. تا ئەو ڕادەیەکە زۆرجار وەختە لە دەستی شێت بم. رۆژنامەکرینەکەشی هەر لە سەربەخۆیی یەکەیەتی. ئەم تایبەتمەندییە ئەوی لە دیتران هەڵاواردووە، بەڵام بۆخۆی زیادە لەهەر شتێك پێی بەستراوەتەوەو تەنانەت ئامادە نیە لە تۆزقاڵێکی خۆش بێ.

*بە دنیایێك خۆشییەوە هاتم ئەم هەواڵەت*
*پێ بدەم. بەڵام هەرکە ڕوو بە ڕووت وێستام*
*تەنیا چاوم لێکردی و لێوەکانی خۆمم کرۆشت.*
*تۆ لەمن ڕامابووی و بزەیەکت نیشتبووە سەر*
*لێو کەچی لێی تێنەدەگەیشتم. ئەو بزەیە بێشك*

*ڕواڵەتێکی لە شادییەوە پێوە دیار نەبوو.*
*بزەیەکی خەماوی بوو؟ تێناگەم...*
*مانای خەمم لەو ڕۆژانەدا هەست پێنەدەکرد،*
*یەکێ لە بەختەوەرترین مرۆڤانی ئەم*
*سەرزەوینە بووم و بزەکەی تۆ کە نە ناوێکم*
*بۆی دەدۆزراوەو نە واتایەك، هێرِی دەکردم،*
*بەلاّم وازی لێ نەدەهێنام...*

لە بنەماڵەی ئێمەدا ژمارەی هاوسەرە بەختەوەرەکان فرە نین. ناسیاوی من لەگەڵ جیهاندا گشتیانی خستبووە ئەم بیرەوە کە بەڵکوو ئەمن ببمە دەسپێکی بەختەوەرییەکی نوێ لەنێو بنەماڵەکەماندا. سەرەتای پاژێکی دیکە لە ژیانی پاپا و خانم خانمێدا. ئەوان ئەویندارى یەکتر بوون. دیارە پاپا بیرکردنەوە لە هەر ئەوینێکی لە زەینی مندا دەشۆردەوە. تێنەدەگەیشتم خانم خانمێ چۆن دەشێ خۆشی بوێ.

پوورە پەری ئەگەر پاپا لێی گەڕابا دەشیا بەختەوەر بێ. شووێیکی دیکەی بۆ پەیدا بوو کە پاپا بەدڵی نەبوو. دژایەتی پاپا تەنیا بەم هۆیە بوو کە پوورە پەری کەیفی بەو پیاو دەهات. هەتا ئەو جێیەی من لەبیرمە دەکرێ بێژم هەموو دەورو بەرەکانمان دژی ئەوین بوون و بە پێچەوانەی خوو و خدەی کۆمەڵگایان دەزانی. ئەویندارانی یەکتر هەتا ئەو جێگەیە بۆیان لوابا لەخەڵکیان دەشاردەوە. ئەوین هەستێك بوو کە جێی خۆی بوو هەروا لە بێدەنگیدا بمێنێتەوە. بنەماڵەی ئێمە، کەس و کار و دۆستەکانمان قەت دانیان بە خۆشییە ڕاسەقینەکان و نهێنییەکانی ژیاندا نەدەهێنا. تەنانەت پێکەنین و شادبوون لەگەڵ ترس و دڵەڕاوکێ ئاوێتە بوو. تەنیا کەسێکی کە لە تریقەی پێکەنینەکەی نەدەترسا نەنە دەدری بوو، نەنە دەدری پێدەکەنی، دیتران کەیفیان بە پێکەنینەکانی ئەو دەکرد، بەلاّم هەر لەو کاتەدا بەری شاد و بەدەماخ بوونەکەیان دەگرت. ئەگەر ڕۆژێك لەسەر دەماخ نەبووایە هەرخوا دەیزانی ڕۆژگاریان دەبوو بەچی.

هەڵەی پوورە پەری لەوە دابوو کە ڕازو نهێنی دڵی خۆی لەقاو دابوو. خوشکم دڵی دۆڕاند، هەموو پێمان زانی، بەلاّم کافر بەحاڵمان نەبێ ئەگەر لە شوێنێ لەقاومان دابا. پوورە پەری بە دوای شین و گرینێکی زۆرەوە وتی چش لە هەرچی شوو و ئەوین و ئەویندارییە و مەیلی ئەم گشتە ژیانە خۆشەی دانا.

پووره ماه که ئەمەی بیست وتی: چاوی دەرێ. یەکێکی عورزەی نەبێ دەبێ چاوەڕێ بێ و لێگەڕێ دیتران هەڵوێستی بۆ بگرن. پەرویز خانیشی هەرئاوا بەم چەشنە لەخۆی تۆراند.

دایك و باوکم ژیانێکی جێی ستایشی کۆمەڵگایان بوو. ژیانێکی ئاسایی که دەکرا له دێرێکدا شی بکرێتەوە. له سەردەمی منالێمدا کێشەکەیانم دیبوو. دواتر هێمن تر بوونەوەو دەتوت ئیتر سەردەمی کێشەکانیان کۆتایی هاتبوو. بەڵام جارێکیان له دایکمم بیست که به پووره پەری وت: ئەگەر شوێنێکم بووایه سەعاتێك لێره بەند نەدەبووم.

متمانەم به هیچ یەك له وتەکانی نەبوو، هەنووکەش دەتوانم تووك و نزایەکی که دەیکرد بیر بخەمەوە. سەرەڕای ئەوەی له واتای نەدەگەیشتم، بەڵام هەستم بەو بێ هیوایی و ئازارەی دەکرد که له دەنگەکەی دابوو و هەموو ڕۆژێ که له قوتابخانە دەزۆریامەوە ترسم له ڕۆیشتنی بوو. بەڵام له خۆمم نەدەپرسی بۆ کوێ؟

فاختە دەڵێ: هیچ دەزانی مرۆڤ به پێی ڕەوتی زەمان ورەی خۆی لەدەست دەدا. کەسێکی خۆی به بەندەی خوا نەزانێ ئیتر خۆیشی ناناسێ. چەوتترینی ئەوانه ئەمەیه که وا لەگەڵ ئەم چاوپۆشییانه رادێی که بۆ خۆشت تێناگەی چۆن گیرۆدەیان بووی. ڕۆژێك چاو دەکەینەوە دەبینین که ئیدی بۆ هەموو شتێ درەنگ بووه.

بۆ زووتر هەڵوێستت نەگرت؟ دوای سی ساڵ تازه وەخۆ کەوتووی؟ بۆچ تا ئێستا بێدەنگیت لێ کردووه؟

-لەبەر منالەکان. حەزم نەدەکرد ئەوان خەساریان وێکەوێ. سەرەڕای ئەمەش بۆ کوێ چووبام؟ ئێستاش منالەکان پێگەیشتوون دیتم ئیتر بەم تەمەنه بەسەرچووه.

-تکایه واز لەم قسانه بێنه، چیه تەمەن بەسەرچوونی چی؟

-کۆتایی تەمەنه ئیتر، هەموو شت دژواره، دژواره بەتایبەت ئەگەر تۆ گەرەکت بێ.

-له تۆ ناگەم، مەگین تۆ نەت دەویست. واته ئەو دەیخواست؟

-نا، گیانەکەم. ئێره ئێرانه. وڵاتی گوڵ و بولبول. هەمووشت سانایه به مەرجێ که پیاو بیەوێ و پووڵەکەشی ببێ. ئەگەر پیاو حازر نەبێ خۆشت بکوژی چ به چ ناکەی. ئەوه پیاوه کەقسەی دەڕوا.

تەڵاق له گشت شوێنێ پڕ له چەرمەسەرییه. مرۆڤ بتوانێ ڕێگەچارەیەك بدۆزێتەوە، ئەشێ تاقی بکاتەوە.

-ڕێگەچارەی چی؟ چی وای نەمابوو ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزییەوە. لەمێژ بوو هەر بە کردەوە لە ماڵێ نەدەژیا. ئاپارتمانێکی بۆ خۆی دروست کردبوو و زۆربەی کاتەکان هەر لەوێ بوو. هەمیشە لەپێشدا لە شەوێکەوە دەست پێدەکا. پاشان گشتی شەوەکان. من و منداڵەکانی وردە وردە لە ژیانی خۆی جیا کردەوە. ئەویش بۆ ئەمە کە بتوانێ پێشان بدا کە ئەم کارە شتێکی خاسە.

-شتێکی خاسە؟

-لە ڕوانگەی خۆیەوە. هەرشتێکی زۆر دووپات بکەیەوە دزێوییەکەی خۆی لە دەست دەدا. ئەمە سووکایەتی بە کەسایەتی و هۆشی من نەبوو، ئەگەر ڕاوەستابام؟

ئەتۆ دەتوت هەر لە سەرەتاوە بە چارەنووسی ژیانی خۆتت نەدەزانی. تا ئەوەی کە من لەبیرم بێ لەپێشدا نەیهێشت بچیە ڕادێو. دوایی کە منداڵت بوو حەوتووی سێ ڕۆژ دەچوویە سەرکار.

بە پێکەنینێکی تاڵەوە وتی: دواتر کە دووهەمی و سێهەمی و چوارەمیان لە دایک بوو، بە یەکجارەکی وازم لەکار هێنا. هەتا ئێستاش هەر بە بۆنەی منداڵەکانەوە بووە، دەنا ڕۆژێکیش بەند نەدەبووم.

-دەتوانی یەکێك پەیدا بکەی چاوەدێری منداڵەکان بکا. نەتدەتوانی؟ و کارەکەت لەکیس نەچێ.

-لەگەڵ کەشوهەوای خەستەخانە ڕێك نەدەکەوتم. لە خەستەخانەدا بە گشتی لەمە گەیشتبوون کە بە ڕێز دوکتۆری پسپۆر و مامۆستای زانکۆ و خوێندەواری ئامریکا بۆیە گەرەکیە پێی هاوسەری لە خەستەخانە ببڕێ هەتا ملۆزمێك نەبێ بە ئاکارە سووك و چرووکەکانی بزانێ. لە پەرستار و نەخۆش و هاوڕێیانی نەخۆش و کاربەدەستانی خەستەخانە هەرکەس ویستبای دەیتوانی سەر و سڕڕێکی لەگەڵیدا هەبێ.

دەیوت: ژیانم بە گشتی تەرخانی منداڵەکان کردووەو هەمیسان حازرم هەرچی هەمە پێشکەشی بکەم، حەزم نەدەکرد هیچ کامێکیانم هەبووبا. هیچم لەو پیاوە نەبووایە.

دەزانی، یەکێك لە هەڕەشەکانی ئەوەیە کە ئەگەر داوای تەڵاق بکەم قسەیەکی نیە بەڵام دەبێ واز لە منداڵەکان بێنم. ئەو دەرسەکەی زۆرچاك دەزانێ.

-ئەمە هەزار ڕێگەی هەیە.

-ئەوە ئەتۆی کە پێت وایە هەزار ڕێگەی هەیە. لێرە لەو شتانە نیە. ئەگەر بیانەوێ کلکت دەگرن و وەك مشکی تۆپیو تووڕت هەڵدەدەن.

-مەگین لەسەر ڕێگا تۆی دیوەتەوە هەرچی پێی خۆش بوو بیکا؟

-دایك و باوکیشت ناتوانن کارێك بکەن، ئەویش ئەگەر خۆیان بیانەوێ، چونکە ئەوان زۆرتر لایەنگری سووتان و ساچیانن، کارێك ناکەن. هەر دەتوانن بڵێن، ماڵ و ژیانێکی بەم تێر و تەسەلییەت هەیە و هیچی لەتۆ وەچاو نیە. کەوابوو دانیشە و نووکەت نەیە. هەتا ئێستا لەبەر منالەکان ددانم بە جەرگم داگرتووە، ئەی پاشان دەبێ چ بکەم. ژیان بە بێ رادیۆ و بە بێ کار دەگونجێ. بەلام بە بێ منالەکان بۆم بووز ناخوا. بڕۆ شوکری خوا بکە کە هەر ئەو یەکەت هەیە.

دەڵێم: ئاواتم بوو منالی زۆرم ببێ، بەلام بیرو ڕای جیهان پێچەوانەی ئەمە بوو. ئەو لای وابوو لەم دنیا بێ سەرە و بەرەیەدا بوونی منال تاوانە. ستارەش هەر ئەم بیروڕایەی هەیە و دەڵێ قەت منالی نابێ. بەلام بە بڕوای من جوانترین و لەبارترینی مالەکان شوێنگەلێکن کە منالی زۆریان تێدابێ و لەهەر کەلێن و قوژبنێکەوە دەنگیان ببیسرێ.

شووە دارەکەی منیش حەزی لە منالی زۆر بوو. دیارە ئەو وەك تۆ پێی وانەبوو سەفای مال لە قیژە و هەرای منالاندایە. ئەو بە ئاواتی کوڕ بوو و ئەگەر چوارەمین منال کوڕ نەبووایە دەبا هێندە زابام هەتا یەکیان کوڕ بێ.

ژیانی ناهیدی خوشکم پێچەوانەی ژیانی دایکم بوو. ئەو سەعاتە زۆرەکانی کاری شووەکەی لە دەرمانخانەو تەنیا مانەوەی لە ماڵدا، پێ ڕاگەیشتنی منالان بە یارمەتی دایکم و نەنکەکان. گشت شتێ بێ هیچ کەم و کووڕییەك هەروەك خۆی بوو. و هیچ شتێکی بۆ من جێی ئێرەیی نەبوو.

بیرم لەمە دەکردەوە کە بۆچ ناتوانین وەك پوورەماه و غولام خان بین. وەك ئەوانەی کە منالێکیان نەبوو بەلام سەر لەبەری ژیانیان لێوڕێژ بوو لە بەختەوەری. ئەو شەوانەی کە لەپاڵ یەکتر دادەنیشتن و بێ هیچ قسەیەك هەتا چەند سەعات هەر کتێبیان دەخوێندەوە. غولام خان هەرچەند جارێك چایەکی بۆ پوورە ماه تێدەکرد و لەپێشی دادەنا و پوورە ماهیش چاوێکی لێدەکردو پێدەکەنی. هەرکە بە بەر غولام خاندا تێدەپەڕی دەستی لەسەر شانی دادەنا، کە لە لای دەوێستا پالی وێدەدا. چەندە ئاواتم بوو ژیانێکی وەك ئەوانم بووایە. بۆ نەمدەتوانی وەکوو ئەوان بم، چ شتێ بەرگری ئەم کارەمان بوو؟

*بەختەوەری بۆمن لە پاڵ تۆدا بوون و گێڕانەوەی*
*چیرۆك بۆ هەورەکان بوو. لای تۆ دانیشتن و*
*لاواندنەوەی لووسی بوو، ئەوکاتانەی کە دەستە*
*چکۆلەکەت دەنایە سەر دەستم و گوێییەکانی*
*لووسی قوت دەبوونەوە و پرخە پرخی دەستی*
*پێدەکرد و بێدەنگ...*

بەڵام جیهان دنیاێیکی دیکە بوو. هەر ئەمە، تەنیا ئەمە.

زەماوەندی ئێمە هەر لەو هاوینە دا بەڕێوە چوو. دایکم لەوەی کە دواجار منی بە شوو دەدا لە خۆشیدا حەجمینی نەبوو.

پوورە پەری دڵی خۆی دەداوە کە پێدەچێ نیگەرانییەکانی لە بابەت دەربەدەربوونەوە هەڵە بووبێ و چوونە ئورووپای ئێمە کەم خایەن دەبێ.

باوکم پرسی: ئەدی ئەو یەکساڵ دەرسەی کە خوێندوومە چی لێ بەسەر دێ؟

جیهان لە وەڵامدا وتی: ئەوێ باشترین و لەبارترین پێداویستییەکانی خوێندنی لێیە. دەرسی شووریدە و خولی کارەکەی من تەواو بێ دەگەڕێینەوە ئێران.

پوورە ماه هێمای ئەوەشی کرد: لەوێدا تەنیایی و غەریبایەتی، نەزانینی زمان و نەناسینی ئاقار و دەوروبەر زۆریش سانا نابێ.

دەیوت: دەبێ بابەتەکان بە چاوانی کریاوەوە ببینم. دەبێ خۆم بۆ تەنیایی و بەربەرەکانێ لەتەك دژوارییەکاندا تەیار بکەم. نابێ لام وابێ ئەوێ بەهەشتێکی بەرینە. سەرەڕای ئەوەی کە لەو جێگایانە نەبووە، بەڵام دەزانێ ژیان لە گشت شوێنێکی ئەم دنیایەدا لە هێندێ لایەنەوە شێوەی یەکتر دەدەن و بەداخەوە ئەم وێکچوونانە لە گرفتەکاندا فرەتر لە خۆشییەکانن.

غوڵام خان دەیوت ئەگەر لەم گرفتانە بگەم و لەگەڵ پێداویستی و باشییەکانی ئەو کۆمەڵگادا هەڵیانسەنگێنم، رەنگە خۆڕاگرییەکەی بۆم ساناتر بێ.

پوورە ماه کە لە چاوانم را زانی ترسم لێ نیشتووە وتی: پێ زانینی ئەم شتانە بۆ نیگەرانکردنی تۆ نیە. بۆ دانی ئاگاداری زیاترە.

ئەوان تەنیا کەسانێك بوون کە دەیان وت نابێ هەموو ژیانم تەرخانی قومـاری ئـەوین بکەم. بوونی خەیاڵ و لە خەیاڵ دا ژیان شیرینە. مرۆڤی بەهێز بە وریایی و لێهاتووییەوە دەتوانێ وێنەیەکی ڕاستەقینە بدا بە خەیاڵەکانی و نەهێڵێ ئازارەکەی بە چۆکی داهێنێ.

گـوێم لـە قسـەکانی دەگـرت، و هـەر لەوکاتەشـدا هەسـتم دەکـرد دەتـوانم بەسـەر دژوارییەکاندا زاڵ بم. لەو سەردەمدا متمانەم بە هیچ دژواری و گرفتێك نەبوو و باوەڕیشم بەمە نەبوو کە دنیا لەمەی کە هەبووە دەشێ جوانتر بێ. ئـەوان لـە بابەتگـەلێکی ئـەم دنیایە دەدوان کە خۆیان نەیان بینی بوو و دان پیانانیشی بۆ من دژوارتر بوو.

هەستم دەکرد ڕەزامەندی کەس و کارم بەر لەهەر شتێ لەمەدایە کە یەکێك پەیدا بێ دەستم بگرێ و لەتەك خۆیم ببا. بە گشتی لەسەر ئەم ڕایە بووین کە دەچمە شوێنێکی کە بە باشترین شێوە دەستم وە هەموو پێداویستییەکانی ژیان ڕادەگا و لەمە بـە دواوە لـەو پەڕی بەختەوەری و کەیف خۆشی دا دەژیم.

دەچوومە شوێنێکی کە هیچ چەشنە ناسیاوییەکم لێی نەبوو، بەڵام نازانم بـۆچ پێمـان وابوو هەر کە لاقم نایە ئەوێ هەرچی دڵنیـایی و بەختەوەرییـە لام لێدەکەنـەوە. ئەگـەر گەورەترین حێوەتی مرۆظ بەرەوڕوو بوون لەتەك نەناسیاوی یە، ئەی بۆچ چـوون بـۆ ئـەو شوێنە بۆ ئێمە ببوویە بەختەوەرییەکی مەزن.

باوکم کە بە ماوەیەکی کورت لە ئاڵماندا ژیـابوو چـووکترین ئاگـاداری پـێ نـەدام و ئەوەی لە بیرەوەرییەکانیشی لە زەینمدا بوو، ئەو پێداهەڵگرتنانە بـوون کـە لـە ژیـان و نێعمەت و پێشکەوتەکانی ئـەو جێگایانـەی کردبـوو. پێداهـەڵگرتن و پەسـندێکی کـە بیرهێنەرەوەی دواکەوتوویی و لە ئاکامدا بچووککردنەوەی ئێمە بوو.

هەستم دەکرد کە هەموو ئێرەیی بـە مـن دەخـۆن، ئێرەیـی بـەو هەلومەرجـەی بـۆم ڕەخساوە. بەم پێیە هیچ شتێ منی بۆ ژیانێکی تەواو جیاواز کە خۆم لێی تێگەیشـتبووم تەیار نەدەکرد. ئەگەر ئەوین و ئەویننداری و هێزو توانای گەنجایەتیم نەبووایە نازانم چـۆن دەمتوانی لەتەك دژوازییەکانی ژیانی غەریبایەتی ڕابێم. بەڵام ئەوەی کە لە پاڵ جیهاندا هەستم پێدەکرد تەنیا ئەوین بوو. ئەگەر لە هەمووی ئەو کاتانـەدا بـە هـۆی تـەحل* و تووش بوونی غـەریبایەتی و شێوەی جیاوازی ژیان و کەم و کووڕییەکانی ژیانی خوێندکاری دڵم چێك دەبوو، جیهان لەوێ بوو و گشتی ئەمانەی بۆم قەرەبوو دەکردەوە.

فاختە لە رۆژی زەماوەندمدا دەستەکانی هەڵدەگلۆفی و دەیوت: ئیمڕۆ یەکێ لە خۆشترین رۆژەکانی ژیانمە.

چاوی دەبریسکایەوە. سەمای دەکردو پێدەکەنی و سەد ئەویندار و خوازبێنیکەری پەیدا کردبوو. رۆژی دواتر وتی: قورم وەسەری، خەتای خۆمە. نەدەبووا ئیزنم دابا هاموو شۆی ئێرەی کردبا و ئەتۆی لە داو خستبا و ئاوا تەنیام بهێڵییەوە. ئێستا بە بێ تۆ چ بکەم؟ لەسەر کێ ببۆڵێنم، دەردی دڵم لای کێ هەڵڕێژم و چۆن بچمەوە بۆ قوتابخانە؟

خانم خانمێ هەر ئاە و ناڵەی بوو. خەمی مناڵەکانی زۆر لەبەر بوو. بەم باوەڕەشەوە کەمن دەسپێکی بەختەوەرییەکی نوێ بم دڵی خۆی دەداوە. پاپا هەروەك مناڵەکانی دیکەی، یەکێك لە پەڵە زەوییەکانی گوندی بە ناوی من کردو بە درێژایی بەرێوەچوونی رێو رەسمەکە هەر پرتە و بۆڵەی بوو کە: ئەو کوڕەش ئەمە کارە کردوویە. ئێستا کە کارمان پێیەتی خۆی لێ ون کردووین.

پوورە ماه لە تەواوی ئەم رێ و ڕەسمەدا هەر فرمێسکی هەڵوەراند. هۆی گریانەکەییم کە لێ پرسی وتی: فرمێسکی شادییە.

پوورە پەری دەگریا و پێدەکەنی و سەمای دەکرد و چەندجار هاتە بن گوێم وتی: گیانی دڵەکەم خۆ هەر نەبێ ئەتۆ تۆڵەی منت ئەستاندەوە. قەدری ژیانت بزانە. چا دەکەی دەڕۆی. برۆ هەتا لەوانە دوور کەوی باشترە. برۆ، هیوادارم بەختەوەر بی.

نەنکەکان فرمێسکیان بە سووچی چارشێوەکانیان سڕییەوە و داوای بەختەوەرییان بۆ کردم. عەلی خان بە قەڵافەتە بەرزەکەیەوە سەری نیومیتر داهێناوەو پیرۆزبایی پێ وتم: ئاغاوێردیroومەتمی ڕامووسی و وتی: بەختەوەربی کیژم. خۆم گەورەمکردن و ئێستا...

دەستم خستە ملی و ڕوومەتە تاوسووتە بۆن گڵ و گیایەکەییم ڕامووسی.

*تۆ لە زەماوەندەکەمدا نەبووی، لە سەربازی*
*بووی و رۆژی بووکێنیش هەر نەهاتی، هێندە*
*بەختەوەر بووم کە دەرفەتم نەدەبوو بزانم تاچ*
*رادە هەست بە نەبوونەکەت دەکەم، رێك*
*لەوکاتە کە لە فرۆکەدا دانیشتم و بیرم لەوانە*
*کردەوە کە بۆ بەرێکردنم هاتبوون، شوێنە*
*بەتاڵەکەی تۆم هەست پێکرد، شوێنێکی کە*

*کەس نەیدەتوانی پڕی بکاتەوە. ئەودەم*
*دەگەڕێیەوە کە من ڕۆیشتووم، کتێب و*
*کتێبچەکانی یەکساڵەم تێکەوە پێچاوەو لەتەك*
*جیهاندا، ڕۆیشتم هەتا لە وڵاتێکی دیکە و*
*بە زمانێکی دیکە ژیانێکی دیکە دەست پێ بکەم.*
*ژیانێکی دیکە، لەژێر ناوێکی دیکە. لەتەك مێرێکی*
*کە ئەویندار ی بووم بەڵام نایناسم. ئاخۆ ئەو*
*من دەناسێ؟*
خەیاڵی شەوێکی هاوین.

لە شانۆدا لەپاڵ جیهان و ستارە دانیشتووم. خەیاڵی شەوێکی هاوین، یەکێ لە شانۆکانی شکسپیر پێشان دەدەن. گەرچی چیرۆکەکەم خوێندۆتەوە، بەڵام دەزانم بۆ تێگەیشتنی جوانییەکانی کەلامی شانۆکە دەبێ شارەزای زمانی شێعری شکسپێر بی. لە درێژەی شانۆکەدا هەست دەکەم هەرچەندی هەوڵی بۆ بدەم هیچی لێ تێناگەم. ئەوەی کە سەیری دەکەم نیوەی ئەو ڕاسییانەیە کە روو دەدەن. وەك کەسێکی کە شێعرە وەرگێڕدراوەکانی حافز بخوێنێتەوە.

بە خۆم دەڵێم لەکاتی گەڕانەوەماندا شانۆنامەکانی فیردەوسی بۆ ستارە دەگێڕمەوە. لە تێراژێدیای ڕۆستەم و زۆراب. بەڵام لەپڕ پەی بە نیەتە پڕ و پووچەکەم دەبەم. مەگین دەکرێ بە بێ خوێندنەوەی شێعرەکان، جوانییەکەییت بۆ دەرکەوێ. ڕۆستەم و زۆراب تەنیا تێراژێدیایەك نیە، کولتوورێکە. چۆن دەکرێ لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بیگێڕییەوە و لە دەستیشت بێ؟ لە ژێرەوە چاوم لە ستارەیە، نوقمی تەماشایە، هەستی مەودای نێوان دنیای من و ئەو ڕامدەچڵەکێنێ.

لە هۆڵی شانۆ دوور کەوتوومەوەو بێ هیچ دڵەڕاوکەیەك خۆم دەسپێرمە دەستی خەیاڵ. ساڵەکانی دنیای رابردووی ژیانم کە نیوەی جیهانە راسەقینەکەییم هەست پێکردووە و نیوەکەی دیکەی پێوەندی بەمنەوە نەبووە. بە قامکەکانم دەژمێرم. لە دنیاییێکی کە تەنانەت نەمتوانیوە منالی خۆم بە تەواوی بەهی خۆمی بزانم. لەوەی کە ئیتر بۆم نەدەکرا بیرەکانم بەزماندا بێنم جاڕز و شەکەت بووم. ئەوەی دەمووت، لە هزروبیرمەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، شتێ بوو کە چاوەنواڕییان لێم بوو. بێخەوشی ناخی

خۆم لە کیس دەدا. فێر ببووم بێبەری لە دردی دڵ بم. بڕوا هەروەکوو سلامەتی وایە کە لە کیس چوو وەدەستهێنانەوەی دژوارە. ناخم بێ بیرو بڕوا دەمایەوە.

*لەخۆم دەپرسم بۆچ ناتوانم دڵ بە شتێ بدەم؟*
*چ شتێ بەرگری ئەم دڵدانەیە؟ ئەو رۆژنامانەی*
*جیهان کرپیونی و وەك بەربەست لێکمان جیا*
*دەکاتەوە؟ یا ستارە کە بەشێك لە جەستەمەو*
*چەشنی ئەستێرەکانی ئاسمان لێم دوورە؟ یا*
*ئەوەی کە هیچ کاتێ بە دروستی لەمە*
*نەگەیشتووم ئۆگریم بەچ شتێ پەیدا کردووە...*

## ( ١١ )

شەمەندەفەر بە ڕەخ پێدەشتە سەر سەوزەکاندا تێدەپەڕێ، گشت شوێنێ بــە ڕادەێــی ســەر سەوزە هەر کە سەیرییان دەکەم هەست دەکــەم چــاوەکانم ســەوز دادەگــەڕێن. لــە جیهــان ورد دەبمەوە. چاوەکانی سەوزن، سەوزی سەوز. چاوەکانی من هەر وەك قیل ڕەشی ڕەشن.

*تۆ دەتوت بەم چاوە ڕەشانەوە چۆن دەتوانم*

*دنیا ببینم...*

بێ هیچ ڕاوەستانێك بە ئێزگەیــەکی بچــکۆلەدا تێدەپــەڕین. ئافرەتێــك لــە ســەر قەنەفــە دانیشتووە چاوی لە شەمەندەفەرەکە بڕیوە. هێشتا تەواو نەگەیشــتووینەتە لای کــە ئاخێزێــك دەکاو کە دەبینێ شەمەندەفەر تێدەپەڕێ، دادەنیشێتەوە.

ئافرەتێکی گەڕاوەیە. پرچەکانی لەپشــت ســەرییەوە گولۆلــە کــردوە. پێســیری پاڵتۆکــەی هەڵێناوەتەوەو شانەکانی لە سەرمادا وێك هێناوە. جانتاکەی لە باوەش گرتووە. جۆرێ لێمــان دەڕوانێ، وەك نەمانبینێ وایە. تەنیا هەر ئەو لە ئێزگەدایە.

سی و چەند ساڵە شان بە شانی جیهان ئەم شار ئەوشار و ئــەم وڵات و ئــەو وڵاتم کــردووەو بیرم لە پوورە پەری کردۆتەوە کەلە خــەمی دەربــەدەری مندایــە. ســاڵانێکی کــە ڕۆژ بــە ڕۆژ دوورتر دەبنەوە. ساڵانێکی کە دەمتوانی دەرگەی ژوورەکەم داخەم و هێندە دەنــگ بــە رادیــۆ بدەم کە دایکم هاوار بکا: ئەگەر لە بیری من دانی، بیر لە هاوسێکان بکەوە.

ساڵانێکی کە دەمتوانی چەندین سەعات سەر بەسەر کتێب دابگــرم و بــێ ئــەوە وشــەیەك بخوێنمەوە لە ناخی خەیاڵەکانمدا ڕۆبچم و خەمی هیچ شتێکم لەبەر نەبێ. ساڵانێکی کە لێوڕێژ بوون لە خەم و خوشحاڵییە بچکۆلەکان.

*ساڵانێکی کە تۆ هەمێشە لەچەند هەنگاوی*

*مندا بووی...*

بیرکردنەوە لە سی وچەند ساڵ لەمەوبەر خۆی تەمەنێکە، بازنەیەکی داخراو و تەواو، کە دەکرێ لە هیچەوە بگا بە هەموو شتێ و لە هەموو شتێ بە هیچ شتێ.

فاختە لە پشت تەلەفۆنەوە وتی بۆ زەماوەندەکەی دەبێ بگەڕێمەوە تاران. وتم: نەدەکرا نەختێ زووتر ئەم هەواڵەت پێدابام؟

بەرەو ئامریکا دەچووم و باوەڕم نەدەکرد لە زەماوەندەکەیدا نیم. ئەو نەختە کەلوپەلەی کە هەمان بوو کۆمان کردبۆوە. بڕیار بوو خانووەکە دوو حەوتووی دیکە بدەینەوە.

هەڵەکە لە منەوە نیە. هەر لەخۆوە لەپڕ هەڵوێستمان گرت.

پرسیم: هەر بەڕاستی چۆن رازی بووی، خۆ ئەتۆ؟

مامۆستاکەمان دوکتۆرێکی دەرمانساز بوو کە تازە لە ئامریکا گەڕابۆوە. ئاین و ئۆینی زۆر بوو. ئاین و ئۆین هەر لە هێندێ کەس دێ بەڵام ئەو هیچی لێ نەدەهات. هەر لە یەکەم حەوتوودا کە چاوی بە فاختە کەوت ئاشقی بوو و لەسەر کەلاسدا سێرەی لەسەر هەڵنەدەگرت، مناڵەکان تێگەیبوون و گاڵتە دەستی پێکردبوو و فاختەش لەم شتە زۆر بێبەری نەبوو.

وتی: چۆن سەرم لە دەست قسەی ئەم و ئەو ماسابوو. کابرا دەستهەڵگر نەبوو. دواتر دیتم ئەگەر دەرسێك بخوێنم و نمرەیەك وەرگرم، دەڵێن ئەو نمرەی پێداوم. سبەی ئەگەر دوکتۆراکەشمان وەرگرین هەر دەڵێن بە یارمەتی ئەو بووە. سەرەڕای ئەمە رۆژێ نەبوو یەکێك نەیە و نەخوازێ مەیلی پێبدەم.

چاوەنواڕی ئەمەی باوەڕ بکەم کە لەمەڕ نمرەکانتەوەیە شووی پێدەکەی؟ پێت وایە ئێستا کەسێك پێی وایە نمرەکان هەمووی هەر ئەو پێتی دەدا. بۆ لەبری ئەم وتانە دەق و دۆغر ناڵەی ئاشق بوویە؟

-نا، کەر بوومە.

-دەڵەی چاوەنواری ئەوەت لێم بوو تاران بەجێ بهێڵم.

-ئێستا بە پێچەوانەی ئەمەوە دەتوانم بێم و ئەتۆ ببینم.

-جارێ ئەوە خەریکم لێرە دەڕۆم؟

بۆ هەر شوێنێکی ئەم دنیایە بچی پێ و شوێنت دەگرم. ئاخر کابرا لە ئامریکا خوێندوویەتی، لەبیرتە بەردی ئەوێی لە سینگی دەدا. پێشی ناخۆش نیە بگەڕێتەوە، یەکجێ دیتت سەرو کەلارەی ئێمە لەو لایانە قووت بۆوە. ئەودەم ئیتر دەتوانم بلێم زۆریش کەر نەبووم.

دەتوت ئەوە باڵم دەرکردووەو ئامریکام وەك بەهەشتێکی بەرین هاتە بەرچاو.

وتم: باشە ئەدی بۆ زووتر دەنگت نەکرد. کەی دێی؟

وا دەڵەی کەی دێی کە لات وایە لە فرۆکەخانــە دانیشــتووم. بــەڵێنی داوە لــە نــزیکترین دەرفەتدا سەفەرێکی ئەولایانە بکەین.

باڵەکانم هەڵوەرین و ئاسۆی ئامریکا تاریك داگەڕا.

وتم: چاو ئەمن چەندە خۆش خەیاڵم. وادەی سەرجێخوونی پێداوی.

وەك گوێی بەم وتانە دانەچووبێ وتی: لەڕاستیدا ئەگەر ئەتۆ بەشــدار نــەبی هــەر وەنــازانم زەماوەندم کردووە.

-باشە دەبووا زووتر ئەم بیرەت کردباوە.

بە قامکی تەققەیەکی لە تەلەفۆنەکە هێنا: ئێستا دێی یا نا؟

-دەنگەکە زۆر چاك دەبیسرێ و ئەتۆش لە پشــت تەلــەفۆن گــەرم داهــاتووی. چــۆن بــێم؟ جیهان بیتاقەکەشمانی وەرگرتووە. ئەودەم کە ئەتۆ زەماوەندتە ئەمن لەســەر زەریــای ئەتلــەس لەنێو فرۆکەدام.

ئەمەشیان خەتای منە. ئەگەر وەشوێنم نەکەوتبای. ئەگەر لەسەری کووچەکەماندا ئــەوت نەدیبا، نە دەتناسی و نە بە دەوری دنیادا دەگەڕای. نە ئێستا بەم ڕادە لەمن دوور دەکەوتی.

-ئەوەی کردم بۆ خۆم لە خۆمم کرد.

ئاخێکم کێشا: چەندە گوتم لێمگەڕێ، وازم لێ بێنە، دەست هەڵگرە؟

پێکەنی: ئا، لێگەڕێ با هەروا دوورەپەرێزبم...

پاشان پرسی: مەگین جیهان نەیوتبوو دەگەڕێینەوە ئێران، ئەدی کەی دەگەڕێنەوە؟

-ئەم رۆژانە کەست پێ شك دێ سوور بێ لەسەر قسەی خۆی؟

-ئەگەر کەسێکت دییەوە بە منیش بڵێ.

جیهان وتی خەڵکی ئێــران لــە بەرنامــە دارشــتن ناگــەن. پێیــان وایــە دیــتران بەرنامــە و ژیانێکیان نیە و هەرکات گەرەکیان بێ دەبێ حازر بن.

وتم: فاختە وا ناڵێ. سەرەڕای ئەمە ئەوەی کە مــرۆظ دڵــی شــتێك بخــوازێ و چــاوەنواڕی شتێکی هەبێ، دوو بابەتی جیاوازن.

سەری بادا: هەربۆیە دەڵێم: نەدەکرا زووتر ئاگاداری کردبایەوە؟

ئەوکاتە کە بەسەر زەریای ئەتلەسدا دەفڕیم، دڵم لە تاران بوو و سات بە ساتی زەماوەندەکەییم دەهاتە بەرچاو، ئەو لەگەڵ کەسێکی کە قەت بیرم بۆی نەدەچوو و نەمدەزانی چۆنە پێك هاتووە؟

فاختە قەت نەهاتە ئامریکا و فەڕانسە و ئینگلیز و مامۆستای بەڕێز بە هیچ کلووجێ بەڵێنییەکەی نەدەبردە سەر. دیارە سەفەرەکانی هەروا بەردەوام بوو، بەڵام فاختە دەبووا بمێنێتەوەو بە ماڵ و مناڵەکان ڕابگا. یەکەم پێ گرانییەکەی چەند مانگ دوای زەماوەندی بوو. ئیتر نەدەچوویە زانکۆ. دەیوت: لەو بارەی پێم ناکرێ. ئەویش پێی خۆش نیە. جارێ خانەنشین بوومە و دەخۆم و دەنووم. خراپیش نیە.

دەتوت لەتەك یەکێکدا دەدوێم کە قەت نەمدیوە و نەمناسیوە. پرسیم: ئەی ڕادیۆ؟

بە بێ وازی پێکەنی و وتی: لەمێژە کاری تێدا ناکەم. رازی نەبوو.

هەر لەخۆوە وتم: جا ئەو لەچی رازییە؟ خۆت وتەنی هەر دەڵێی دەسەڵاتت تەنیا بەسەر دایکت و براکەتدا دەشکا. بەستەزمانانە ورەی قسە کردنیان نەبوو. لەبیرتە؟

-ئاخر ئەوە شتێکی دیکەیە. کەش و هەوای ئێرە لەگەڵ ئەوێ جیاوازە.

-بێرە و بەوێ چی، مەگین خۆی لەم لایانەی نەخوێندووە. دەڵێی سێحرت لێ خوێندراوە یا شتگەلێك لە ئارادایە کە پێمی ناڵێی. تۆ ئەوە نەبووی بە سانایی چاوپۆشی لە هەموو شتێ بکەی.

تۆ خۆت لەمن خراپتر بووی. لەبیرت کردووە؟ ئەتۆ لەمەڕ جیهانەوە. ماڵ و ژیان و وڵاتی دایك و باوانی خۆت بەجێ هێڵاوە.

- بۆیە هۆشداریت پێ دەدەم. پێتوانەبێ جیهانم بەدەستهێناوە؟

پێکەنی: ئا، دەزانم جیهان تۆی کردە هی خۆی.

-ئەویش زۆر دڵنیانیم. لە راستیدا بۆ دەبێ دەست بەسەر یەکتردا بگرین؟

-باسێکی جوانە، بەڵام لە پشت تەلەفۆن بۆت گران دەکەوێ. ئەگەر بیتاقەیەك وەرگری و بێی هەرزانترە.

هەر هێندەت دی هاتم.

نەمدەزانی گەڕانی دەوری دنیا لەتەك جیهاندا بەم زووانە کۆتایی نایە و دژوار دەتوانم هەرچەند ساڵ جارێك ببینم. و تا هەتایی خەم و خەفەتی ئەو ڕۆژە شاد و بێ فکرو بیرانەی قوتابخانە دەخۆم.

دەڵێن هەر زمانێك وڵاتێكی دیكەمانە. ئەمن لە وڵاتی خۆمدا هیچكات بە زمانی دایكم نەژیاوم. ئەو زمانانەی فێریان بووم شـتگەلێكی قـەرزین كـە وەك بارێـك قورسـایی دەخەنـە سەرشانم. گەلێ جار كە ئاوێتەی یەكتریان دەكەم دەبمە ئەو دەلی دۆمانەی* سیرك كـە دەوری خۆی لەبیر كردووە و دەورێك دەگێڕێ كە تایبەتی خۆی نیە.

*پرسیارێكی كە هەمیشە لەمێشكمدایە*

*ئەمەیەكە چ شتێ منی پاگیری ئێرە*

*كردووە، دەبێ لە كوێوە دەست پێ بكەم؟*

*لە دەرمانخانەكەی باوكمەوە، كە بە هۆی*

*بۆیەكەیەوە دڵت لە ژێلڵا دەهات و قەت*

*نەتوانی لەگەڵی ڕابێی و ئەمن لە سەرلەبەری*

*ئەم دنیایەدا دەرمانسازیم خوێندووە بەم*

*هیوایە كە بتوانم شێوە دەرمانگەڵێكی*

*بێ بۆن دروست بكەم و كەس بە بۆنەكەیان*

*دڵی لەخۆ نەبێتەوە...*

شەمەندەفەر لە ئێزگەیەك دەوێستێ. بۆتكەیەكی ڕۆژنامەفرۆشـی لـە روو بەرووماندایـە. باوكم لە یەكێك لە سەفەرەكانیدا كە بۆ یەكەم جار ئەم بۆتكانەی دەدی وتی: چەند باش دەبوو لە پاڵ ئەمانەدا بۆتكەیەكی دەرمان فرۆشیشیان دانابایە.

وتم: ئاخر خۆ لێرە كەس نایە دەرمان بكڕێ.

-مەبەستم نوسخەپێچانەوە نیە. دەتوانن دەرمانگەلی دژەژان كە پێویستی بە نوسخە نیـە و كەرەستەی لەشساغی بفرۆشن. كارێكی باشە. ڕمێنیشی دەبێ.

جیهان پرسی: بۆچ ئەم كارە لە تاران ناكەی؟ لە پاڵ بۆتكەگەلی ڕۆژنامەفرۆشیدا؟

وتی: بە شوێنی ئەم كارەدا چـووبوو. بـەڵام ئیجازەنامـەیان پـێ نـەدابوو. لەگـەڵی ڕێـك نەكەوتبوون. كـەس قسـەی بـە هێنـد وەرنـەگرتبوو. هێنـدێكیش كەمتەرخـەمیان كردبـوو. دەرمانخانەدارەكانی دیكە لە حێوەتی ئەمە پێش بە كاسـبییەكەیان بگـرێ، هەڕەشـەیان لـێ كردبوو كە ئەگەر وەشوێن ئەم كارە بكەوێ كارێ دەكەن ناوی دەرمانخانەكەی بە چەوتی بـڕوا. لێرەدا خاوەنداری دەرمانخانە و دەرمانسـاز بـوون لەگـەڵ ئـەوەی لـە ئێرانـدا هەیـە یـەكجار جیاوازە. لە ئێراندا هەر كەسەی دەرمانخانەی خۆی بە تەنیا هەڵدەسووڕێنێ و كڕیـاری یـەكی

زۆریش بەڕێ دەکا. لێرەدا کەسێکی کە لە دەرمانخایەك دادەمەزرێ کەمتر لەگەل کڕیار بەرەو ڕوو دەبێ. چ لە دەرمانخانەیەکدا خەریك بێ، چ لە فرۆشگەیەکدا هیچ جیاوازییەك ناکا، هەمیشە دیوارێك لە ڕێوشوێن مرۆڤەکان لێك جیا دەکاتەوە.

لە ئێراندا باوکم سەر بوردەی گشت ئەو کەسانەی دەزانی کە دەرمانیان لێ دەکڕی. دۆستان و ناسیاوانی گەڕەکەکەمان بە گشتی دەرمانیان لە دەرمانخانەکەی ئەودا دەکڕی و هەموو ئەو کەسانەی دەچوونە لای ڕێزیان بۆی هەبوو.

لێرەدا دەرمانساز کەم کەسێك لە دەرمانخانەکەیدا دەبینێ و ئیزنی ئەوەشی نیە رای خۆی لەمەڕ ئەو کەسانەوە دەربڕێ کە بۆ کڕینی دەرمان دێنە ئەوێ مەگەر پرسیارێکی لێ بکەن.

لە جیهان رادەمێنم. لە پەنجەرەوە لە دەرەوە دەڕوانێ. چی وای نەماوە شەمەندەفەر وەڕێکەوێتەوە. دەرگاکان یەك یەکە دادەخرێن. فەرمانبەری شەمەندەفەر چاو دەگێڕێ کە کەس دەرگەی کریاوەی بەجێ نەهێشتبێ. بەڕاست وچەپ دا دەڕوانێ و فیکە لێ دەدا. شەمەندەفەر وردە لەنجەیەك دەکاو هێدی هێدی وەڕێدەکەوێ. هێندە نەرم و هێدی کە دەکرێ وێنای بکەی بەسەر هێڵی روو بە ڕوودا وەڕێکەوتووە.

## (١٢)

له روو به روويدا وێستابووم و باوەڕم به بوونی خۆم لەوێدا نـەبوو. رادەبم، بـە دالآنەکـەدا تێدەپەرم و دەگەمە ئەوسەری واگۆن. لە چۆنیەتی بزاڤی شەمەندەفەرەوە تێدەگەم لە ئیزگەیەك نزیك دەبینەوە. ئێزگەكە چكۆلەیە. چەند مسافیر چاوەڕێن سوار بن. فەرمانبەری ئێزگە لە پاڵ دەرگەی دەرەوە وێستاوە. دەکەومەوە بیر چێك.

هێندێ لە مرۆڤان به ڕادەیەك شێوەی یەكتر دەدەن كه لە هیچ باوەڕێکدا ناگونجێ و لەخۆم ڕادەبینم زۆر زوو پەی بە وێكچوونەكانیان ببـەم. پەنجەرەیـەك لـە قـەراخ دەرگـەی دەرەوە دا هەڵكـەوتووە، تـەنیا پەنجەرەیەكـە هـەڵكێش داكـێش دەكـرێ. دەسـتم دەخەمـە سـەری و دایدەكێشمە خوارونەختێ سەرم لە پەنجەرە وەدەردەخەم. پیاوێکی گەنج جانتا بـە دەسـت بـە پێش فەرمانبەری ئێزگەدا تێدەپەڕێ. شتێکی لێ دەپرسێ. فەرمانبەرەكە بەسەر ئاماژەی پـێ دەكا، دەستی بەرز دەكاتەوە و لە سەعاتەكەی ورد دەبێتەوە و بـۆ جـارێکی دیکـە ئاماژەبـە شەمەندەفەرەكە دەكا. تەنانەت جموجۆڵی هەر شێوەی چێك دەدا. پیاوی مسـافیر بـەرەو ئـەو دەرگایە دێ كە من لێی وەستاوم. دەرگە دەكاتەوە. ڕێگەی بۆ دەكەمەوە، تێدەپەڕێ. جارێکی دیکـە لـە پەنجـەرەوە لـە دەرەوە دەڕوانم. فەرمانبـەری ئیزگـە کـە چـاوەنواڕی وەڕێکـەوتنی شەمەندەفەرە چەند هەنگاوێك بەرەولای ئێمە دێ و چاو لەمن دەكا. دڵـم رادەچـەنێ. ئەگـەر شوێنێکی دیکە بووایە هیچ گومانێکم لەوە نەبوو کە خودی چیکە.

خولی وانەكانی زمانمان کە تەواو بوو، دەرس و ژیانـە جیاوازەكـان ئـیتر ئـەم دەرفەتـەیان پێنەدەداین رۆژانە لەتەك چێکو لیانا چاومان بە یەكتر بكەوێ. هەرچەند جارێك لە دالآنەكانی زانكۆدا یەكترمان دەدی و ئەگەر دەرفەتێكمان بووایە قاوەیەكمان بە یەكەوە دەخواردەوە.

حـەوتوویێك بـەر لـە بەجێهێشـتنی فەرانسـە بـەڵێنیمان دا بـە مەبەسـتی مـاڵاوایی لـە قاوەخانەیەكی نزیك زانكۆ یەكتر ببینین. هەوا گەرم و تاو و ساو بوو. لەسەر مێزێکی کـە لـە

دەرەوەی قاوەخانە ریز کرابوو دانیشتین و شەرابمان خواست. چێك وتی شەرابی سوور دەخۆمەوە کە جارێکی دیکە چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە. پێکەکانمان لێك دا.

بە دوای ئەمەدا تـەنیا هـەواڵێکی کـە لـەوانم بـوو کارتـەکانی رۆژی لـە دایـك بـوون و کریسمەس بوون. ئەوجارەی کە چێکم دیتەوە چەند ساڵ لەمەوبـەر بـوو، لـە سـەفەرێکی دوو قۆڵی بۆ پاریس لەتەك جیهان دا، بە بەر زانکۆدا تێدەپەڕین کە چاوم پێی کەوت. لەگەڵ چەند کەس لە دۆستەکانی بوو. پێم وانەبوو خۆی بێ. کە لای لێم کردەوەو چـاوی پـێم کـەوت، بـۆ ساتێ مات بوو، خۆی گرژ کرد و پاشان بە بزەوە هاتە لام. بە دەماخ بوو، دەستەکانمی گرتبوو و ڕایدەوەشاند و لێمی دەپرسی لەوێ چ دەکەم و تاچ ماوەییێك دەمێنمەوە. بـە سـەرنجەوە لـە یەکتر وردبووینەوە. بە بینینی ئەو ئێجگار خۆشحاڵ بووم و هەروا دەمـدی ئـەویش وەك مـن بەدەماخە، خەریکی وەرگرتنی دوکتۆراکەی بوو. لیانای لێ نەبوو. ئاماژەی بە کیژێك کرد کە لە لای هاوڕێکانی وێستابوو و چاوی لە ئێمە بوو. کیژە دۆستی تـازەی ئـەو بـوو. تەلـەفۆنی ماڵەکەی پێدام و بەڵێنی لێ ئەستاندم کە ئەگەر جارێکی دیکە ڕێم لەوێ کەوتـەوە تەلـەفۆنی بۆ بکەم. کەلاسی وانەکانی دەستی پێدەکرد و منیش بۆ سبەینەکەی دەگەڕامەوە.

جیهان دەچووە مسافیرەتێ، وتم منیش دێـم. بـێ هـیچ قسـەیەك گووشـی تەلەفۆنەکـەی هەڵگرت و بیتاقەی بۆم وەرگرت.

هەر ئەوکاتە کە لەئێزگەدا لەبەر بۆتکـەی رۆژنامەفرۆشـی وێسـتا و دەسـتێکی تـەواوی رۆژنامە کڕی ، لاقم تەزی. لەبەر ئەوەی هێندە لەبەر پەنجەرە دانیشـتم و لـەو هـەورە رەشـە بڕوانم کە هەناسەیان کپ دەکرد. ئەوەی کە نەزانم بـۆ هـاتووم و ئـەوەی کـە نەمـدەتوانی لـە شوێنێکی دیکەشدا بمێنمەوە، دەیخستمە حێوەت و لەرزەوە. لەو رۆژەوە کە گەڕابوومەوە ئێران بۆم نەدەکرا لە هەمبەر هیچ شتێدا خـۆ ڕاگـرم. حـەزم بـە تـەنیایی دەکـرد، بـەڵام بەرگـەی تەنیاییشم نەدەگرت.

حەزم دەکرد هەتا دنیا دنیایە چاوم بە کەس نەکەوێ و لەگەڵ کەس نەدوێم و کـەس کـاری بە کارم نەبێ. جیهان وتی لەوێش دەتوانم تەنیا بم. دەتوانم هەر کارێکی گەرەکم بوو بیکەم. بە درێژایی رۆژێ بگەڕێم و تەنانەت بۆم هەیە رۆژێ هەمووی هەر بخەوم، چونکە ئەو لـە تـەواوی رۆژێدا کاری دەبێ.

بەیانی هەتا درەنگانێك لە ژووری هوتێلدا مامەوە. بەرە بەری نیوەڕۆ چـوومە شـارو بـێ هیچ مەبەستێك بە شەقامەکاندا دەگەڕام. هیچ شتێ سەرنجمی ڕانەدەکێشا. شەکەت و بێ واز

گەڕامەوە هوتێل. جیهان تەلەفۆنی لێم کرد و وتی کارەکەی هەتا ئێواریێ دەوامی دەبێ و بە دوای ئەمەدا کۆبوونەوەیان هەیە و بە دوای ئەویشدا میوانی شێو. وازی ئەم چەشنە میوانییانەشم نەبوو.

لەسەر قەنەفە راکشام. نە گەرەکم بوو شوێنێکی ئەم شارە ببینم و نە کەسیشم لەوێ دەناسی. لیانا ئیتر لەوێ نەبوو. دوایین هەواڵێکی کە لەوێم هەبوو دەگەڕێتەوە چەند ساڵ لەمەوبەر کە لەگەڵ شووەکەی چووبووە ئوسترالیا و دایك و باوك و خوشك و براکەشی دوای ساڵێك خۆیان گەیاندبووە ئەوان. بە دوای ئەمەدا یەکترمان ون کرد. هەواڵێکم لەچێك نەبوو. ژمارە تەلەفۆنێکی کە پێی دابووم ونم کردبوو. وەگێرخستنی ژمارەکە کارێکی نەبوو. ناوەکەی دیار بوو، دەمتوانی لە دەفتەردا بە شوێنیدا بگەڕیم یا لە رێنوێنی تەلەفۆن وەری گرم.

لە تیرێژی خۆر وردبوومەوە کە کەمان ئاسا لە پشت تۆڕی پەنجەرەوە لە ژووریێ کەوتبوو. نەمدەزانی لەگەڵ ئەو سەعاتە دوورو درێژ و خەماوییانەی کە لەگەڵیان بووم چۆن هەڵکەم. نسێی سووچی پەردەکە کە بە هۆی باوە هێدی هێدی دەشەکاوە کەوتبووە سەر دیوار. سەرم لار کردەوە و ملم درێژکردەوە هەتا لە ئاسمان بڕوانم. رۆژێکی رووناك و جوان بوو. بێ ئەوە پەڵەهەورێك لە ئاسمان بە دیارەوە بێ، بەڵام نسێی پەردە، ژووری نوقمی تاریکی دەکردو ئەمن مەینەتبار.

بێ هیچ هۆیەك تەلەفۆنم هەڵگرت، هەروا بەدەستمەوە مابوو. پەردە بە هۆی نەرمەشنەیەکەوە دەلەرییەوە. تەلەفۆنەکەم لەگەڵ نسێی پەردەوە سەرو خوار پێ دەکرد. نسێی ئەو پەردەیە نەبووایە رەنگ بوو بۆ دایرەی تۆماری ژمارە تەلەفۆنەکان زەنگم لێ نەدایە. بەڵام سێبەرەکە دەسووڕاو لە پایەکانی تەخت نزیك دەبۆوەو ئەمن نەمدەتوانی بەری پێ بگرم، نەمدەتوانی لەگەڵی هەڵکەم. تەنانەت بۆم نەدەکرا سێرەی لەسەر هەڵگرم. فەرمانبەری دایرەی تەلەفۆن ژمارەیەکی پێدام کە هیچ شتێکی بیرم نەدەخستەوە. لەوە دڕدۆنگ بووم ئەگەر تەلەفۆن بکەم بەچی دڵنیابم کە ژمارەکە هی ئەوە. رەنگ بوو کەسانێکی دیکە هەر بەم ناوە لەوێ ژیابان. دوایین جار کە چاوم بە چێك کەوت گەڵێك ساڵ رابوردبوو. ئەو ساڵانەی کە مرۆظ تووشی ئاڵوگۆڕ دێ، تەمەنی بەرەو ژوور دەچێ.

نا، نا، نا تەلەفۆن ناکەم، بەڵام نسێ بەسەر سووچێکی دیوار و فەرشیدا دەخوشێ و هێدی هێدی دەلەرێتەوەو من لەخۆم دوور دەخاتەوە.

تەلەفۆنەکە هەڵدەگرت، ژمارە دەگرێ. بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەگەر لەسەر پەیامگر بێ، پەیام جێ ناهێڵێ. لەسەر زەنگی سێهەمدا کە دێ تەلەفۆنەکە دانێ یەکێك هەڵیدەگرێ. چێکە، بەر لە ئاخاوتن خۆی دەناسێنێ.

لەنێوان دانان و دانەنانی تەلەفۆنەکە دا دڕدۆنگە، نازانێ بڵێ چی. پاشان هێدی دەڵێ: شووڕا، ئەمن چێکم.

بۆ ساتێ کپ دەبێ، دیسان دەڵێ: هێشتا منت نەناسیوە؟ نەمدەزانی لێرەی یا نا. ژمارەکەتم لەدایرەی تەلەفۆن وەرگرتووە.

چێك بە دەماخ چاخییەوە دەڵێ: دیارە کە تۆم لەبیرە. کەی هاتووی؟

-دوێنێ، هوتێلەکەم نزیك زانکۆیە.

بەڵێنییان دا سەعاتێکی دیکە لەبەر دەرگەی زانکۆ یەکتر ببینن.

بەرەو قاوەخانەکەی پشت زانکۆ دەچێ. چەندین ساڵ لەمەوبەر شەرابی ماڵاوایییان لەو قاوەخانەدا خواردبۆوە. قاوەخانەکە ئێستا نەماوە، بۆتە پیتزا فرۆشییەکی دوو دەرگە، لەو خواردنگە زنجیرەییانەی کە لەهەر کەلێن و قوژبنێکدا سەریان هەڵداوە. دێتە پێش و دەوێستێ. لە دەرەوەی دووکانەکەدا شوێنێکی بەتاڵ بۆ مێز و کورسیەکان بەرچاو نایە. بێ هیچ سەرنجێ، چاو لەو ئاڵوگۆڕانە دەکاو گورج تێدەپەڕێ. بە دەم پیاسەکردنەوە هێدی و بە بێ هیچ دڵنیاییەکەوە بەرەو زانکۆ دەچێ. چێك دەبینێ کە لەو لای شەقامەوە دێ، بە بینینی فرە خۆشحاڵ دەبێ، ئەو ساتە بێوێنەیەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، سەردەمێك کە ژیان خۆشتر و دڵگرتر بوو، سەردەمێکی کە مرۆظ پێی وایە گشت شتێ لە خەو و خەیاڵدا تێپەڕیوەو دەکرێ جارێکی دیکە هەر لەو شوێنەوە کە گەلێك ساڵ لەمەوپێشتر دەستی لێ هەڵگرتووە، دەس پێ بکاتەوە. دەسپێکێکی سەر لەنوێ.

لەو مەودایەش ڕا دەتوانێ دەماخ چاخی لە سەرو چاوی چێك ببینێ. بۆ ماوەیەکی کورت لە هەمبەر یەك دەوێستن هەتا یەکتریان بیر کەوێتەوەو شوێنەواری ڕەوتی زەمان لە سیمای یەکتردا بدۆزنەوە. چێك زۆر نەگۆڕاوە. ساڵانی مێرمناڵی تێپەڕاندووە. بەڵام نەیدەزانی کە هەمیشە دەیتوانی بیناسێتەوە، ئەوچەند ساتە بۆ تێپەڕینی ئەم گشتە ساڵە بەس بوو، دەتوت جارێکی دیکە خوێندکاری پۆلی زمان بوون.

لە هەمبەر ئەودا وێستابوو و باوەڕی بەوە نەبوو کە ئەو لەو شوێنەدا ببینێ.

ئاماژەیە خواردنگەی پیتزافرۆشی دەکا: لەبیرتە کافە تریالێك لێرە بوو کە شەرابی ماڵاواییمان تێداخواردەوە، لیاناشمان لەگەڵ بوو.

-ئاگام لە گۆڕینی قاوەخانەکە بوو. دەکرێ بڵێم حەوتووی جارێك بێرەدا تێدەپەڕیم. شوێنێ نەماوە پیتزافرۆشییەکیان لێ قووت نەکردبێتەوە. سیمای شارەکەیان تێك داوە.

دەرگەی سەیارەی بۆ دەکاتەوە و دەڵێ: ئێستا دەتوانین بچینە شوێنگەلێك کە ئەو رۆژانە نەماندەتوانی بەلاشیدا تێپەڕین.

فیزو هەوایەکی دیارو بەرچاو لە چۆنیەتی دەنگەکەیدا هەست پێدەکرێ، سەرو وەزع و سەیارەکەی پێشان دەدا ژیانێکی تەواو جیاوازی لەچاو رۆژانی زانکۆدا هەیە.

لەوەی کە تەلەفۆنی کردووە کەیف خۆشە. لە خواردنگەدا بە بیرێکی ئاسوودەوە پاڵ وە قەنەفە دەداو پێی وایە هەموو کات و ساتەکانی دنیایان لەژێر ڕکێفدایە. ئیتر بیری نسێیەکەی پەردە لەسەر دیواری هوتێلدا چیتر خەفەتباری ناکا.

هێندەیان وردە قسە لە دڵدایە کە نازانن لە کوێوە دەستی پێ بکەن. شێویان بە کاوەخۆ دەخوارد و باسی بیرەوەری و ژیانی سەردەمگەلێك دەکەن کە دوور لەیەك بوون و هەواڵێکی یەکتریان نەبوو. رەوتی زەمان هەست پێ ناکەن. بیر لە کات و سات ناکەنەوە. رابردوو و داهاتوو هەر دەڵێی لە دنیایەکی ئێجگار دوورو لەبیرکراوەدا جێکەوتووە.

خۆی دەسپێرێتە دەست ئاسودەیی* دەنگ و بیرەوەرییەکانی دۆست و شەراب. دوای شێوخواردن دەڵێ: بچینەماڵەکەی من و ئەویش دژایەتییەکی لەگەڵ ناکا.

باوەڕی نەدەکرد، هێشتا متمانەی بەمە نەبوو لە هەمبەر پێشنیاری چێکدا بێدەنگ بووبێ. لەو ساتدا و ساتەکانی دوای گەیشتنە ماڵی ئەو، بیری لە هیچ شتێ نەدەکردەوە. لە ژیانی خۆیدا بۆ یەکەم جار بوو لەم سەردەمەدا ژیابوو، بیری لە رابردوو و داهاتوو و تەنانەت لە هیچ کەس و هیچ شتێ نەکردبۆوە.

نەیدەزانی چ بکا، بۆ کوێ دەچێ، ئەمە پرسیارێك بوو لەخۆی دەکرد، بەڵام بەر لەوە پرسیارەکەی تەواو بکا، وازی لێ دەهێنا.

دڵە پڕ لە ئازارەکەی، رۆحی ئەوی بێبەری لەهەر هزرو بیرێك دەکرد. ئاواتی بوونی ئەو کە زۆر چاك دەیزانی ئیتر هیچکات وەدی نایە، ئەوی بەرەو شوێنێك رادەکێشا کە هەتا ساتێ، ساتگەلێك لێی دەرباز بێ. ڕزگاری دەبوو؟ لە دیتردا بتوێتەوە. کۆنە پرسیارێك مێشکی دەتەنییەوە. پرسیارەکەی بە ناتەواوی دەهێشتەوە هەتا خۆی بە لەشێکەوە بسپێرێ کە ئەوی

بەخۆیەوە دەگوشی و لە خۆیدا دەیتواندەوە. حەزی بوو لە یەکی دیکەدا بتوێتەوە، لە نێوبچێ، بمرێ، شوێنەواری نەمێنێ.

ئەم باوەشە ئەوی بەرەو شوێنێك دەبرد کە نە پرسیارێکی تێدا بەدی دەکرا و نە وەڵامێك. داڕووخان و لەهۆش چوونێك بوو لەنێو دوو دەستی پڕ هێزدا، پڕهێزتر لە مەرگێك کە ئەوی دەگرت و لەو تاریکانییەی دەخلستاند،* دەترسا. شەرمەزار بوو، لەخۆبایی بوو. چ چێژێ، چ دڵەڕاوکەیەك. چ چێژێ، جگە لەو لەشە کە تەواوی هەست و نەستی تەنیبوو، شتێك هەست پێنەکردن.

هیچکات حەزی بەوە نەدەکرد لە تۆفانێکی کە سەری دەگێژەوە دەخست ڕزگاری بێ. خۆزیا هیچکات توورِ نەدرابایە لای ئەوەوە، بریا هیچکات لەو ڕزگاری نەبووبا. خۆزگە تا هەتایێ لەو گێژەڵووکە دا هەڵسووڕابا.

هەڵسووڕابا، هەڵسووڕابا و مردبا. شەپۆل بە شوێن شەپۆلدا بوو کە لەتەك خۆیدا دەیبرد. زەریابوو، ببوو بە زەریا.

هیچ شتێکی بیر نەدەهاتەوە، بەڵام دەیزانی کەشتێك لەبیر ناکا، دەیزانی.

کات و شوێنی لێك جیا نەدەکردەوە. دەیزانی لەچ شوێنێکە بەڵام نەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاو. وەکوو کەسێك وابوو کە بە بێ چاویلکە دێرێکی بۆ ناخوێندرێتەوە، بەڵام تێدەگا کە دەزانێ بخوێنێتەوە. کەوتبووە بیر خاڵخاڵۆکە خۆشەویستەکەی. بیر ئەوە کە لە هەموو کەسی زۆرتر خۆش ویستبوو و تەنانەت هیچکات جارێك دەستی ڕانەمووسیبوو. بریا دەستەکانی، هەست و نەستی بە گشتی نوقمی ماچ و مووچ دەکرد، بەڵام ئەو لە کوێ بوو؟ ئەم پرسیارە لە زەینی تاریك و نوتەکیدا دەگەڕا کە ئیتر قەت شتێکی وای لێ روو ناداتەوە؟ نا ئیتر خۆی نەدەناسییەوە، خۆی نەدەناسییەوە؟ ئاخ، بۆ یەکەم جار بوو کە خۆی دەناسییەوە.

دەیزانی کە ئەو کاتانە بۆ یەکەم جار و دوامین جارە کە لە ژیانیدا روو دەدەن و هیچکاتیش دووپاتە نابنەوە. دەیزانی کارێکی وای لێ رووداوە کە مەگەر لەگەڵی هەڵکا دەنا چی لەگەڵ پێناکرێ. لە هەمبەر ئەمەدا نە سەربەرز بوو نە سەرشۆڕ. راستەقینەترین، هەست پێکراوترین کاتەکانی تەمەنی خۆی تێپەڕ کردبوو. لەم سەردەمەدا هیچکات بەم چەشنە نەژیابوو. ئەو ژنە ناخی ئەوی بیر نەدەهاتەوە. نەیدەناسییەوە. بەڵام لە هەمووانی زۆرتر بە دڵ بوو.

بەخۆی دەوت چۆن دەتوانیٚ جارێکی دیکە لەتەك خـۆی، لەتــەك ژیــان، لەتــەك جیهــان پێوەندی بگرێتەوە. ئەگەر بیزانیبا لە کویٚ سەر وەدەر دەنیٚ نەدەهات. نەدەهات؟

هەر لەو ساتەوە کە دەفتەری تەلـەفۆنی لێـك کردبـۆوە. هــەڵلاو بگرێکــی بــیٚ واتــا و نەناسیاو لەشی ئەوی تێکەوە پێچابوو. لە ناخی دڵە ئەویندارەکەیـدا تەندوورەیــەك وەگــەڕ کەوتبوو و ئەوی لەتەك خۆیدا برد. دەمی، دەمی ئــەوی هەڵلوشــیبوو و لــە ناکــاو تــووڕ درابوو. کەشوهەوایەکی کە خۆی لێی بوو و نە ئێش و ئازارەکانی.

هەرکە چاو هەڵێنیٚ دەبێتە مرۆڤێکی دیکە. دەتوت لە کانیاوێکی بیٚنیاز، لێوڕێــژ لــە ژیانێکی کە لێی ئەستێندرابۆوە خۆی شوردبوو، پێدەچوو تۆڵەی ئەســتاندبێتەوە. مەلافــەی کێشابووە ســەر شــانەکانی و خــۆی تێـدا پێچــابۆوە. چــێك دەســووڕێتە لای و دەڵــیٚ بــۆچ نەگەڕاوەتەوە وڵاتەکەی.

دەڵیٚ: دوای شۆڕش ئیتر نەماندەتوانی، ڕێگەیەکمان بۆ نەمابۆوە تا بگەڕێینەوە. گشــت شتیٚ بە هۆی شۆڕشەوە تووشی ئاڵووگۆڕ هاتبوو.

دەڵیٚ شــتگەل تــا چــەندە شــێوەی یــەك دەدەن، شۆڕشــەکان تــاچ رادەیــیٚ وەك یــەکن. عەسکەری رووس کە هێرشی کردە سەر چێك ئۆسلەواکی، لەوێدا هەموو شــتیٚ بــە گشــتی ئاڵووگۆڕیان بەسەر داهات. ژیانی خەڵك بە یەکجارەکی لێك هەڵوەشا. بڕوای من ئەمە بوو هەر کە خوێندنەکەم بە ئاکام گەیاند بۆ پــڕاگ دەگەڕێمــەوە. بــەڵام هــەموو شــت ئەوەنــدە گۆڕابوو کە ڕێگەی گەڕانەوەم نەبوو. منیش تێکەڵاوی فەرانسە ببووم. دایك و باوکم یەکەم کەسانێك بوون کە زامەکانیان بە هۆی ئێش و ئازاری داگیربوونی وڵات و کۆچ و کۆچــباری بە سارێژنەکراوی مایەوە. دایکم بیست سی ساڵ کەمتر لەو تەمەنەی کە بە بەرییــەوە بــوو ژیا. مەرگی ئەو کۆتایی بە سەرجەم خەیاڵەکانهێنا. بەر لەو تەمای گەڕانەوەمان بوو. باوکم هیوادار بوو، بەڵام دایکم زیرەك بوو، دەیزانی کە ئیتر گەڕانەوەیەك لە ئارادا نیە، هەر نەبیٚ گەڕانەوەیەك بۆ منداڵەکانی لە کاردا نەبوو. ئەو بە جاریٚ گشت خزم و کەسی، دایك و باوك، خوشك و برا و دۆست و ناسیاوانی بەجیٚ هێشتبوو و هاتبوو. دایکم مامۆســتای قوتابخانــە بوو، و ئەمە نالەبارترین ئیش لە کۆچکردندایە، ئەو لێرە هەر هیچ نەبوو. دەیزانی هیچکات بۆی نالویٚ بچێتە سەر هیچ کەلاسێك.

دەیوت رازی بەمە نیە منداڵەکانی بەجیٚ هێڵیٚ و بگەڕێتەوە. نەیدەویست بەجێمان بهێڵیٚ بەڵام ئێمە بەجێمان هێشت، ناعیلاج بووین. ئەمن دوامین ساڵی زانکــۆم بــوو کــە براکــەم

چوویە زانکۆ و وەك من لە نزیك زانکۆ ژوورێکی بـە کـرێ گـرت. دایکـم ڕێگـەی پێـداین وەشوێن چارەنووس و ژیانی خۆمان کەوین، بەڵام خـۆی هانەیـەکی بـۆ درێژەپێـدانی ژیـان نەمابوو. کۆچکردن بووە هۆی زووتر مردنی ئەو. ئەمن لەمەڕ مەرگی ئەوەوە هیچکات لـە وڵاتەکەم نابوورم و هەروەتر لە خۆشم.

مەرگی ئەو منی زۆرتر هۆگری ئەم وڵاتە کرد. وڵاتی من ئاڵووگۆڕێکی فـرەی بەسـەردا هاتبوو، خەڵکەکەی ئیتر ئەو مرۆڤانە نـەبوون کـە ئێمـە دەمانناسـین، گەڕانـەوەم دەبـووە کۆچێکی دیکە. ئەمن حەزم لە تەنیاهێشتنەوەی ئەو نەبوو. بزووتنەوەکان بە گشتی شێوەی یەك دەدەن، ئێستا دەتوانم هەواڵی رۆژی دواترو ڕۆژانی داهاتوو پێشـبینی بکـەم. دەڵێـی یەکێك بـە هـۆی ئاگـایی و شـارەزاییەکی کـە پێشـتر بوویـە فیلمنامەیـەك لـە داهـاتوو دەنووسێتەوە.

بێدەنگ دەبێ، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێ، دەڵـێ: گـەلێك سـاڵ دەخایـەنێ هـەتا بەخۆیـدا بێتـەوە، ئـەویش بـە خۆداهاتنەوەیـەکی کـە ئـیتر لەگـەڵ هەلومـەرجی ئێمـەدا نایخوێنێتەوە. ئێمە وەك ئەو ئاژەڵە زەریاییانەمان لێدێ کە لەنێو ئاودا توورِ درابنە دەرەوە. خۆمان بە ژیانی وشکایی رادێنین، با ئەوەی لەشمان لەگەڵ ژیانی نێو ئـاودا ناسـازێ، بـەڵام رەگ و ڕیشەکانمان هێشتا هەر لەنێو ئاودایەو لەو کەڵك وەردەگرێ. ئەگـەر ئـاو وشـك بـێ ئێمەش وشك هەڵدەگەرێین. لاقمان کە لـە ئـاو دەخـەین، تـابی سـەرمایەکەیمان نیـە، کـە دەیکێشینەوە دواوە لەبەر تاودا خۆناگرین. یادی فێنکایی بۆن خۆشی ئاو بـیرو مێشـکمان بەخۆیە خەریك دەکاو بەم چەشنە نیوەی ژیانمان لەم کایە نیوەکارەو دوو لایەنەدا لـە کـیس دەدەین. دایکم زۆرتر و زووتر لە گشتمان دۆڕاوی ئەم کایە بوو. ئەمە مەبەستێکە کە گشت کات و ساتێ جەزرەبەم دەدا. بە هۆی ئەمەوەیـە کـە توانـای گەڕانـەوەم نیـە. نـاتوانم لـە هێرشکەرانی تانگ سوار خۆش بم. حەز ناکەم دان بەم کارەساتەدا بێنم. تەنانەت بـۆم نیـە زەماوەندیش بکەم. رۆژنامەنووسیم بە ناتەواوی وەلانا، تێزی دوکتۆراکەم ئێستاش هەروا لە دۆلابی مێزی ماڵە باوکمدایە. بۆ بوون بە رۆژنامەنووس پێویستیم بەوانە خوێنـدن نـەبوو. بابەتێکم هەڵبژارد کە لەم سەردەمەدا بەکارم بێ.

ئێستا کە ئەو کات و ساتە کەم وێنەیە هاودەمییە بەسەرچووبوو، ساتگەلێکی کە ئیدی هیچ کات لە هیچ شوێنێ، لەتەك کەسدا دووپـات نابنـەوە، دەیـانتوانی لەمـەڕ قـووڵترین نهێنییەکان و خولیاو ئازار و گرفتەکانیان بدوێن.

چێك دەڵێ: من هەنووکە دڵم هەر بۆ ئەو قالآوە تەنگ دەبێ کە رۆژگارێك لەتەك یەکا دۆستایەتیمان بوو. ئێستاش پێم وایە ئەو لە شوێنێکی نێوان دارەکانی پڕاگدا دەژی. نازانم ئاخۆ منی بیر دێتەوە. من شتێك لە بابەت یادەوەری باڵندەکانەوە تێناگەم. نازانم چ شتێ و هەتا چ ماوەیێ دەتوانن لەبیری خۆیاندا ڕاگرن. ئەم حەکایەتە دەگەڕێتەوە ئەو سەردەمەی کە دەچووینە قوتابخانە. دارێك بەرەو ڕووی پەنجەرەی ژوورەکەم هەڵکەوتبوو و قالآوەکە دەچوو دەنیشتە سەری. ئەو شایەتی هاتووچۆ و وانە خوێندنەکانم بوو و لە ماوەی ئەو ساڵەدا خوومان بە یەکتر گرتبوو. هەر کە لە قوتابخانە دەگەڕامەوە، لە رەخ پەنجەرە دادەنیشتم و سەیرم دەکردو ئەویش پێی زانی. وردە وردە ترسی ڕۆنیشت. دوور لە چاوی دایکمەوە چێشت و هێندێ جاریش سابوونم بۆ لەبەر پەنجەرە دادەنا. قالآو چاوێکی ڕێزداری لێم دەکرد، قارِە قارێکی سەبرۆکەی دەکردو لە شەقەی باڵی دەدا. ئەو ڕۆژەی کە دەمانویست لەو ماڵە کۆچ بکەین، نەمدەزانی چۆنی تێبگەیەنم خەریکی رۆیشتنم. باڵندەکە لە درێژایی ئەو رۆژەدا لە سەر دارێکی ئەولاتر نیشتبوو و چاوی لە هاتووچۆو ماڵ گوێستنەوەکەمان بوو. دەزانم هەستی بە رۆیشتنەکەمان دەکرد. لەوەی کە بۆم نەدەکرا لە بابەت ئەوەوە لەتەك کەسدا قسە بکەم، بە پەرۆش بووم. دەمزانی گاڵتەم پێدەکەن و سەرکۆنەم دەکەن. بە نێو دەستوپێی کۆڵکێشەکاندا دەچوومە نهۆمی سەرێ و دەگەڕامەوە. بەر لەوە ماڵەکە چۆل بکەین بە بیانووی ئەوە کە شتێکم بەجێ هێشتووە چوومە ژوورەکەم، لە رەخ پەنجەرە دانیشتم. قالآو هەڵفڕی و هاتە بەر پەنجەرەو لە مەودایەکی نزیك مندا نیشتەوە. قەت بەم رادەیە لێم نزیك نەکەوتبۆوە. کوتە سابوونێکم لە گیرفانم دەرخست، بە چەند باز لێم هاتە پێش. سابوونەکەی وەرگرت و دوو هەنگاو کشاوە دواوەو لەو لا وێستا. دایکم دیسان هەرای لێ کردم، عیلاجێکم نەبوو دەبووا ڕۆیبام. هەتا مەودایەك دەنگی قارِە قارِە گازندە ئاساکەییم دەبیست. چەند جارێك لەکاتی هاتوچۆی قوتابخانەدا سەری گەڕەکەکەمانم داوە. بە شوێنی دا گەڕاوم، بەڵام گەڕان بە شوێن قالآوێکدا سانا نیە. نەمدەتوانی کەسیش تێبگەیەنم. حەزم نەدەکرد سەرنج و هزر و بیری هاوسێکان بۆ ئەم دۆزە رابکێشم. تەنیا جارێك چاوم پێی کەوت. سەرشێواو و دڕدۆنگ دەینواند. لەسەر پاسارەی دیوار هەڵنیشت. باڵەکانی بە سەبری لێك دا و نەختێ سەری لار کردەوە. خەم لە نیگای دەباری. رەنگ بێ هەر بەم هۆیەوە بووبێ کە ئیتر سەرێکم لەولایانە هەڵنەهێناوە. دۆخی خەفەتباری قالآوێك خەمهێنەرە.

دەستی لەنێو پرچەکانیدا دەگێڕێ و دەڵێ: دەمتوانی بە کێ بڵێم دڵم بۆ قالاوەکەم تەنگ دەبێ. ئێستاش گەلێ جار دڵم بۆی تەنگ دەبێ، کەس متمانەم پێ ناکا؟ ئاخۆ ئەویش دڵی بۆم تەنگ دەبێ؟

لێوەکانم بە یەکەوە دەنێم. دەڵێم: دەگونجێ مرۆظ لەتەك قالاوێکدا دۆستایەتی بێ. بەڵام ئاشقی خاڵخاڵۆکە بوون چی؟

چێك بە بزەو پەیجوورییەوە لێم دەڕوانێ. دەڵێم: ئەمن ئاشقی ئەو خاڵخاڵۆکاتەی دنیام کە پشتیان سوور و خاڵخاڵییە. ئەگەر دانەیەکیان لە شوێنێ ببینم، بە پارێزەوە هەڵیدەگرم و لە جێگەیەکی ئەمنی دادەنێم هەتا دوور لە ئازار بێ.

هەست دەکەم دەستێك دەرگەی ئەو هۆدە تاریکەی کە هەتا ئێستا داخرابوو دەکاتەوە، دەڵێم تەواوی سەردەمی منالێم لەتەك ئەودا تێپەڕیوە. لەو ڕۆژانەی کە لەسەر عەردی پاڵ کەوتین و حەقایەتمان بۆ هەورەکان دەگێڕایەوە. ماوەیەکی زۆر لەو ڕۆژانە تێپەڕیوە، لەو ڕۆژانەدا تەنیا شتێکی کە بیرو هۆشمانی نەدەپەشۆکاند و بە خۆیەوەی خەریك نەدەکرد مردن بوو، هەموو شت ساخ و سەلیم بوو. هەموو گەنج بوون و دەتوت تا هەتایی بە گەنجی دەمانەوە. بەڵام لەپڕ شتێك تەواو دەبێ کە جێگرێکی نیە. کاتی منالی نوقلێکی دارینەت بە دەستەوە، بەپارێزەوە دەیخەیە دەمت دەیلێسییەوە و لەبیری تەواو بوونەکەیدا نیت. پێتوایە دەکەی بۆ هەمێشە وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام یەکجێ دەبینی دارێکی وشکت بەدەستەوە دەمێنێتەوەو دەڵێی نیشاندەری گشت سەر لێشێواوی و هەناسە ساردییەکانتە. لەو ڕۆژاندا تەنانەت ئەوینیش بیرو هزرمانی بە خۆیەوە خەریك نەدەکرد، بەڵام کارەساتێك دەتوانێ لە ناخەوە وا لە ناوت بەرێ کە ئیدی پشتت بۆ ڕاست نەبێتەوە.

چاوەکانم لێك دەنێم. حەز بە گریان ناکەم.

دەستی رادەدێرێ و ئاڵقە موویێك لەسەر هەنیەم لادەدا. دەپرسێ: کەی بوو؟

دەرگەی ژوورە تاریکەکە بە تەواوی خرابووە سەرپشت دەتوت یەکێ پاڵم دەداتە ژوورەوە. هەرچی هەوڵ دەدەم ناتوانم خۆ بکێشمە قەراغێ.

دەڵێم: نازانم چۆن دەکرێ باس لە ئێش و ئازار و ڕق و قینی ئینسانێك بکەی کە تەنانەت کارێکی لەدەست نایە؟

هەست دەکەم فرمێسکەکانم بێ نێوبڕ دەخزنە سەر گۆنام، گرینگییەکی پێنادەم. دەڵێم: کەسێکی کە بێشك بۆت لەهەموو کەس خۆشەویستترە، بێشك.

حەز دەکەم بڵێم: و لە پڕ دەستی دەخاتە سەرپشتت و توورت هەڵدەداتە نێو قوولایی دۆڵێکەوە. بەلام لێوەکانم لێکدەنێم و دەنگ ناکەم.

چێك تلی بەسەر هێڵی فرمێسکێك دادێنێ کە دەخزێتە سەرگۆنام.

دەڵێم: ناخۆشترین شت ئەمەیە کە ناعیلاجی درێژە بەژیانت بدەی.

لە حاڵێکدا دەزانی هیچ شتێ، بە هیچ کلووجێ لێرە دابینت ناکا. زۆر دژوارەو دژوارتر لەویش ئەمەیە کەسیش تێی ناگا. وەك مرۆڤێکی...

حەز دەکەم بێژم داهێنراو، بەڵام فەڕانسەکەی نازانم و قسەکەم بە ناتەواوی دەهێڵمەوە. دەڵێ: ئەوە شتێکە کە زۆریەك لە ئێمە ناعیلاجین دەبێ لەگەڵی هەڵکەین. لە فەلسەفەکەی ناگەم. وەلامێکیشم بۆی نیە.

-وەلامەکەی دەزانی. ئەو فیلسووف بوو. بە وەلامی هەموو شتێکی دەزانی. پێدەچوو هەر بە وەلامی ژیانی خۆی نەزانێ.

-چووزانی کە نەیدەزانی، بەڵکوو لەمن و لە تۆشی باشتر دەزانی. ئەوانەی لە ژیانی خۆیان دەگەن، کەمتر لەم بابەتەوە دەدوێن.

بیری ئەمە دەکەمەوە ئاخۆ چێك کە هیچکات ئەوی نەدیوە، چۆنە لە منی باشتر تێدەگا، کە چاوم پێی دەکەوێ دەبینم زۆر شبی ڕۆستەم دەدا، دەپەشۆکێم.

دەڵێم: نازانم منیش کە وەك دایکی تۆ کە لە هەمبەر کۆچو کۆچباریدا عیلاجی نەکرا، چۆن دەتوانم دەوام بێنم.

چاوەکانی لێك دەنێ، لێوەکانی لێك دەگووشێ و دەڵێ: دایکم خۆی کوشت، ئەگەر بۆم ناکرێ لە یەکێك ببوورم، تاوانەکە لەوە. من ناتوانم لەویش ببوورێم. کارێکی چەوتی کرد، کەس ناتوانێ لە کارە ناحەزو چەوتەکەی ئەو بگا.

ترسم لەوەیە هەرکە چاوەکانی لێك بکاتەوە فرمێسکەکانی داڕژێنەخوارێ.

دەستی بە هەنیەی دادێنێ و دەڵێ: بە دوای دایکم دابوو کە چێك بوونی خۆمم لە دەست دا. گەلێك ساڵ بەسەرچوو هەتا پێم زانی.

لەبیرمە لە کەیەوە ئێرانی بوونی خۆمم لەدەست داوە؟

دەڵێ: ئێمە تازە هیچکات ناگەڕێینەوە سەر ئەو ژیانە سروشتییەی کە دیتران لە وڵاتی خۆیاندا دەیکەن. تەنانەت ئەگەر باشتر و سەرکەوتووتر لەوان بژین. شتێك لە ناخماندایە کە کەس تێی ناگا.

سەیری دەکەم، مەلافەکە دەکێشمە سەرشانم و دەپرسم: تازە ناخوازی بگەڕێتەوە؟

-بە وەڵامی ئەم پرسیارە نازانم. تۆ یەکەم کەس نیت ئەم پرسیارەم لێدەکەی. خۆم بەر لە هەمووان پرسیومە.

دەڵێم: ئەمنیش لام وابوو دەبێ بڕۆین.

دەڵێ: ئاوە مەندەکان نابێ بشڵەژێنی.

-ئێستا لەویش ناگەم.

فەرانسە ئەوی هەڵلووشیبوو و کردبوویە فەرانسەوییەکی غەیرەفەرانسەوی. ئیتر شوێنەوارێك لە سێحری چێك بوون لە ئارادا نەبوو.

دەڵێ: نا، گەڕانەوەم هەر بە بیردانایە. بەڵام ئێستا هەر نەبێ دەزانم قالاوەکەم تەنیا نیە، خاڵخاڵۆکەی تۆ و قالاوەکەی من دووانەن.

-هەرکات پێم دەوت خاڵخاڵۆکە پێدەکەنی و دەیوت، ئەمن خاڵخاڵۆکەیەکی بەرزەفڕم کە حەز دەکەم باڵی درێژم بووایە، ئەو وەك باڵندەکان ئازاد و سەربەست بوو.

دەپرسێ: کەی بوو؟

-نازانم، هەزار ساڵ لەمەوبەر بوو، دە ساڵ لەمەوبەر بوو، دوێنێ بوو، ئیمڕۆ بەیانی بوو.

*رادەبم مەلافەکە لەخۆم وەردەپێچم و دەچمە*
*حەمامێ و لیباسم لەبەر دەکەم. لە ژیانی*
*خۆمدا هەر ئەو چەند سەعاتەم بێ ترس و*
*دڵەڕاوکێ رابواردبوو. سەرنجی کەسم نەدەدا.*
*لەچ شتێ نەترسابووم، ئەو شەوە لە تۆڵەی*
*گشت ئەو شەوە بێ ئەوینانەی کە تۆ*
*ڕاتبواردبوو. هەموو ئەو شەوە بێ ئەوینانەی*
*کە خۆم رامبواردبوو، تۆڵەی گشت تەمەنی تۆ*
*و تەمەنی خۆمم ئەستاندبۆوە...*

ساڵگەلێك تێپەڕیون. ئیدی چاوم بە چێك نەکەوتۆتەوە. بە بۆنەی ساڵی لە دایك بوونی و کریسمەسەوە چەندجار کارتی بۆم ڕێکردووە، هەموو جارێ وەڵامەکەییم لە زەینمدا

نووسی یەوە، بەڵام هیچکات هیچم بۆ پۆست نەکرد، ڕەنگبێ ئەو بتوانێ وەڵامە نەنێردراوەکانی من هەست پێ بکا. ئیدی دیتن و نەدیتن جیاوازییەکی بۆم نیە.

*شوێنێکی دوور لەم ئاقارە مرۆڤانەیە هەیە.*

*جێگایەکی کە دەلوێ یەکتری لێ ببینین.*

*جار و بارە لە قەراخێك دادەنیشم و لە*

*دوستایەتی ئێوە دەڕوانم. ئێوە لەتەك*

*یەکتردان، کوڕانی من، منالانی ڕاستەقینەم...*

فەرمانبەری شەمەندەفەر فیکە لێدەدا و دەستی هەڵدێنێ. شەمەندەفەر وەڕێدەکەوێ. سەرم وە ڕەخ پەنجەرەکەوە دەکەم. کە بەلایدا تێدەپەڕم، نیگامان تێك دەهالێ. بزەی دێتێ، ڕەنگی چێك دەدا. پێم پێدەکەنێ. بێ ئەوە خۆم ئاگام لێی بێ دەستی بۆ ڕادەوەشێنم. دیسان پێدەکەنێ. دەگەڕێمەوە شوێنەکەی خۆم. جیهان ڕۆژنامەی وەلاناوە و سەری وەپاڵگەی قەنەفە کردووە. کە دادەنیشم بۆی ئۆدکلۆنەکەی هەست پێدەکەم، بۆی ناسیاوی کە لەگەڵ گیان و هەستمدا تێکەڵاوە. ئەو هەمیشە باشترینی ئۆدکلۆنەکان لەخۆی دەدا. هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کە دیومە. ئەودەم داڵ گۆشت و باڵابەرزتر لە ئێستای دەنواند. لەوەی کە لەپاڵ ئەودا بم هەستم بە لەخۆبایی بوون دەکرد.

وەڵامی تاقیکاری چوونە زانکۆ ئابڕوبەرە بوو. فاختە دەیوت: لە تەمەنی خۆمدا هیچکات گێژتر و حۆلتر لەتۆم نەدیوە. تۆ لە بەشی دەرمانسازی دەرچووی؟ بەمە دەڵێی ئابڕووچوون؟

-ئاخر بۆ دەبێ دروست لە بەشێکدا دەرچم کە خۆم حەزم لێی نیە؟

-حەزم لێی نیە یانی چی؟ ئەمن ئەوە لەبەردام کوڕێکی شوکرانەبژێری بەڕێوە بەرم. ئەتۆش بانگ دەکەم.

- بە تەمای چی؟

-دایکم نەزری کردووە ئەگەر دەرچم میوانداری بدا.

-دڵت بەچییەوە خۆشە؟

-ئەوین بە ژیان هەر بەمەوە خۆشە. ئەگەر بڕیار بێ وەك تۆ هەر لەمەو لەوی جاڕز بم ژیان هەڵناسووڕێ.

دەڵێم: زۆر شوکر کە لە ماڵی ئێمەدا کەس پاگیری من نیە.

-پێت وایە. بەڵێنێت پێدەدەم کە دایکی تۆش هەزار نەزر و نیازی کردووە.

-دڵنیابە کە هیچ میوانی و میوانداریییەك لە ئارادا نیە.

-شتێکی دیکەش هەیە.

دەڵێم: ئاخر خۆ بۆ خولیا لە کیس چووەکان نەزرو نیازێك ناکەن. نازانم چ لە دایکم و پوورە پەری بکەم.

چاوەکانی وێك دێنێ: ئەم گشتە دوکتۆرە لە شاردا هەڵڕژاوە.

لەو ڕۆژەوە کە باسی چوونە زانکۆ و بۆ دوکتۆر خوێندنی یەکێك لە ئێمە لە گۆڕێدا بوو، دایکم و پوورە پەری گەلێك خەونیان دیبوو، زۆر بەرنامەیان داڕشتبوو کە دوای ئەم گشتە ساڵە مانەوە لە ماڵداو ڕەنج و کوێرەوەری کێشانە بە فیڕۆیە، ئێستا کاتی ئەمە هاتووە بپڕژێنە سەر کارو کاسبیەکی بەڕێوجێ. واتە وەدەستگرتنی کاروباری عیادە، کە ببنە سکرتێری یەکێك لە ئێمە، هەم داهاتێکیان دەبێ و هەم بەسەربەخۆیی دەگەن و هەم دەتوانن لەچنگ سەرکۆنەکردنەکانی پوورە ماە بحەڵسێن. دیارە دەبنە پاڵپشتی ئێمەش هەتا پارەکانمان دەدەستی بێگانە نەکەین.

کاتێ دەنگمان هەڵدەبڕی کە هێشتا نە چاری خۆمان و نە دەرس و زانکۆکەمان روونە، ئەوان بە دەست راوەشاندن وایان دەگەیاند کە ئێمە هێشتا تێناگەین و لە دۆزگەلی گرینگی ژیان حاڵی نین و ئەوان لەمەڕ کارێکی کە تەنانەت روون نەبوو چۆنەو چۆن نیە بەیەکەوە دەدوان. دایکم دەیوت ئەوکاتی بێکاری زۆرترەو حەقیش بەوە کە لە عیادەی مناڵەکەیدا خەریك بێ. پوورە پەری دەیوت کە ئەو پێویستییەکی فرەتری بەکار هەیە، چونکە دایکم هەر نەبێ باوکمی هەیە. دایکم دەمی لار دەکرد و دەیوت: وەی وەی، دوکتۆر... و چیتر درێژەی پێ نەدەدا. زۆرجاریش ئەگەر دەیدی لە هەمبەر پوورە پەریدا کورتی دێنێ یا هەستی بە مەترسی دەکرد کە نەکوو ئەو بۆ سکرتێری لەبارتر بێ و مناڵەکانی ئەویان پێ باشتر بێ، دەیوت: باشە تۆ خۆت کوڕت هەیە. خوا یاربێ کاتێ ئەوان بوون بە دوکتۆر.

پوورە پەریش خۆی چیڕ دەکردەوە و دەیوت: هەیهوو، خوشکێ ئەگەر بە شانسی من بێ ئەوانە دەبنە هیچ کارە.

پاپاش هەموو جارێ دەیوت: ئەوانە خۆش بکووژن وەك باوکیان دەبنە لۆتی.

پوورە ماە دەیوت: بەم گشتە دنەدانەو پشتگرییە کە ئێوە لە مناڵەکانتان دەکەن، نابێ چاوەنواڕییەکی دیکەتان لێیان ببێ.

بەڵام هیچ کام لە براکانم نەیانتوانیبوو ئاواتەکانی ئەوان وەدی بێنن. برا گەورەکەم دوای ساڵێك مانەوە لە تاقیکاریی چوونە زانکۆدا، توانیبووی دەرمانسازی بخوێنێ و براکەی دیکەشم ناچار ببووە رشتەیەکی کە لێی دەرچووبوو، هەڵبژێرێ. بەم پێیە هەموو هیوای دایکم و پوورە پەری بە من بوو و بۆ منیش دەرفەتێکی لەمە باشتر نەدەڕەخساوە کە هەناسە ساردییەکانی خۆم لەهەمبەر جوانی و کەشخەیی خوشکمدا کە هیچکات وازی لێنەدەهێنام، قەرەبوو بکەمەوە و خۆم بنوێنم.

فاختە دەڵێ: بڕۆ شوکری خوای بکە کە دەرچووی. ئەدی ئەمن کە دەبێ بەیتاری* بخوێنم.

-دەتەوێ بە بەیتاری خوێندن چ بکەی؟

-زۆر گوێی پێ مەدە، هیچ کارێکیش نەکەم، دەتوانم شوو و منداڵەکانم تیمار بکەم.

باوکم زۆر دژی ئەمە بوو کە ئەمن ساڵێکی دیکە لە تاقیکارییەکاندا بەشداری بکەم و وتی: یانی چی ناونووسی نەکەم؟ راوەستی هەتا ساڵێکی دی دیسان چاوەنواڕی تاقیکاری بی؟ نابێ ئەم شانسە لەدەست بدەی. دەنا ئیزنت پێنادەم ساڵێکی دی لەتاقیکاریدا بەشداری بکەی. بەچی دەزانی دەردەچی. ئەگەر حەز بە خوێندنی ئەم بوارە ناکەی واباشترە واز لە دەرس و زانکۆ بێنی. پێویست ناکا کیژ لەمە زێدەتر بخوێنێ. مەگین ژیانی خوشکت چیەتی؟

جیهان وتی: چ خۆشتر کە دەسەڵاتی سەربازی تەواو بوو. ئەرێ هەر بەڕاستی کام یەك لە ناوەکانتیان راگەیاند. پەرتەو، شیرین، شوورا؟

ئەم جار بزەیەکی دێتێ و دەڵێ: دەبێ شووریدەی راگەیەنن.

دەڵێم: ها؟

سەری لێم دێنێتە پێش و دەڵێ: ئەمەش هەڵبژاردەی منە، مەگین ئەمن بەشم پێیوە نیە.

و بەم چەشنە ناوی چوارەمم دەدۆزمەوە. تازە تێدەگەم کە بۆچ هەرکات دەچمە ماڵە فاختە جیهانیش لەوێیە.

*ئەتۆ وتت: ئەمن دەمزانی دەردەچی، هەر بژی،*

*-بەڵام ئاخر دەرمانسازی؟ کوێیی بۆ بژی*

*پێکوتن دەبێ رۆستەم؟*

-بە پێچەوانە بەڵکوو بتوانی
دەرمانگەلێك بدۆزییەوە کە بۆنیان نەبێ
و مرۆظ دڵی پێ تێکەڵ نەیە.
لووسی لەبەر پەنجەرە خەوتبوو و لەبنەوە
چاوی لە ئێمە بوو، لە باوەشم گرت و روومەتم
لەنێو پرچەکانی نا کە بۆی ئاخیان لێوە
دەهات. لەشە گەرمەکەییم بەخۆمەوە
گوشی، هەوڵی دا لەچنگم راکا، ئەتۆ
سەبر سەبر لاواندتەوە، بەلاّم ئەو خۆی
لەباوەشم راپسکاند و دیار نەما...

## ( ١٣ )

حەز دەکەم بۆ جێژنە بچمە تاران و ساڵ لە لای پوورە ماهـ نوێ بکەمەوە. بێ گومان ژیانی دژوار رادەبرێ و کەس وازی جێژنگرتنی نیە، پێم خۆشە لە تاران و لە لای ئەو بم. ساتێ دواتر ڕام دەگۆڕم و دەڵێم باشترە دوای جێژنە بچم و نەورۆز لەتەك ستارە و جیهان دا تێپەڕ بکەم. لێدەبڕێم بۆ قەرەبووی کەمتەرخەمییەکانی رابردوو کارێ بکەم و لە خەیاڵمدا هەموو پێداویستییەکان دابین دەکەم.

هەواڵ لە ستارە دەنێرم کە بۆ نوێبوونەوەی ساڵ بەرنامەیەك دارێژێ. دەڵێ: دەرفەتی هاتنەوەی ماڵێم هەر نیە.

پەڕ و باڵم دەوەرێ. لەخۆم جاڕزم و وێرای ئەو خۆم بەسەر کۆنەکردنە دەکەم. هەوڵم دابوو مەوداکان کەمتر بکەمەوە بەڵام زۆرتر ببوو. ژیانمان لێك جیا ببۆوە، کولتوورمان دوو بابەتی دژ بەیەك بوو. لەخۆم دەپرسم بۆچ کەمتەرخەمییەکانم ئاکامیان بووە، بەڵام ئەوین و هەوڵ و تێکۆشانەکانم بەم چەشنە نەبووە. گومان ناکەم جیهان شتێ لەم رووداوانە هەست پێ بکا. مێرەکان لە دنیایێکی راستەقینەتر دا دەژین. کەس هەقم پێنادا. وەکوو مێزێکی شێوە کە رازابێتەوە و چاوەنواڕی میوانگەلێك بێ کە پەلەیەکیان بۆ هاتن نیە و دواجار تێدەگەی کە بانگێشتنەکەتیان لەبیر کردووە. مێزی جێژنەم هێشتا بە تەواوی رێك نەخستبوو کۆم کردەوە. جیهان کە بینی تووڕەو جاڕزم وتی: حەوسەلەیەکی سەیرت هەیە.

حەق بەو بوو، ئەمن زۆرم خۆ ماندوو کردبوو. چاوی لێدەکەم، بێ ئەوە ئیتر هێندە خۆشم بوێ ئێستاش هەموو شتێکی لەگەڵ بەش دەکەم. پێم سەیرە کە چۆن دەتوانم ئەو ئۆگری و خۆشەویستییە چارەنەکراوەی کە بەو مێرە ئورووپایی سروشتەم هەبوو، بیر بخەمەوە؟ هەست دەکەم ڕۆدەچمە نێو هەورەکان. هەور لە لاقەکانمەوە دەستی پێکردووەو هێور هێور بەند بەندی لەشم دادەگرێ، لەنێو پەڵە هەورەکاندا هەر کامێکمان بۆ ئەویتر دەبووینە غەریبە و نادیار.

سەرم بەرز دەکەمەوە دەبینم کە لە ژوورەکەوە دەردەکـەوێ و هـەورێکی سـپیلکە سـەرتاپێی لەشی داگرتووە.

بیتاقەکەم وەردەگرم، دەبووا رۆیشتبام. بۆ هەناسەکێشان پێویستیم بە هەوایەکی جیا لـەو هەوایە بوو کە دایگرتبووم.

*دەبووا هاتبام و پێم وتبای کە لەم دنیایەدا*
*شوێنێك هەیە کە هەورەکانی بێ حەکایەتن.*
*شوێنێك کە هەورەکان بە گشتی ئاسمانیان*
*داگرتوو و لە هەر چەشنە تەرح وئەندازەیەك*
*بێبەرین و بەرادەیەك قورسن کە ئەگەر لێیان*
*وردبینەوە قورساییەکەیان هەموو لەشت*
*دادەگرن، لە نێویاندا ون و لە دیتران نادیار*
*دەبی. دەبووا هاتبام هەتا هاورێی تۆ لە*
*هەورەکان برِوانم و جارێکی دیکە وەرزەکان لەتەك*
*تۆدا بدۆزمەوە. حەز دەکەم جێژنە لە ماڵی*
*تۆ دا بگرم. حەز دەکەم پێوەندیم بە شوێنێکی*
*ئەم دنیایەوە هەبێ کە ئەویش تەنیا ماڵی تۆیە*
*رۆستەم...*

جیهان لە فرۆکەخانەدا پرسی: کەی دەگەرِێیەوە؟

ساتێ کپ دەبم، بیرم لە گەرانەوە نەکردبۆوە، ماڵاواییمان لە یەکتر کرد. حەزم بە گەرِانەوە نەدەکرد. دەهاتم تاکوو بمێنمەوە.

*ناهید و شووەکەی هاتوونەتە فرۆکەخانە،بە بەر*
*دەرمانخانەی باوکمدا تێدەپەرِین، لە ماڵەکەی*
*تۆ دەرِوانم کە لەسەر دەرمانخانەکە هەڵکەوتووە.چراکانی ماڵت کووژاونـەوە. ئەگـەر لـە ماڵەوە*
*بووای دەهاتمە لات.حەزم دەکرد هاتبامە ئەوێ.*
*دەزانم وەك هەموو ساڵێ بۆ جێژن چوویەتە*
*گوندی لای خوشکت. ئەگەر بتزانیایە دێم*

*نەدەچووی. لانیکەم لە هاتنمدا دەمایەوەو*
*رۆژی دواتر دەچووی.*
*ئەتۆ بابەتەکانت تێکەڵ نەدەکرد.*
*بۆ تۆ هەموو شتێ تایبەتمەندی خۆی هەیە.*
*ماڵی تۆ تەنیا شوێنێکە حەزم لەچوونی بوو و*
*تۆش تەنیا کەسێکی کە خولیای دیتنی بووم.*
*هەر دەمتوانی بەتۆی بڵێم لەچ غەریبایەتییەکەوە*
*هاتووم. چ سارایەکی کپ و تاریکم پێواوە.*
*وتبووت جێی خۆیەتی بێم و دەستێك بە*
*دەرمانخانەکەی باوکمدا بێنم. دەمتوانی لە*
*دەرمانخانە لەپاڵ تۆدا کارێ بکەم، چ*
*گرفتێکی هەبوو؟ کارکردن لە دەرمانخانەی*
*باوکمدا مرۆڤانەترە. چارەنووسی تۆش بۆ*
*لێ دەربازبوون نابێ. دەهاتم ئەوەت پێ بڵێم...*

ئاپارتمانی سەرەوەی دەرمانخانەی لە میسیۆخانی کراسدروو کڕیبوو. ئەو پێشتر بەرگدرووی میسیۆخان بوو، میسیۆخان کراسی هەموو پیاوەکانی بنەماڵەی ئێمەی دەدروو. پووره پەری چووبوو پێی وتبوو کراسی بۆ بدرووی. میسیۆخان وتبووی: خاتوون ئێمە بەرگی ئافرەتان نادروویین.

پووره پەریش وتبووی چ قەیدییە چاوت بنووقێنە و هەر وایدانێ کراسی پیاوان دەدرووی.

بەم پێیە کراسی بۆ ئێمە دەدووری. من و فاختە هەرچەشنە بلووزێکی ڕەنگاوڕەنگمان لە لا رادەسپارد.

میسیۆخان پیاوێکی خرپن و مەشرەف خۆش بوو. بە زاراوەی شیرینی هەرمەنی دەئاخاوت. باوکم پێی دەوت میسیۆگیان و ئەویش یەك بەخۆی قاقای لێدەدا و پێدەکەنی. لەو پێکەنینانەی کە دنیایەك دەماخ چاخی بە دواوەیە. مرۆظ پێی فێر دەبێ. باوکم دوای ئەم گشتە ساڵە، کەوتۆتەوە بیر پێکەنینەکانی میسیۆخان و دەڵێ شوێنی بەتاڵی میسیۆخان و پێکەنینەکانی چەندە بەتاڵە.

میسیۆخان ئەو ڕۆژەی کە دەیویست بەرگ دروویی وەلابنێ، بە باوکمی وتبوو پێوەیە ئاپارتمانەکەی بفرۆشی، ڕۆستەم دەڵێتە باوکم ئەگەر نرخێکی پڕ بە پێستی بێ حەز دەکا بیکڕێ.

بۆ باوکم هەلێکی لەوە لەبارتر نەدەڕەخسا. ئیتر دڵەڕاوکێی ئەوەی نەدەبوو کە نەکوو یەکێ هەرچی و پەرچی بێ لە سەرەوەی دەرمانخانەکەی دانیشێ. ڕۆستەمیش دەیتوانی شەو و ڕۆژ چاوی لەسەر دەرمانخانەکە بێ و دواجاریش خەیاڵی بە شەوانە ڕۆژی کردنی ئەوێش دەهاتەدی.

لە بنەماڵەی ئێمەدا هەر هەواڵێك و قسەو باسێك بۆی هەیە شەڕو کێشەی لێ بێتەوە. هۆی هەڵگیرسانی ئاوری ئەم شەڕە گەلێ جار پاپایە و دەستەچیلەکەشی پوورە پەری. پوورە ماه خۆی دە شەڕاشۆیەکانی پوورە پەری هەڵناقورتێنێ. دایکم بێدەنگە بەڵام زۆریش بێ تاوان نیە. لەبنەوە هێندێ کاران دەکا و هاودەستی پوورە پەرییە. بەڵام خانم خانمێ کار ڕێکخەرە. زۆرجار دەڵێم ئەگەر خانم خانمێ نەبووبایە ئێمە چیمان بەسەر دەهات.

خانوو کڕینی ڕۆستەمیش جیا لەم بابەتە نەبوو. لەڕاستی دا دەبێ بڵێم ماڵ فرۆشی میسیۆخان دەسپێکی ئەم هەڵلا و بگرە بوو.

پاپاکە پێی زانی وتی ئەوێ بۆ خۆی دەکڕێ و ئەگەر ڕۆستەم گەرەکی بوو بە کرێی دەداتێ. پاپا لەسەر ئەم گومانە بوو کە دەتوانێ گشتی ئەم دنیایە بکڕێ و بیدا بە خەڵکی. ڕۆستەم وتبووی نایەوێ بە کرێی بگرێ. وتبووی: مەزن ئاغا خاوەن بڕیارە، بەڵام ئەگەر بڕیار بێ خانوو بکڕم ئێرە نا شوێنێکی دیکە. قسەش لە قسەی ئاغا ناکەم.

باوکم کە لە ڕاستیدا حەزی لە لەدەستدانی ڕۆستەم نەبوو و پێشی خۆش نەبوو پاپا ماڵەکە بکڕێ، بە دایکمی وتبوو، خۆ باوکت بۆی نیە ببێتە دەسەڵاتداری گشت دانیشتووانی ئەم گەڕەکە.

خانم خانمێ کە بەمەی زانیبوو وتبوویە پاپا: جا ئەم بستە خانووە بە کەڵکی چی تۆ دێ؟

پاپا کە پێی وایە نابێ کەس قسە لە قسەی بکا دەڵێ: ئەم ئاورانە هەمووی هەر لەژێر سەری دوکتۆردایە.

خانم خانمێ دەڵێ: ژیانی پەریت شێواند بەست نیە، ئێستاش پەڵپت بە ژیانی ئەو گرتووە؟ دوکتۆر نەیکردووە. ئەگەریش کردبێتی ، کارێکی خراپی نەکردووە. دەرمانخانەکەیەتی و سەرەوەی دەرمانخانەی، ڕۆستەمیش هەموو کارەی. دەیەوێ چاوەدێری بکا. قسەیەکی بێ جێی نەکردووە. ئەتۆ بای ئەوەت نەدەکرد؟

پاپاش جەنەی گرتووە، ئەگەروایە واباشترە ڕۆستەمیش هەرچی زووتر سیپاڵی تێکەوە پێچێ و لەم ماڵە بار بکا.

خانم خانمێ دەڵێ: هەر ئەوەم ماوە لە لای دەر و جیرانان بڵێن کوڕەیان لە ماڵ وەدەرنا. ئەویش بۆ قاتێك خانوو.

پاپا وتبووی: دوکتۆر گومانی ئەمە بووە ئەگەر لە سەرەوەی خۆی جێگەی پێ بدا چاوی لەسەر دەرمانخانەکەی دەبێ. کاکی دوکتۆر بۆ خۆی وت. هەرکە ماڵی کڕی سبە و دووسبەیەکی ژنێك دێنێ و چەند تولەشی لێ دەبێ. چاومان روون جا وەرە سەیری.

خانم خانمێ دەڵێ: ئەمەش دەخڵی بە ئێمەوە نیە. خۆ کوڕەمان بە کرێ نەگرتووە.

دیارە منیش ئەمەم بیست. بۆ ڕۆستەمیم نووسی ئەگەر پووڵی پێویست بێ ئەمن دەتوانم بۆی ڕێ بکەم. ئەگەر حەزی لە خۆشیرینکردنە و لێمی وەرناگرێ با بە قەرزی دابنێ و هەرکات بۆی لوا پێمی بداتەوە.

بۆ پوورە ماهم نووسی هەر کارێکی لە دەستی دێ بۆی بکاو هەر خەرجێکیشی بێ عایدی من. بەڵام ئەوان ئاگاداری بوون، پوورە ماه و غولام خان و باوکم زۆر زوو وامێکی بانکیان بۆ جێبەجێ کرد کە مانگانە لە مووچەی خۆی دەیداتەوە.

خانم خانمێ فەڕشێکی پێداو پاپاش نەختێ پارە بۆ کڕینی شڕەو بڕەی نێو ماڵ، پوورە پەری پێدەکەنی و دەیوت: پارەکەی باوەگیان فرە پڕچێژە. بەهبەهـ ئەگەر خۆی بزانێ.

خانم خانمێش پێدەکەنی و دەیوت: وەی لە دەست ئەم پەرییە. باشە دیارە کە دەزانێ. خۆ ئەمن بە دزی ئەو پارەم نەداوە.

پوورە پەریش دەیوت: خوا بەختمان داتێ.

دیارە پاپا دەیزانی و وە رووی خۆی نەدەهێنا.

ڕۆستەم لەوی بەولاوەش هەموو ڕۆژێ سەری لە خانم خانمێ هەڵدەهێنا و بە گشت کاروباری دەرەوەی ماڵیان رادەگەیی و لەگەڵ ئەوکات و ساتەی کە لەوێ دەژیا مووی لێنەدابوو و هەر وەك پێشوو رێزی پاپای هەر لە لا بوو.

دایك و باوکم لە ماڵەوە چاوەڕوانی منن. پوورە ماهیش لەوێیە. بە دوای کۆچی غولامخاندا یەکەمجارە چاوم پێی دەکەوێ. لەو دەمەی شەوێدا چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەدەکرد. حەوت هەشت مانگێك لە کۆچی دوایی غولام خان تێدەپەڕێ. پوورە ماه شەکەت و تێکشکاو دەنوێنێ. وەك دە ساڵ پیرتر بووبێ وایە. چارشێوەکەی هاویشتۆتە سەرشانی و پرچە چەرمووگەکانی بە

دەرەوەن. دەچمە لای و توند لە باوەشی دەگرم. تەنیایی ئەو دوای مەرگی غولاّم خان بۆم جێی باوەڕ نیە. نازانم چۆن بە بێ ئەو دەژی. لەپشت تەلەفۆنەوە هۆڕ هۆڕ بۆی دەگریـام و ئـەو بـە دەنگێکی شەکەتەوە دەیوت: مێرە رەنجەڕۆیەکەم ئاسوودە بوو. کوێرەوەرییـەکی زۆری کێشـا. ئاسوودە بوو...

کاتێ وتم: پوورە ماه ئەی ئەتۆ...

وتی: ئیتر دەرفەتێ نەمابوو بەخۆمدا بێمەوە. ئاماژە بووم هەرچی کوێرەوەرییـە لـەجیات ئەوە بیکێشم و ئەو زیندوو بمێنێ، بەلاّم ئەمانە گشتی خولیاگەلێکی بێ هۆن.

نەخۆشییەکەی غولاّم خان لە سەرەتاوە هەتا ئەو رۆژەی پێی مرد سالّێك زیاتری نەخایاند. ئەو پێنج شەش مانگەی دوایی دوکتۆرەکان هیوابڕ ببوون.

دایکم دەیوت: پوورە ماهت ئیتر ئەو پوورە ماهەی جاران نیە کـە دەتناسـی، کـپ بـووە، نادوێ. حەزی لە تەنیاییە. دەترسـم بەلاّیـەکی بەسـەر بـێ. لـەژێر بـاری خـەم و خەفەتـەوە تواوەتەوە.

راستی دەوت خەم و حەسرەت بە جارێ بەچۆکی داهێنابوو. دەلّێم: ئەمشەو دێمە لات.

نازانێ چ بلّێ. دایکم گورجەکی دەلّێ: نانا، پووریشت لێرە دەمێنێتەوە. باوکم بـە سـەری ئاماژەیەکی دەکا بەلاّم حالّی نابێ. بە گومانم شتێك لە حەوادا لە گەڕیاندایە. شتێکی ملۆزم کە هەستی پێدەکەم. دەپرسم چ بووە؟ دەپرسم رۆستەم لە کوێیە؟

باوکم لەژێر لێوەوە جوتن دەداو پرتەو بۆلّەیەك دەکا کەچی لێ تێناگەم.

دایکم دەلّێ: جارێ بخەوە.

ئیدی هیچی پێ ناوترێ و درێژەی قسەکەی نـاگرێ. چـاو لـە ناهیـد دەبـڕێ. ناهیـد کـە پێدەچێ دەیەوێ قسە بکا، سەری بۆ لای ئەو دەسووڕێنێ و دەلّێ: ئەو ناخەوێ، بزانێ باشترە.

هەست دەکەم قسەیەك دەکا کە تاقەتی بیستنیم نیە، هەولّ دەدەم بپەڕمە نێـو قسـەکەی هەتا چیتر درێژەی پێ نەدا، دەلّێ:

*ئەتۆ مردووی...*

چێژێکی شاراوە لە دەنگەکەیدا کە بۆم ناخرێتەوە سەریەك، پێدەکەنم و دەلّێم ئەم چەشـنە گالّتانەم هەر هیچ پێخۆش نیە.

گەرەکمە رابکەم. لەبەر بابەتێکی کە لێم روونە لەگەلّی هەلّناکـەم. بـە یـەکجاری رەنگـم گۆڕاوە. ئەمە نەك هەر لە نیگای دیترانەوە بەلّکوو لە چۆنەتی ماسوولکەکانی دەموچاویشم ڕا

هەست پێدەکەم. دایکم سەرسام لێم دەڕوانێ. باوکم دامدەنێتە سەر قەنەفەو دەستی دەخاتە سەرشانم. دەستی لادەبەم. لە هۆدە دەچێتە دەرو بەشەربەیەك قەندادەوە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ها بیخۆوە.

بۆم ناخورێتەوە. شەربە لە زارم نزیك دەکاتەوە و ناچارم دەکا بیخۆمەوە. دیسان لەژێر لێوەوە هەر ئەو جنێوە دەداتەوە. تێناگەم جنێوە یا نەحلەت، نازانم.

وتبوومە جیهانێ کە هەرکات مۆتەکە دەستی نایە بینە قاقام و وەجموجۆڵ کەوتم، زوو هەڵمستێنێ. بەڵام هەرچی دەستوپێ دەکوتم کەس بە هانامەوە نایە. دەنێو ئاوێکی ساردا رۆ دەچم کە سات بە سات قورستر و تاریکتر دەبێ، شەپۆلگەلێکی مەزن بە دەنگێکی پڕسامەوە گێژەوم پێ دەکا. پێدەچێ خەریکە بخنکێم، لە هەوڵی خۆگەیاندنە رووکاری ئاوەکە دام، بەڵام لە هێز دەکەوم، خۆ بۆ ئێرە و ئەوێ دەکوتم، دەست و پێ دەکوتم، بێ کەڵکەو بەناخی شەوەزەنگدا رۆ دەچم.

*پێم دەڵێ، تۆ مردووی، وەکوو ئەوەیە بڵێنە*
*مرۆظ تۆ کە چووبوویە سەفەرێ، وڵاتەکەت*
*ئاو بردی. و ئەمن ئیتر شوێنێك بۆچوون شك*
*نابەم...*

لەشم دادەهێزێ، چاوەکانم لێك دەنێم و لەنێو تاریکیدا دەگەوزێم. دەگەمە ژێر ئاوێکی قورس و تاری. سەروە بەردێك دەکەم، ئاسوودە چاو لێك دەنێم. جیهان بیری چۆتەوە هەڵمستێنێ. پێم وتبوو، ئەو دەیزانی. بەڵام باشتر، لێگەڕێن با بخەوم. لێگەڕێن بۆ تاهەتایی هەر بخەوم.

ئاپارتمانەکەی بریتییە لە دالانێك و دوو هۆدە لە لای ڕاستەوەو چێشتخانەیەك لە بنەبانی دالانەکەدا، ئاودەست و دەستشۆرك لە لایەکی دیکەدا هەڵکەوتووە کە دواتر دووشێکی حەمامی بۆ دانا. ئاپارتمانێکی بچکۆلەیە کە بەقەد یەك دنیا بەرفرەیە.

پوورە ماه کلیل لە جانتاکەی دەردەخاو دەرگە دەکاتەوە. هێشتا بە تەواوی نەیکردۆتەوە کە مامی بە ژێر لاقماندا خۆی دە ژوورێ داوێ. پوورم دەڵێ: وەی لە چنگ ئەم مامییە و دەستی داوێتە ژێر زگی و بەرزی دەکاتەوەو دەڵێ: لە کوێ بووی، چاو، خۆی چۆن پیس و پۆخڵی کردووە. بەستەزمانە برسییەتی. حەوتوویێك دەبوو سەر و سۆراخێکی نەبوو. ون ببوو.

مامی وەڕەز و بێ تاقەت لەم دیو دەچۆوە ئەو دیو و دەمیاواند. پوورە پەری بانگی دەکاو دەچێتە چێشتخانە هەتا چێشتی بۆ دانێ. مامی بە ڕاکردن و میاو میاو دەکەوێتە شوێنی. پوورم چێشتی بۆ تێکردووە، چاوێکی پێدا دەگێڕێ و خەریکی خواردنی دەبێ و لە ژێرەوەش ئاگای لە ئێمەیەو زوو زوو سەری لەسەر چێشتەکە وەردەگێڕێ. پوورە دادەنیشێ و دەیلاوێنێتەوەو دەڵێ: بخۆ بەستەزمانۆکە بخۆ، چاو چیت بەسەر خۆت هێناوە.

لەسەر سەریان وێستاوم و لێیان دەڕوانم. مامی واز لە خواردن دێنێ. چاو بە دەوروبەریدا دەگێڕێ. پوورە جارێکی دیکە دەستی بە پشتیدا دێنێ هەتا پاشماوەی چێشتەکەی بخوا. مامی رووی وەردەگێڕێ. لە باوەشی دەکەم. روومەتم لە تووکە بۆرەکەی نزیك دەخەمەوە. خۆی ڕادەپسکنێ و لە باوەشم دەردەپەڕێ. بە میاو میاو سەر لە ژوورەکەم هەڵدێنێ. دەڵێم: ئەمن ئا لێرە دەمێنمەوە...

ئەمنیش لە لات دەمێنمەوە.

-نا، پێم خۆشە تەنیا بم. ئێوە بچنەوە ماڵێ. خەمتان نەبێ.

ئەو پێ ئەو پێ دەکاو بە شوێن بیانوویێکدا دەگەڕێ. تکایە. بە هەنگاوگەلی قورسەوە بەرەو دەرگە دەچێ و دەوێستی، دەگەڕێتەوە شتێ بڵێ. دەپاڕێمەوە: نامەوێ هیچ بزانم. هەرپێم خۆشە تەنیا بم.

لێوەکانی لێك دەگووشێ و لەسەرخۆ وەدەردەکەوێ. دیسان دەگەڕێتەوەو لێم دەڕوانێ، دەڵێی لەبەرم دەپاڕێتەوە ئیزنی مانەوەی پێ بدەم. دەستم دەنێمە سەرشانی، ساتێ بێدەنگ دەبێ و پاشان بەرەو پێپلەکانەکان دەخوشێ. دەرگەی بە دوایدا پێوە دەدەم.

*لە ماڵەکەتدا هەموو شت لەسەر جێی خۆیەتی.*

*مامی دیسان دەچێتە چێشتخانە پاشماوەی*
*چێشتەکەی بخوا، لەگەڵی دەچم، دەرگەی*
*دەستشۆرکی پاڵ چێشتخانە نیوەکریاوەیە.*
*خاولییەکەت بە بزماری قەراخ ئاوێنە*
*هەڵواسراوە، هەڵیدەگرم و بە روومەتمەوەی*
*دەنێم. ئێستاش بۆی دەستەکانتی هەر لێوە*
*دێ، مامی بە دەورمدا دەخولێتەوەو سەری*
*لە لاقم دەساوێ، دادێمەوەو دەیلاوێنمەوە ،*

*مێزە خڕەکەو دوو مۆبڵەکە لە ژووری*
*دانیشتندا لە شوێنی خۆیانن.*
*تەلەویزیۆنەکەشت لەوێیە. گشت جێگەێی پاك*
*و خاوێنە.*
*دەڵێن ماڵی ئینسانە تەنیاکان یا فرە خاوێنە یا*
*زۆر پیس و شپرێوە. ماڵی تۆ پاقژترینی*
*ماڵەکانە. تەنیا شتێکی کە توانای گۆڕینیت*
*نەبوو، بۆی دەرمان بوو...*

ماڵ شپرێوو بەتاڵە، بـێ ئـەوە شـپرێوو بـەتاڵ بـێ تویژاڵـە تۆزێـك نیشـتۆتە سـەرمێز. گۆڤارەکان بە پرژوبلاوی لەژێرمێزدان. قوتووە چوکولاتێکیشـیان لـە لایـە. دەسـت رادەدێـرم هەڵیگرم. بەلام بۆم ناکرێ. ئەو رۆژەی کە بۆ سبەینەکەی خانم خانمێ کۆچی دوایـی کـرد، بـۆ یەکەم جار هەر ئە لێرە لە پـاڵ ئـەم مێـزە و لـەم هۆدەیـەدا بـوو کـە قـەپاڵمان لـە نیـوەی چوکولاتەکانی نێو قوتووی چوکولات داگرت و دامانانەوە سەر جێگەی خۆیانەوە.

*تەنیا بەهۆی تۆوە بوو کە توانیم خانم خانمێ لە*
*دوایین رۆژەکانی ژیانیدا ببینم و بیرەوەری*
*باوەشی پڕ تینی ئەو ئافرەتە بێ وێنە و پڕ لە*
*شانازییەم لە لابێ. ئەم بیرەوەرییەش هەر*
*لە تۆوە دەزانم و کەسی دیکە...*

دەتوت کەس بەمەی نەزانیبوو کە ئەمنیش ئەم مافەم هەیە لە دوایین ساتەکانی ژیانیدا لە لای بم، کاتێ گەیمە تاران دوایین رۆژەکانی بوو. پیر و تێکچرژاو و لەش بە بارتر لەوە بـوو کـە بیرم لێدەکردەوە. زۆر دژوار دەکرا ئەو ئافرەتە دەماخ چاخ و سەر زیندووەی رابردوو لە هەسـت و ناخی ئەودا وەدۆزییەوە. تەنانەت نەیدەتوانی لەجێی خۆی ببـزوێ. دەور و بەرییـەکانی بـیر نەدەهاتەوە. ئێمەشی لەتەك یەکتر بە هەڵە دەگرت. هێندێ جار بۆ دەمێـك گومانـت دەکـرد خەریکە شتێکی بیر کەوێتەوە. دەم و چاوی گەش دەبۆوە. هەر لەو ساتە تیژ تێپەڕانەدا، لـەو بزەو پێکەنینەکەی جارانی دەنیشتە سەرلێو. دەستەکانیم دەگرت رامدەتلەکاند هـەتا بـەڵکوو بکرێ هەر لەو حاڵەتە وەئاگا هاتنەوەیەیـدا رایگـرم. بـەلام ئاورینگەکـە دەکووژایـەوەو ئـەو جارێکی دیکە لە ناخی تاریکیدا رۆ دەچوو. چاوی لێم دەکرد. دەتوت حەولی ئەوەیەتی بـیری

بکەومەوە. پاشان چاوانی شەکەتی دەنایە سەریەك، تەنیا کەسانێکی کە بە دروستی دەیناسین پاپا و ڕۆستەم بوو. پاپایەك کە خوشی پیر و تێکچـڕژاو ببـوو و کـەمتر دەهاتـە ژووری خـانم خانمێ، لەو حاڵ و وەزعەدا توانای بینینی ئەوی نەبوو.

جگە لە خانم خانمێ و پاپا کاری بە هیچ شتێکی ئەو ماڵە نەبوو، هەموو لە هاتوچۆ و پێڕا گەیشتنی کارو باردا بوون. نەنکەکان، عەلی خان، ئاغاوێردی، غولام خـان و پوورەکـانم هـەر کام بە نۆبە دەهاتن و بە کارو بارەکان ڕادەگەیشتن. رۆستەم لە گشت شوێنێ بوو، پێدەچوو خۆ لە هەموو کارەکان هەڵقورتێنێ. لاقێکی لە دەرمانخانەی باوکم بوو و یـەکی لـە ماڵـە پاپـا. هەرچی دەیان وت و حەزیان لێی بوو بەڕێوەی دەبرد.

لەو ڕۆژەوە لاقم لە تاران نا هەتا مەرگی خانم خانمێ، زیادە لە چەند رۆژی نەخایاند. دوایین رۆژەکانی لە بێدەنگییەکی تەواو و خەوێکی درێژخایەندا تێپەڕ دەکرد. کـەش و هـەوای مـاڵ وەها کپ و قورس بوو کە مرۆظ پشووی سوار دەبوو. یەك دوو سەعات زێـدەتر لـەوێ هـەڵم نەدەکرد. چاوم لە نەنە دەدری دەکرد و بـیری قاقـا و پێکەنینـەکانیم دەکـرد، بـەڵام ئـەویش لێوەکانی بەسەریەکدا نووساندبوو و نوقمی بیر و خەریکی کار بوو.

هەتا ئەوەی کە رۆژێك نەنەگەورەم ڕێك لەو کاتەدا کە تـەنیا نەنـە گـەورە لەبـەر پێیـانی خەوتبوو، ماڵاوایی لە ژیان کردو ماڵەکەی بەجێ هێشت. ماڵێکی کە گەلێك ساڵ تێیدا ژیـا، فرە میوانداری لێ دا و گوڵی ئیجگار جوان جوانی تێدا چاندبوو. ماڵێکی لێوڕێژ لە پێکەنین و ئەوینەکانی بوو، هەر شوێنێکی رازاندبۆوەو خۆشی ویستبوو.

چی وای پێنەچووبوو کە ماڵ پڕ لە هاتوچۆ ببوو. باوەڕم نەدەکرد کەسێکی کە زێـدەتر لـە هەمووان دڵی بەو ماڵ خۆش بـوو و تەمـەنێکی دوورودرێـژ لەوێـدا دەسـەڵاتداری کردبـوو و منداڵەکان و نەوەکانی گەورە کردبوو، هەنووکە لە ئارادا نەبێ و هێنـدێکی دیکـە لـە هـەوڵی ئەمەدابن هەرچی زووتر لەو نێوەی ڕاکەن و بیبەن.

نەنکەکان لە چێشـتخانە هـەڵوایان دروسـت دەکـرد. دایکـم و پـوورە پـەری لەسـەر لـە بەیانییەوە خۆیان لە ڕەشی گرتبوو و لە سەرەوەی کۆڕەکە دانیشتبوون و لەگەڵ میوانگەلێکی کە دەهاتن سلاو و سپاسیان دەکرد. تۆڕی هەواڵنێری بەتاو و ڕێـك و پێـك کاروبـاری خۆیـان دەکرد.

پووره ماهیش چارشێوی بە سەرشانی دادابوو و بە گشت کارەکان رادەگەیی. غولام خان و ڕۆستەمیش بەرئەمری بوون و لە دەور و بەری دەخولانەوە. هێشتا بۆ نیوەڕۆی مابوو کە چەند کەس بۆ کاروباری کڕین و شتی وا لە دێ ڕا هاتن.

هەر کە مەیتەکەیان لە ماڵەوە هەڵدەگرت هەموو بە تێکڕایی لە گابۆڕییان دەدا. ڕۆستەم بن هەنگڵی باوە گەورەمی گرتبوو و بۆ لای سەیارەی ڕادەکێشا. باوە پشتی کۆم ببۆوەو پاڵی وە ڕۆستەم دابوو. ڕۆستەم دەرگەی سەیارەکەی بۆ کردەوەو یارمەتی دا هەتا سوار بێ. هەرکە دانیشت دەستی ڕۆستەمی بە توندی وەلانا بە ئاماژە تێی گەیاند دەرگە پێوەدا.

*لە سەردەمی منالیماندا دەمانزانی دەسەلاتمان*

*بەسەریدا ناشکێ. بەلام ئەو ڕۆژە زۆر بە سانایی*

*دەتتوانی دەستی لێ بەر بدەی...*

دایکم و پووره پەریم لە لای دیکەوە سوار بوون و لە پاڵی دانیشتن. ئەمن لەتەك پووره ماه و غولام خان بە سەیارەکەی ئەوان چووین. براکەی غولام خانیشمان لەگەڵ بوو، پووره ماه فرمێسکەکانی سەبرۆکە بە پشتە دەستی سڕییەوە و بێدەنگ بوو. غولام خان لە ئاوێنەوە چاوی لێی بوو بەلام چی نەدەتوت. لە سووچێکی گۆڕستان وێستابووم و لە حەشیمەتەکە دەمڕوانی کە چوار دەوری گۆڕێکی سەرئاوەلایان ئەنگاوتبوو. دەنگی شیوەن و ڕۆڕۆ مێشکمی تەنیبوو. سەرم وەژان کەوتبوو و لەبەر ئەوەی کە لەنێو ئەم گشتە خەلکەدا تنۆکە فرمێسکێکم لەچاو نەدەتکا شەرم دایگرتبووم. بۆم نەدەکرا. ڕۆستەم لە سووچێك وێستابوو، کاتێ دیتی گێژو وێژ دوور لە دیتران وێستاوم، بۆ لام هات، وتم: خۆزگە ئەم خەلکەمان بۆ کپ کرابا. ئەم شین و شەپۆڕە چیە ناویانەتەوە؟

لەبن گوێمدا وتی: خۆ ناکرێ بەربەرەکانێ لەگەڵ داب و نەریتی ئێرە بکەی. چیمان لە دەست نایە. کە چووینەوە ماڵ بە جارێ شێوابووم. وتم باشترە بچمەوە ماڵی خۆمان. ڕۆستەم پرسی بۆ کوێ دەچم، پاشان کلیلی ماڵەکەی لە گیرفانی دەرێناو وتی: ئەوێش هەروەك ئێرەیە، وەرە بچۆ ماڵە من. ئەگەر مامیش لەو دەور و بەرانە بوو نەختێ چێشتی پێ بدە. ئەمن وێڕا نەگەیشتم شتێکی پێ بدەم.

-دڵت بە من دەسۆتێ یا مامی؟

-هەرتك.

کلیلم وەرگرت و بێ ئەوە کەس های لێ بێ، وەدەرکەوتم. مامی لەبەر دەرگەبوو، لەسەر پا دەرییەکە خۆی لە گەز دابوو. هەر کە چاوی پێم کەوت یەکجێ قیت بۆوەو خۆی لەبەریەك کێشاوەو چاوەڕوان ما هەتا دەرگە بکەمەوە. دەست بەجێ ڕێگەی چێشتخانەی گرتەبەر. چێشتێکم لەپێش دانا. چوومە دیوی دانیشتن و لەسەر قەنەفە دانیشتم، قەنەفەیەکی دیکە کێشایە پێش و قاچم هاویشتە سەری. سەرم وەپاڵگەکەی کرد و فرمێسکم سەرڕێژ بوون، دوای ئەوە لە خەو راچووم. لەو خەوە هێمنانەی کە لە ژیاندا زۆر کەم سەر لە مرۆظ هەڵدێنێ. خەوێکی کە هەر کە لێی وەخەبەر دێی، دەڵێی ژیانێکی نوێت دەست پێکردووە.

نازانم چەندی خایاندبوو کە بە دەنگی تەلەفۆنی ئاپارتمانی تەنیشتێ لەخەو ڕابووم. ویستم ڕابم و بەر لەوە بە نەبوونەکەم بزانن بگەڕێمەوە ماڵە خانم خانمێ. بەڵام لە تەوەزەلیان مەلاسی سەر قەنەفە بوومەوە، دەنگی زەنگی ئاپارتمان هات، ڕۆستەم بوو. وتم: ئەوە دەهاتمەوە.

وتی: جارێ چ باس نیە. منیش هاتووم چایەکی بخۆمەوە.

-ئەگەر زانیبام چام وەسەر دەنا.

وتی: جا ئەوە هیچ نیە، هەر ئێستا وەسەری دەنێم و چوویە چێشتخانە.

پرسیم: دایکم لێمی نەپرسی؟

وتی: هەموو سەریان بەندە، یەك دوو جار لە پەری خاتوونی پرسی کە ئەتۆ بۆ دیار نیت بەڵام زوو لەبیری کرد. جارێ دەرفەتی چا خواردنەوەیەکمان هەیە. هێشتا شێویان نەداوە.

مامی بە میاو میاو بە دوایدا رایکردە چێشتخانە کە چایەکەی لەسەر مێز دادەنا وتم: ڕێ و رەسمێکی زۆر چەتوون و تاقەت برە.

وتی: چارە نیە. دەبێ ڕێز بۆ مەزنایەتی خانم خانمێ دابنرێ.

-مەگین مەزنایەتی ڕێزی مرۆظ بەم شتانەوەیە؟

-دیارە.

وتم: نەبوونی خانم خانمێم بۆم جێی باوەڕ نیە. مەرگی مرۆڤەکان چەندە سەخت و دژوارە. تا دوایین ساتیش باوەڕ ناکەی خەریکە لە دەستیان بدەی.

بە دەم ئەوە کە دەستی بەسەر پشتی پشیلەکە دادەهێنا وتی: خانمی مەزن لە ڕیزی ئەو کەسانە بوو کە مرۆظ حەزی بە زیندوومانەوەی هەمێشەیی دەکرد.

هەستا چووە ژووری خەوەکەی و کتێب بە دەست گەڕاوە. چەند جار لێکی کردەوەو لاپەڕەی مەبەستی خۆی دۆزییەوەو وتی: گوێ بگرە، دەڵێ: «ئەمن نەمردووم. ماڵم گۆڕیوە، لە تۆدا کە من دەبینی و فرمێسکم بۆ دەوەرێنی زیندوو دەمێنم.»

بەرگی کتێبەکەم وەرگێڕا، هەتا سەردێرەکەی ببینم، وتم: بەڵام بەس نیە.

-چارە نیە.

-بینینی بێ دەسەڵاتی کەسێکی کە ڕۆژێك بۆ ئێمە چەشنی پاڵەوانێك بوو، پڕ ئازارترین کارەساتی ژیانە. سەری قوتووە چوکولاتەکەی بۆم هێنابوو هەڵگرت، لەپێش منی ڕاگرت. دانەیەکم هەڵگرت. خۆشی دانەیەکی دەست دایە قەپم لەگۆشەیەکی گرت: پێم خۆش نەبوو. ئەو چوکولاتەم دانایەوەو دانەیەکی دیکەم هەڵگرت. ڕۆستەم هی خۆی خوارد و دانەیەکی دیکە هەڵگرت، قەپاڵی لە گۆشەی داگرت و نایەوە سەر جێگەی خۆی.

مامی لە لای قاچی پاڵ کەوتبوو و ئەو جار ناجارێ دەستێکی بە سەریدا دەهێنا. چایەکەمان کە خواردەوە، چاوی لە سەعات کرد. بەرە بەرەی شێوخواردن بوو، رابووین، سەری قوتووە چوکولاتەکانی کە نیوەمان قەپاڵ لێدابوو نایەوە دەستم و وتم: هەموو چوکولاتەکانمان قەپاڵ لێ داوە.

-پێکەنی و وتی: چ قەیدیە.

جیهان ناتوانێ لەوە حاڵی بێ کە هیچ قوتوویەکی چوکولات لە ماڵێ ناکەمەوە. ئەگەر لە میوانیەکدا یەکێ چوکولاتم خولّق بکا ئەو پێدەکەنێ و دەڵێ: شوریدە ئارای لەگەڵ چوکولاتی نێو قوتوو نایە، هاوسەری من هەر چوکولاتی بەستەبەندی نەکراو و سەربەستی پێخۆشە.

ئاخ، سەربەستی ، سەربەستی... تێناگەم کام یەك لە ئێمە لە مەبەستی سەربەستی دەگەین؟

*دوایین جار کە چوکولاتم بۆهێنای، بە*
*بە پێکەنینەوە وتت، بەسەرکراونەوە...*

وتم ئەوشەوە هەر هۆشم لەوە نەبوو خەریکی چین.

-دەیجا چ قەیدییە مرۆڤ هۆشی لەسەر خۆ نەبێ، خۆ کارێکی چەوتیش نیە.

-چەوت نیە؟ کوێی باشە؟ ئەگەر باش بوو ئەی بۆچی لەبیرت نەکردووە؟

ئەمن باشی و خراپیەك لەودا نابینم. سەرەڕای ئەمە بۆ وەنازانی بە هۆی باشیەکەیەوە بووە کە لەبیرم نەکردووە.

-زێدەتر لەمەر باشبوونی نائاساییەکەیەوە بووە، کایەیەکی یاساخ بۆ ئەمەیان ، هەم لەبیری تۆ ماوەو هەمیش لە هی منداو لە شوێنێکی دیکەشدا چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا لێمان روو بدا.

وەك ئەمە چێژێکی تایبەت لەم باسە وەرگرێ، وتی: چ کەسێ باشیو چەوتی کارەکان دیاری دەکا؟

کۆمەڵ، بنەماڵە، کۆمەڵ هەمیشە بەسراوەتەوە بە چوارچێوەیەکی لەپێشدا دارێژراو و ئەوە بە ناوی خوو و خدەو یاسادا دەسەپینێتە سەر کۆمەڵ.

- هەروەها مرۆڤەکانیش ئەو هێندەی لە توانایاندایە ئەوان تێك دەشکێنن.

-تا ڕادەیەك ، نەك بە تەواوی.

-قەپاڵ لە چوکولاتدان لە کام خانەدا جێ دەگرێ؟

-بە دروستی نازانم، هەر ئەوە دەزانم کە بۆ من چەشنێك سەربەستی بوو، رزگاری بوو. رزگاری لە دەست قوتووە چوکولات ئەویش لە ماڵ تۆدا.

- ئێمە لامان وابوو ئەم چوارچێوەیەمان بە قەپال لێدان لە چوکولات تێك شکاندووە.

وتم: ئا.

-ئەویش دوور لە چاوی دیترانەوە.

نازانم بۆ تێکشکاندنی شتگەلی دەست و پێ گر چ شتێ پێویستە. هێندێ دەڵێن ئەوین، بەلاّم ئەمن لەمەشیان بەگومانم.

وتی: ئەگەر ئەوین بەس نیە، ئەدی بە کەڵکی چی دێ؟

وتم: رەنگ بێ بەوە کە مرۆڤ ئازار بدا.

وتی: یا ئەوەی کە مرۆڤ لە فەللاقە بدا.

-رەنگبێ.

بە بیستنی دەنگی دەرگا ڕابوو. بەرەو دەرگاکە چوو و وتی ئەمە مامییە لە پشت دەرگا ماوەتەوە.

-هەنووکە لێرە بوو.

هێشتا دەرگای نەکردبۆوە پشیلە خۆی بە ژووریدا کرد. چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕاو هات لمبۆزی بە سووچی مێزەکەوە ساوی. وتی: مامیش وەك تۆیە. ئۆگری سەربەستیەکەیەتی. سەدجار دەڕواو دێتەوە. بۆ وە نابێ هیچ دەرگایەکی لەسەر دابخەی.

پشیلەم بانگ کرد. چاوێکی بێبایەخی لێکردم، هەنگاوێکم لێ هاتە پـێش، بـەڵام چـاوی هەر لە لای ڕۆستەم بوو. وتم، لەبەر ئەمەیانە هێندەم خۆش دەوێ.

-ڕەنگبێ هۆیەکەی هەر ئەمە بێ کە لە لام بەند بووە. سەرنجێکی پشـیلەکەی دا کـە بـە پڕخە پڕخەوە خۆی لە لاقی ئەو دەساوی.

وتم: لووسیت وەبیرە؟ پشیلەیەکی چەند بە هەوا بـوو. ئـاواتی ئـەوەمان بـوو جارێـك لـە باوەشی گرین. خانم خانمێ چەندی خۆش دەویست.

-لووسی یەکێ لەو پشیلە کەشخانە بوو کە من دیبووم.

-ئەم مامییەش لەو نامێنێتەوە. هەر نەبێ بۆ لە باوەشگرتن دەبێ.

-مامی وەك لووسی کەشخە نیە بەڵام روو خۆشە.

وتم: وەك میسیۆخان. لەبیرتە قاقای چۆنی لێدەدا؟

-واتە ئەگەر مامیش توانیبای پێبکەنێ وەك میسیۆخان پێدەکەنی؟

-تێدەگەیشتی دۆستایەتی تۆ لەتـەك لووسـیدا، رقـی ئێمـەی منـاڵی زۆر هەڵدەسـتاند. هەمووومان ئێرەییمان بەتۆ دەبرد.

-بە پێچەوانە مامی هەرچەندی بڵێی بێ هیچ شەرمێك هەرکەس بیلاوێنێتەوە، خۆی لـە باوەشی داوێ.

- نەیدزن؟

- مامی گشتیان دەناسێ. هێندەش بێ ئەمەگ نیە ئیزن بدا کەسێ لەتەك خۆیدا بیبا.

قەرەوێڵە دارینە بچـکۆلەکەی لـە پـاڵ دیـواری ژووری خەوەکەیـدا هەڵکـەوتووە. چـرا و تەسجیلەکەی لەسەر مێزی رەخ قەرەوێڵە دانراوە. مامی دێتە نك قەنەفـە و دەسـتی دەخاتـە سەری و بۆ ساتێ لێم ورد دەبێتەوەو باز دەداتە سـەر قەنەفـە و لـە سووچـێکی کـە پێدەچـێ شوێنی خەوتنی دایمی بووبێ خۆی لە گـەز دەدا. شـریتی سـەر تەسـجیلەکە دەردێـنم. دەبـێ سۆناتی مانگەشەو بێ. هەر ئەو شریتە کۆنەی خۆمان. شریتێکی دیکەی لێیـە کـە تێناگـەم چیە، بەڵام تەسجیلەکەی نوێیە.

*لە چوار دەوری هۆدە دەڕوانم. تەنیا جارێکی*
*کە هاتمە ژووری خەوت قەفەزەی کتێبەکانت*
*دروست کردبوو و گەرەکت بوو پێشانمیان*
*بدەی...*

قەفەزەکان بەتاڵن. چەند قوتووی مقەبای تـەژی لـە کتێـب لـە پـاڵ دیـوار ڕیـز کـراون. کتێبەکانی خۆی، ئەو کتێبانەی من بۆم کڕیبوو. هەڵگێڕ وەرگێڕ دەکەم. «ژان کریستۆف» لـە چوار بەرگ دا لەگەڵ نووسـراوەی شـازدە سـاڵانەم دا: مـەزنترین کتـێبی قارەمـانێتی دنیـا، پێشکەش بە هەڵکەوتەترین پاڵەوانی دنیا، لەپاڵ ئەودا کتێبی «ژیانی بێتهۆڤێن» دانراوە، لە لاپەڕەی یەکەمیدا نووسیومە: باشترین هونەرمەندی دنیاو باشترین وێژەری چیرۆکی هەورەکان.

لە قەفەزە بەتاڵەکان ڕادەمێنم کـە تـەنیا هەریـەك دوو کتێبیـان لـەم لاو لـەولا لەسـەر کەوتووە. بیاوانێکە کە بۆی نیە هیچ شتێ بیر بخاتەوە. ماوەیەکی زۆر هەروا بە سەیرەوە لێـی دەڕوانم.

سەرمایەکی چاوەنوارنەکراو دە پەراسووم دەوەستێ. دەستەکانم لەخۆم وەردێنم.

*دۆلابی جل و بەرگەکانت لە سووچێکی دیکەدا*

*هەڵکەوتووە. حەز دەکەم دەرگەی بکەمەوە،*

*بەڵام ناتوانم. دەترسم لە دنیایەك سەر هەڵێنم*

*کە بۆم نەناسیاوە. پاڵ وەدەرگەی دۆلاب*

*دەدەم و هێدی هێدی دەخزم و لەسەر عەردی*

*دادەنیشم. هەموو شوێنێ بۆی دەرمانی لێوە*

*دێ.*

*بە بۆی دەرمان دەشێوێی و ئێستا ئەم بۆنە دە*

*سەرتاپێی لەشت دا گەڕاوە...*

مامی لە سووچێکی قەنەفەدا خۆی وێك هێناوەو دەستی بە جۆرێ ناوەتـە سەرچـاوەکانی کە تەنیا نیوەیانی داپۆشیوە و بە نیوەی دیکەی جم و جۆڵی منی خستۆتە ژێر چـاوەدێرییەوە. کتێبێك لە نێو کتێبەکان دەردەکێشم و بە هەڵکەوت لاپەڕەکانی هەڵدەدەمەوە. خەتتی بە ژێر ڕستەیەکدا هێناوە، پاشماوەکەی هەڵدەدەمەوەو ڕستە خـەت لێـدراوەکان دەخوێنمـەوە. نـازانم خەتتەکان هی کام یەك لە ئێمەن. هەرتکمان ئەو رسـتانەی پێمـان خـۆش بـوون، خـەتمان بـە ژێریاندا دەکێشا. هەرچی لێی ورد دەبمەوە جیاوازییەکم بەرچاو نایە، تێناگەم کام هی ئـەوە و کامیان هی منە.

کتێبەکان دانە دانە هەڵدەگرم و لاپەڕەکانیان هەڵدەدەمەوە. کتـێبی «رابینسـۆن کـرۆزو» لەنووسینی «دانێیل دۆفۆ» لە بنەوەی کارتۆنێکدا دەیبیـنم. بـە بەرگەکەیـەوە دەیناسمـەوە.

کتێبێکی کە ئەو زۆر حەزی پێ دەکرد. مـن بـۆم کڕیبـوو. ئـەو چـەند جـار و مـن جارێـك خوێندبوومانەوە. چیرۆکێکی کە دڵڕفێنی و سەرنجراکێشی یەکـەی هیچـکات لـە دەس نـەدا. لاپەڕەکانی کتێبەکە زەرد داگەڕابوون و گۆشـەکانیان قـەد ببوونـەوە و شـوێنی قامکـەکانمان بەسەر هەر لاپەڕەیەکی یەوە دیارە.

دەتوانین هەناسەکانمان لەنێو ئەودا هەست پێ بکەین. جارێکیان پێم وت کتێبـە کۆنـەکانم پێ لە کتێبە نوێیەکان باشترە. هەم خوێندنەوەیان ساناترە و هەم ئەوەی کە شـێوە ژیانێکیـان تێدا کە مرۆظ هەستی پێدەکا.

لە وەڵامدا پێکەنی و وتی: زۆر شوکر کە کتێبەکانی ئێمە بە گشـتی قـەدیمی و کۆنـەن و هەرکەس بیانبینێ وادەزانێ کە لە کتێبخانەی گشتی دزیومانن.

لاپەڕەی کتێبەکە هەڵدەدەمەوە، لەجێوە رستەگەلێکی لـێ دەخوێنمـەوە. لـە سووچـێکی لاپەڕەیەکدا لە ناکاو چاوم بـە ڕسـتەیەکی دەسـنووس دەکـەوێ. دەیخوێنمـەوەو تێـی ناگـەم. دەیخوێنمەوە و ئەوە دێ دڵـم لـە لێـدان بکـەوێ. دەیخوێنمـەوە، دەیخوێنمـەوە. دەیخوێنمـەوەو متمانەم پێی نایە. دەستەکانم سڕبوونە و لەشم گەرم داهاتووە. هەردەڵێی هیچ هەستێکم نیە، بەڵام قورسایی کێو بەسەر لەشمەوە هەست پێدەکەم و هەست دەکەم کـە مشـتێك زیـخ دەنێـو چاوەکانمدا دەکوڵن و فرمێسك لەهەر سووچێکەوە دەتکێ. بەزەحمـەت بـۆم لێـك دەکرێتـەوە. کتێبەکە لەسەر کۆشم دەخزێ و دەکەوێتە خوار. هەزار سـاڵ دەخایـەنێ هـەتا دابێمـەوە، لـە عەردی هەڵدەگرم و بە سینگمەوەی دەنێم.

مامی بەرز دەبێتەوە و ئاخێزێك دەکا. دەستم دەنێمـە ژێـر زگـی، لـە باوەشـی دەکـەم و روومەتم دەبەمە نێو لەشە گەرمەکەیەوە. پڕخە پرخەکانی نێوە نێوە دەست پێدەکا و بێـدەنگ دەبێتەوە، لەوە ناگا ئاخۆ داسەکنێ یا نا، خەریکە خۆی لە باوەشم بپچڕێ. لە شوێنی خـۆی دا دەنێمەوە، خولێك لێدەدا و چاوێکم پێدا دەگێڕێ و سەری دەباتەوە نێو خۆی. ئێستاش جار ناجار دەنگی پڕخە پرخەی دێ. کتێبەکە لێك دەکەمەوە. لاپەڕەی سی و حەوت، گۆشەی چەپ ژێرەوەی لاپەڕە خەتتی خۆیەتی.

دەنگی بەرزی مامی لە ژووردا گەڕاوە. لـەپاڵ ئـەوداو لـە رەخ قەنەفـەدا چـۆك دادەدەم، سەری هەڵدێنێ و باوێشکێکی دوورودرێژی دێتێ. ئێستا ئەو تەنیا هەناسـەی زینـدووی ئـەم ژوورەیە و پێدەچێ هیچ دڵەڕاوکێی لە نەبوونی کتێبی بێتهۆوێن نەبێ. دەیلاوێنمەوە و ئەویش وردە پڕخەی دێتێ.

هیچ پشیلەیەك بە ڕادەی مامی پڕخەی بۆم نەکردووە. ڕۆستەم دەیوت: پشیلەیەکی سەر سەری و رووخۆشە. مردووی لاواندنەوەیە.

وتم: زۆریش سەر سەری نیە. ئەمن پێم وایە پڕخە پڕخی ئەو لە چەشنێك هەستی مرۆڤانەوە سەرچاوە دەگرێ.

پێکەنی و وتی: هەرچی تۆ بفەرمووی.

پاشان ئەمەشی وت: پیاو شتی وا دەبیسێ، سەری دەماسێ.

لەژێرەوە لە جیهان دەڕوانم، سەری وەپاڵگەی کورسیلە کردووە و چاوەکانی لێك ناوە. تێناگەم خەوتووە یا بەخەبەرە.

*تەنیا شتێکی کە نالوێ پێشکەشی ئەوی بکەم*
*ئەمەیە کە بۆم ناکرێ لەمەڕ تۆوە لەتەك ئەو دا*
*بدوێم...*

جیهان لەگەڵ زۆربەی کارەکانی من دا نیە. خاوەن بیرو باوەڕێکە کە زۆر لە دنیای من دوورە. دەڵێ تێناگا بۆچ هیچکات لە بابەت بیرەوەرییەکانمەوە نادوێم.

دەڵێم: بیرەوەرییەکان وەك هەوای هۆدەگەلێکن کە سەردەمی جۆراوجۆری ژیانمان تێیاندا ڕابواردووە. دیاردەیەك لەکات و ژیان لە هەموو شتێدا خۆی دەنوێنێ.

دەڕوانمە دەورو بەری خۆم، گشت شوێنێ لێوڕێژ لە ڕۆژەکانمە. پەردە دڕاوەکان، پەنجەرەگەلی پاك و پاقژ، روو مێزی ئوتوو لێدراو، گوڵەکانی نێو باغ، کە هەرکامێکیان ڕۆژێك و سەعاتێکی ژیانمیان لەخۆ گرتووە، سەعات و ڕۆژگەلێکی کە بۆ هەمیشە لە کیسم چوونە و بە هیچ کلووجێ ناکارم وەدەستیان بێنمەوە.

*ئەتۆ لە سەرجەمی ئەو بیرەوەرییانەدا هەی،*
*لەنێوان پەردەکاندا، لەنێو یەك یەکی گەڵا و*
*گوڵەکانی باغچەدا. تەنانەت لەسەر ڕوومێزی یە*
*لێك و لووسە ئوتوو کراوەکەمدا جێگەت هەیە.*
*کە لە پەنجەرەوە لە حەسارێ دەڕوانم ئەتۆ*
*لەنێو پاکی و پاقژی شووشەکاندا*
*ڕۆنیشتووی...*

جیهان لەگەڵ ئەم سووچەی دنیاکەی من دا نامۆیە و ناتوانێ دانی پێدابێنێ. پێدەچێ بیرەوەرییەکی ئەوتۆی لە ژیانی خۆیدا نیە کە بۆی ئازیز و بەڕێز بێ و نەخوازێ لای کەس بیدرکێنێ.

دەڵێ: بیرەوەری واتە رابردوو دەبێ لەبیر کرێ. بیرئانینەوەی رابردوو کات بە فیڕۆدانە.

دەڵێ کە ئەمن خەواڵوو و خەیاڵاویم. سەرکۆنەکردنێك لە شێوە ئاخاوتنەکەیدا هەست پێدەکەم. دەڵێ ئافرەتان لە دنیای خەون و خەیاڵ دا دەژین. پێی وایە کە من لەوانی دی زۆرتر تووشی ئەم نەخۆشییە هاتووم.

لەم هەمووە لەسەرخۆییە، یا خۆی وتەنی بێ لایەنی تەواوی من دڵمەن دەبێ، ناتوانم ئەمە باوەڕ بکەم کە چۆن مرۆظ سەردەمێك کەسێکی لە رۆح و گیانی خۆی زۆرتر خۆش بوێ و ژیان و بەختەوەری بە بێ ئەو بێبەری لەهەر چەشنە واتایەك بێ، پاشان رۆژێك ئەم گشتە خۆشەویستی و ئۆگرییەی بەزەحمەت بیر کەوێتەوە. لێی ورد دەبمەوەو بیر لەمە دەکەمەوە کە ئەگەر ئەوین وەك مژێکی ڕەوییێتەوە، هێمن و کپ و بێدەنگ نادیار بۆتەوە، چ شتێ شوێنی ئەوی گرتۆتەوە؟ ئەوەی کە هێشتاش هەر خۆشم دەوێ شێوەیەك لە ئەوینە و بۆچ هەزار پرسیاری دیکەی بە دواوەیە؟

چاوەکانی هەڵدێنێ، هەر دەڵێی هەست بە قورسایی نیگای من دەکا، ئاخێك دەکێشێ و دەڵێ: شوریدە، شووریدە، شوریدە.

پێت وایە دەڵێ: ئەو کیژە هەڵخریاوە قوتابییەی کە ئارا و قارای لێ هەڵگیرابوو کوا؟

ئەمن ئەوم ون نەکردووە، وەبیرم نایەتەوە.

دەزانم چۆنی لێ ببمەوە. تەنیا کارێکی کە لە دەستیشم دێ قوربانیکردنی ئەوینە. ئەوین دەشێ لە خەیاڵدا بێ و ژیانی لەخەو و خەیاڵدا درێژە پێ بدا.

*پێ خۆشحاڵم کە لە بابەت تۆوە نەمدەتوانی*

*لەتەك ئەو دا بدوێم...*

ماڵە پاپا و خانم خانمێ لەبەر میوانان هێشتا هەر پڕ بوو. ڕێوڕەسمی شێو هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ دەوامی بوو. کەس بۆ رۆیشتن لەزی نەبوو. تەنیا پاپا چووە ژوورەکەی و بۆ شێویش نەهاتە دەرێ. وتبووی چێشتیشی بۆ نەبەن و کارێکیان پێی نەبێ. رەنگبێ لە تەنیایی دا بیری لە ستارەکەی ، لە ژیانیان، تۆران و ئاشت بوونەوەیان دەکردەوە. حەزم لێ بوو بچمە لای و پێی بڵێم کە ئاخۆ دەزانێ بۆچ کیژەکەم ناو ناوە ستارە. بێ شك دەیزانی. بێ گومان

خانم خانمیٚ تێی گەیاندبوو. ئەوان هەتا دوایین ساڵەکانی ژیانیان بە یەکەوە هاودڵ و هاوزمان بوون و ئەمەشیان زۆر بە جوانی لە لای خۆیان پاراستبوو. پاپا هەمیشە لەپاڵ خانم خانمیٚ دادەنیشت. لەتەك یەك دەئاخاوتن و سەری لەو نزیك دەکردەوە، هێدی و هێمن دەستی بەسەر رووبەری فەرشدا دەهێنا و سەری بە نیشانەی دان پیانان دەلەراند. لەو کاتانەدا وا لەسەرخۆ دەدوان کە کەس چی لیٚ تێنەدەگەیشتن. بەڵام هەموو دەیانزانی کە راز و نهێنی گشتیان لە لای ئەو دوانەدایە.

رۆژی دواتر کە چاوم پێی کەوتەوە. ببوو بە تەنیاترین مرۆڤی دنیا. غیرەتم نەکرد تەنیاییەکەی بشێوێنم. واپێدەچوو پێوەندی خۆی لەتەك هەموو کەس هەڵپچڕیوە. ئیتر لای لە کەس نەدەکردەوە. تێك شکابوو. ئەو گشتە شکۆو مەزنایەتی یەی بەجاریٚ داڕووخابوو. نەدەکرا بڵێم چەند ساڵ بەردەگریٚ، ساڵێك، دوو ساڵ، نەمدەزانی، بەڵام پاپا ساڵێکیش خۆی نەگرت، شەش حەوت مانگ دوای خانم خانمیٚ ماڵاوایی لە ژیان کرد.

لە دوایین شەودا ماڵ تا رادەییٚ چۆل بوو. دیارە تاقمێك مابوونەوە کە یەك یەك و دوو دوو لە هۆدەیەکدا خەوتن. پوورە پەری و دایکم لە ژووری خانم خانمێدا خەوتن. نەنە دەدری و نەنە گەورە خەریکی رێکو پێککردنی ماڵ بوون، من و پوورە ماهیش لە ژوورە چکۆلەکەی پاڵ چێشتخانە خەوتبووین. نەنە دەدری وتبووی جێگەکەمان هەر لەویٚ بۆ ڕاخەن. غوڵام خان بەر لەوەی بڕوا، لەبەر دەرگە سەرەتایەکی کرد.

پوورم وتی: ئەتۆ بچۆوە ماڵیٚ. ئەمن لێرە دەبم. هەر لێرە دەخەوم.

غوڵام خان وتی: بەیانی دێمەوە. چاوێکی لەمن تروکاند و وتی: ئێوەش زۆر قەرە چەناغی مەکەن، بخەون. ئیمڕۆ هەموومان لەبەر شەکەتی لە پیٚ کەوتووین.

وتم: ئەم شین و شەپۆڕە، مرۆظ لە هەموو شتیٚ ماندووتر دەکا، روون نەبۆوە ئەم شین و گریانەیان لەچی بوو. خۆشمان کە کپ و بێدەنگ بووین. خانم خانمێش بڕوای بەم شتانە نەبوو. جگە لەمەش زۆربەی ئەوانەش خۆیی نەبوون.

پوورە ماهم ئاخێکی کێشاو چارشێوەکەی لەخۆی شەتەك دا. غوڵام خان وتی: ئەمە دابی ژیانە. چارەش نیە.

نەنە گەورە کەشەفێك چای هێناو لەپێش غوڵام خانی ڕاگرت. غوڵام خان بە دەم هەڵگرتنی ئیستکانێکەوە وتی: کیژم ئەمانە داب و نەریتی ئێمەن.

وتم: باشتر نەبوو ئەم ڕێوڕەسمە بە بێ دەنگی بووایە؟ ئەم گشتە بێ سەرەو بەرەیی و هەراو هوریایە...

گەرەکم بوو بێژم حەزم دەکرد شریتی گۆرانییەکی کە ئەو پێی خۆش بوو دامنابایە، بەڵام دیتم کەش و هەواکەی هەو نیە.

پوورە ماه وتی مەرگی بەوادە بەختەوەرییە. دیارە کە مرۆظ دایکی هەزار ساڵیش بژی دیسان لە دەستدانی سەخت و دژوارە.

غوڵام خان وتی: دژوارییەکەی لەمەدایە کە مەرگیان بۆ ئێمە وەك کارەساتێك لێکردووە کە خۆی کارەساتێکە.

ڕۆستەم کە پاڵی وەدەرگەی چێشتخانە دابوو وتی: شین و شەپۆڕی ئەوان بۆ خانمی مەزن ڕێزو گەورەیی بوو. هەتا نەڵێن کەسی نەبوو شینی بۆ بگێڕێ. تاقمێکیش بۆ خۆیان دەگرین. دەرفەتە ئیدی هەرکەس پڕ بە دڵ بۆ خۆی بگری چون کەس ناپرسێ بۆچی دەگری.

غوڵام خان پێکەنی و وتی: بەمە دەڵێن گریانی پڕ بە دڵ و بێ سەرئێشەیە.

وتم: ناکرێ ئەو دابونەریتە کۆنانە توورِ هەڵدەین؟

غوڵام خان وتی: بەم سانایییەش نیە...

وتم: هەر دەبێ لە شوێنێکەوە دەست پێ بکرێ. ئەی کەی دەکرێ لەجیاتی داب و نەریتە کۆنەکان، زانایی و تێگەیشتوییمان بکەین بە پێوەرەی داوەریمان؟ خەڵك لەوێ زۆر بە ساکاری لەگەڵ مەرگ ڕاهاتوون و ڕێوڕەسمی ناشتنیان بێ دەنگ و ئاساییە. تەنانەت جلی ڕەشیش لەبەر ناکەن و رەنگی جل و بەرگی یان چ پێوەندییەکی بە خەم و تاسەوە نیە.

دنیا کشومات بوو. هەستم دەکرد لەم بەرەی سنووری ئەو وڵاتە بێ ناو و نیشانەی نێوان وڵاتاندا وێستاوم. وڵاتێکی کە ئیتر تێپەڕینی بە وێدام لەبیر کردبوو و نەمدەزانی دەبێ چۆنی پێدا بڕۆی.

پوورە ماهم وتی: خۆ داب و نەریتی کۆن هەمووی هەر چەوت نین و بۆ ئەوە نابێ توورِیان هەڵدەی. زۆریەك لەم دابانە یارمەتی مرۆظ دەدەن کە لە هەمبەر نالەبارییەکاندا بوەستێ. بۆ وێنە هەر ئەو دابی تازییە باری ئێمە. خۆڕاگری لە هەمبەر مەرگدا، ئەویش لە تەنیاییدا ئێجگار دژوارە. ئەمانە بە بۆنەی زیندووەکانەوەیە.

ستارە وتی: خۆ کریسمەس لە لاتان بووم، ئەی ئەم جەژنە چیە؟

هاوارەکە لە ناخم دا کپ دەکەم، دەڵێم: ئەم جەژنە هەر ئەو جەژنەیە کە ئێمە هەزاران ساڵە لە وڵاتی خۆماندا بەڕێوەمان بردووە، رێك وەکوو گشت وڵاتان و سەرجەم خەڵکی دنیا کە سەر وەشوێنێکن.

بە دەم بزەوە دەڵێ: زۆرباشە، خۆشت دەڵێی هەزاران ساڵ بەر لەمە. ئەم رێورەسمە بە لای منەوە سەرنجراکێش نیە. لە دنیای پێشکەوتووی رۆژاواو لە سەردەمی چوونە هەسارەکاندا، چۆن ناتوانی واز لەم داب و نەریتانە بێنی و هەروا پێبەندی ئەم داب و نەریتەی؟

غوڵام خان وتی: شارەزایی لە رێوشوێنی کۆمەڵایەتی و بیرو باوەڕی کۆمەڵگا، مرۆظ یارمەتی دەدا کە ساناتر وەریان گرێ.

-تەنانەت ئەوانەی کە دەست و پێ گرن؟

-تەنانەت ئەوانەی دەست و پێ گرن.

دوایین قومی چایەکەی فڕ کردو وتی: ئەمن ئیتر دەبێ بڕۆم.

پووره ماهم لە جێی هەستا هەتا بەر دەرگە بەڕێی بکا.

مامی دەمی دەلێستەوەو هێور هێور لە چێشتخانە هاتەدەر. دیار بوو چێشتێکی خۆشی لە نەنە دەدری ئەستاندبوو. چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا، هاتە لای رۆستەم و خۆی لە قاچی ئەسووت. رۆستەم لەسەر پێپلەکانی هەورەبان دانیشت. چووم لە پاڵی دانیشتم. لە ئاسمان ڕامام، توێژاڵێك هەوری تەنکی گەواڵ گەواڵ ئاسمانی تەنیبوو. وتم: ئەم هەورانە بێبەری لە هەرچەشنە چیرۆکێك و حەقایەتێکن.

وتی: ئەمشەو چیرۆکێکیان نیە، دەنا هیچ هەورێك بێ چیرۆك نیە.

*ئەتۆ ئەو هەورە پتەو و مەزنانەی کە بە لای*
*منەوە شبی هیچ شتێکیان نەدەدا، بەفەرشێکی*
*مەزن کە دەکرێ رەنگی بەسەر دا هەڵرێژی و*
*گوڵ و گیای لەسەر بکێشی یەوە دەشوبهاند و*
*دەتوت زەینت لەمەڕ بیرو بۆچوونە جۆرا و ـــ*
*جۆرەکان و چیرۆکە جیاوازەکان نەدەشێوا و*
*تووشی ئاڵووگۆڕ نەدەهات...*

وتم: هەر کە لە هەورەکان دەڕوانم پێکەنینەکانی خۆمانم بیر دێتەوە کە هەر دەتوت لە ئاسمانەوە هەڵدەڕژان.

دەستەکانی لێك کردەوە، سەری داهێناوەو وتی: ئاوا وەك فرۆکە خولمان دەخوارد.
چەندە دەکەوتینە خوار و ئەژنۆ و جومگەی دەستەکانمان هەموو دەم پڕ لە زام بوو.
سەیری جومگەی دەستم دەکەم و دەڵێم: شوێنی نەختێ لەو زامانە هێشتاش هەر ماون.
دەستی لە دەستم نزیك دەخاتەوە. ڕەنگی پێستمان تەواو وەکوو یەکە. هەمیشە پێم وابوو ئەو لەمن ڕەشترە. وەك ئەوە کە ڕەنگ و پێست ئەشێ پێوەندییەکیان لەتەك دەسکورتی و هەلو مەرجی کۆمەڵایەتییەوە هەبێ. ئەگەریش وابێ ڕەنگی پێستی من و ئەو زۆر سەیر وەکوو یەك بوو.
بێ هیچ قسەیەك لە دەستی دەڕوانم. تەنانەت بێ ئەوە هەستی پێ بکەم.
دەڵێم: ئەو شوێنەی ئێمەی لێ دەژیاین هەورەکانی نە خاوەنی چیرۆکێکن و نە کۆتایی یەك. مرۆظ ئەو هێندە بە حەسرەتی خۆرەتاوە کە گەلێك جار لای وایە لەبیری کردۆتەوە. هەر بەڕاستی چەند ساڵە کە ئیتر لەسەر ئەو پێپلەکانە دانەنیشتووین؟
سینگی وەپێش دەخاو دەڵێ: ئەمەیان یەکەم بابەتێکە لەم ماڵەم لەبیر ماوە.
-ئەمن لێرە بووم. لەبیرمە.
-ئەمن تەنیا ئەم پێپلەکانە و مەرگی دایکمم لەبیرە و ئەوەی کە حەزم دەکرد گەڕابامەوە لای ئازیزم.
-ئەمن ئەو ڕۆژە لێرە بووم.
چاوەکانم بنووقێنم، دەتوانم ئەو زارۆ* بچکۆلە قژ ڕەش و لوولە ببینم کە دەم و چاوی بە حاستەم دەبینرا.
دەڵێ: ئەمن کەسێکم نەدەدی، دەترسام سەرم بەرز بکەمەوە. تەنیا لووسیم لەبیرە. دواییش تۆم بینی کە گەرەکت بوو بیلاوێنییەوە.
-ئەتۆ دەستت نایە سەردەستم، هەتا ئەو ڕانەکا.

*بۆ ئەوە جارێکی دیکە قورسایی ئەو دەستە*
*بچکۆلە و ئازیزە لەسەر دەستم هەست پێ*
*بکەمەوە حازرم چ شتێ بدەم. نازانم،نازانم...*

وتی: ئەم ڕۆژانە حەزم دەکرد دایکم زیندوو بووایە. پێم خۆش بوو لەلای خوشکمدا مابامەوە.
-گەورەکان زۆر بێ بەزەیین، وەنازانن زارۆکیش دەبێ هەستیان ببێ.

دەڵێ: ئەمن لەو ڕۆژانەدا لە مانای مەرگ نەدەگەیشتم. نەمدەزانی دایکم بۆچ ئیتر لەماڵەوە نیە. فامم نەدەکرد بۆ کوێیان بردووە. لەتەك ئازیزیشدا کە دەچووینە سەر گۆڕەکەی تێنەدەگەیشتم بۆ ناشتوویانە. ئازیزی بەستەزمانیش لە وەڵام دانەوەمدا تێمابوو. هەر دەیوت: وست، ویستی خوا بووە.

-ئەمە وەڵامێکە کە بۆ وێنە دنیا دیتوو و خوێندەوارەکان پێمانی دەدەنەوە. لە هەر جێگەکەوە وەڵامێکیان پێ نامێنێ خوا دێننە گۆڕێ.

بە پێکەنینەوە وتی: ئەمنیش بە ئازیزم وت: خوا بۆ ئەم کارەی کردووە، خوا کارێکی چەوتی کردووەو ئەمن ئیدی خۆشم ناوێ. ئازیز قامکەکانی لێك کردەوەو چەندجار نایە دەمی و گەستی و تف تفی کرد و ئەستەغفیرەڵڵای وت و سەرکۆنەی کردم کە: ڕۆڵە گوناحە ئەو قسانە مەکە، تۆبە بکە، تۆبە بکە.

-تۆبەت کرد؟

-لە ماناکەی نەدەگەیشتم، پێم وابوو دەبێ شتێکی وەك دەسنوێژ گرتن بێ.

-هەر ئەوکاتە بوو کە پاپا ئەتۆی هێنا.

-لێرەش هەموو شەوێ هەتا لەخەو ڕادەچووم هەر دەگریام، دەهاتە خەوم. لەخەودا دەمبیست کە دەیوت دەبێ چاوم لەسەر خوشکم بێ و بچمە لای، کاتێك بە نەنە دەدریم دەگوت کەخەونم بەدایکمەوە بینیوە یان دەمگوت خەونم بە ئازیزمەوە بینیوە کە دەیهەوێ بچمە لای دەیوت: ئەم قسانە مەکە مەزن ئاغا تووڕە دەبێ.

پاپام هاتەوە بیر کە کاتێ سواری ماشێن دەبوو، دەستی ئەوی وەلانا. دەڵێم: پاپا هۆیەکی دروستی بۆ تووڕەبوون نیە.

هەناسەیەکی بۆ دەکێشێ و دەڵێ: هەمووی هەر ترسە.

-گشتمان بە ترسەوە مەزن بووینە. کەس ئەم شتانە فێری مرۆظ ناکا. نە لە قوتابخانە، نە لە نێو کتێبەکان و نە گەورەکان هیچ ڕاستی ناڵێن. هەمووی هەر وست وست. هەتا ئەوەی کە مرۆظ ڕۆژێك بۆ خۆی تێبگا، تازە ئەگەر تێشی بگا.

-وەك هەواڵ.

-هەواڵ؟

دەڵێ: ئەگەر بخوازی سەرەدەرێ لە کار و باری دنیا دەربخەی کەڵکی نیە کە بە هەواڵەکانی ڕۆژانەدا بچیەوە، لەو داکەس قسەی ڕاست و دروست ناکا. ئەگەر بتەوێ لە شتێك بگەی دەبێ

بە هەواڵەکانی چەند حەوتوو لەمەوبەردا بچیەوە. بۆ لە دنیا گەیشتن دەبێ هەمیشە بە هەواڵەکانی مانگی پێشتر دابێیەوە.

*لەوەی کە خاوەنی ئەم گشتە هۆش و ئاوەزەی،*

*خۆشحاڵم...*

دەڵێ: ئەو ڕۆژانە هەر شارەزاییەکی کە لە بابەت مەرگەوە هەمبوو لە نەنە دەدرییەوە بوو.

-دەدری؟

-زۆری ئاگا لێم بوو. ئەگەر ئەو نەبووایە هەرچۆنێکی بووا دەچوومەوە دێ، تەنانەت بە ڕاکردنیش بووایە.

ڕۆستەم لە ژوورێکی بچکۆلەی پاڵ دیوی نەنە دەدری و ئاغاوێردی دەخەوت. خۆ ئەمن ئەوەم وتبوو نەنە دەدری هێندێ شەوانە دێتە ژوورەکەی ئەو، لە سووچێك هەڵدەکورمێ و چارشێوەکەی لە خۆی وەردەگرێ و سەبرێکی دەگری.

دەیوت: جاری یەکەم کە هات زۆر ترسام. نەمدەزانی چ بکەم. پێ وابوو من خەوتووم. برێ شەوانەش دەنگیناڵەکەییم لە ژوورەکەیەوە دەبیست. دەتوت لەخەودا دەگری. دەنگی ئاغاوێردیشم دەبیست. بەڵام چی لێ تێنەدەگەیشتم. هەموو شەوێکی چاوەنواڕی بووم. حەزم دەکرد بێ و توانیبام لە باوەشیدا بخەوم. بەڵام ئەو دەهات شینی مناڵەکەی بگێڕێ. ئەودەم تێنەدەگەیشتم، ترسم بوو.

ئەو ڕۆژەم بیر کەوتەوە کە پاپا خانم خانمێی ڕامووسی و ئەمن قەت وەڕووم نەیەنا بۆوە، دەترسام.

دەڵێم: خانم خانمێ کاتێ دەیوت: بێ فکر و خەیاڵتر لە دەدریم نەدیوە، دەبووا پێم وتبا.

-مەگین ورەمان بوو.

دەڵێم: ئەگەر قاقا پێدەکەنێ مرۆڤ سەری لێ دەشێوێ کە باوەڕی بە گریانەکەی بێ یا پێکەنینەکانی، یا وتەی خانم خانمێ.

-دیسان هەر زۆر شوکر کە دەدری بوو. ئەو بە پێکەنینەکانی کارێکی وادەکا کە مرۆڤ مەرگ بە هێند نەگرێ.

-نازانی ئەم ڕۆژانە دڵم تا چەندە بۆ قاقاکانی تەنگ بووە.

-حەزت لێیە بانگی بکەم؟ هەر ئەوەندە بەسە کە بزانێ لێرە دانیشتووین.

-ئەو ڕۆژانە زۆر دەباڵە خۆیدا بوو.
-خانمە گەورەی زۆر خۆش دەویست.
-جا کێ بوو خانم خانمێی خۆش نەوێ؟
هەستاو بەرەو چێشتخانە چوو و سەبرێکی بانگی نەنە دەدری کرد و پرسی کە هێشتاش چای هەر هەیەو بۆی هەیە ئیسکانێکی دیکەمان پێ بدا؟
نەنە دەدری وتی: بەڵام خۆ هێشتا ئیسکانی پێشووت بەتاڵ نەکردووە.
سەرێکی لە چێشتخانە هەڵێنا، هەرکە بینی ئێمە لە پاڵ یەکتر لەسەر پێپلەکان دانیشتووین وتی: ئەی قورِم وەسەری، ئەوە بۆ لە تاریکایی لەسەر پێپلەکان دانیشتوون.
یەکەم قاقای لێنەدابوو کە نەنە گەورە لە چێشتخانەدا بێدەنگی کرد و ئەو پێکەنینەکەی قووت داوە و وتی: هەر ئێستا چای دێنم، شوکر کە سەماوەر بەردەوام دەکولێ، بەڵام ئێوەش لێرە دامەنیشن، ڕۆستەم بۆ ئەوە وەقسەی بێنێ. پرسی: بۆ، ئەگەر دانیشین چ دەقەومێ؟
دەستی بەبەر دەمی گرت: قسەتان لە دوا دەکەن.
دواتر ڕوانیە ئەو دیوەی کە دایکم و پوورە پەری لێ خەوتبوون. پاشان دەستی ڕاوەشاندو وتی: پەری خاتوونەی بەستەزمانیش ئیتر چاوی هەڵنایە.
بە ئاخ و ئۆخەوە گەڕایەوە چێشتخانە.
کەشەفی چای کە نایە پێش من وتم: نەنە دەدری بۆچ بۆخۆتت نەهێنا.
-شوورا خاتوون ئەگەر چا بخۆمەوە هەتا ئێستا دەبووا سەماوەرێکم بەتاڵ کردباو شەوێش هەتا بەیانی وەخەبەر بم.
نەنە گەورە هەر لەوێ ڕا وتی: ئادی شەوێ هەتا بەیانی پشتی چاوی ئاوەڵا دەمێنێتەوە.
نەنە دەدری دەستی ڕاتلەکاند کە واتا زۆر گوێی پێ مەدە و لەسەرخۆ وتی: ئەم چایەشمان پێ ڕەوا نابینێ. لە بەیانییەوە هەتا ئێستا شتێکم بە قورِگیدا نەچۆتە خوار، هەر ئیشتیام لە هیچ نیە.
نەنە گەورە وتی: خەمت نەبێ سبەی ئیشتیات دەکرێتەوە.
نەنە دەدری لەبری وەڵام ئاخێکی کێشا کە نەنە گەورە لە چێشتخانە ڕا درێژەی بە ئاخەکەی دا. پاشان وتی: بچم جێ و بانی تۆ و خانم خانمێ ڕاخەم. ئەو هەژارە ڕۆژی ئەمڕۆ هەر لە سەر پێیان بووە.

وتم: ئێستا درەنگ نابێ. برۆ چایەکی بۆ خۆت تێ بکە. دەنا وەرە دانیشە ئەمن دەچم چات بۆ دێنم.

وتی: نەنە بە قوربانت بێ، خۆم دەچم دێنم.

نەنە گەورە لە چێشتخانە ڕا چایەکی بۆ ڕاداشت. ها ئەوەش چا.

لەپێپلەکانێك لە خوار ئێمە دانیشت و چاوی لەمن بوو، بەڵام ئاماژەی ڕۆستەمی کرد: شوورا خاتوون، نایەڵێ ژنی بۆ بێنم. ئەتۆ ئامۆژگاری بکە. ئەگەر هەتا ئێستا ژنی هێنابا منالی دەچوویە قوتابخانە.

ڕۆستەم وتی: نەنە دەدری گیان جارێ وەختی ئەم قسانە نیە.

نەنە دەدری ئاخێکی کێشاو وتی: خۆم گەورەم کردووی. ئاوات و ئارەزووم لە دڵدایە.

نەنە گەورە کە هاتبوو لەپاڵ دەرگەی چێشتخانە دانیشتبوو وتی: دەدری هەستە هەستە، دیسان دەست پێمەکە. ئەو بیەوێ ژن بێنێ...

نەنە دەدری قسەی بە نەنە گەورە بڕی و لەژێر لێوییەوە وتی: گاسم پیاو نیە.

ڕۆستەمیش بە هێواشی وتی: تاقیکردنەوەی خۆڕانییە.

نەنە گەورە وتی: بەسە دەدری. لەوە شەوێکدا.

نەنە دەدری ئاخێکی کێشا. بە دەم ڕابوونەوە چاوەکانی بە چارشێوی سڕییەوە و وتی: لەبەر خاتوونە مەزنەکەی خۆم مرم کە شوێنە بەتاڵەکەی دیارە. هەنووکە میوانی پەرییەکانە، خۆزگەم بە خۆی.

ڕۆستەم کە چاوی بە شوێن ئەو داگێڕا وتی: هیچ دەزانی خاتوونە گەورە ماوەیێ لەمەوبەر چی بە من وت؟

-ها؟

-ڕۆژێکیان کە نەختێ باشتر ببوو تەنیا منی لە لا بوو، پرسی: ئەتۆ و شوورا لە منالێدا شتێکتان دەوت، لە هەورەکانەوە دەدوان. لەسەر قەرەوێڵە رادەکشان و سەیری ئاسمانتان دەکرد و پێدەکەنین. چ باس بوو؟ کاتێ بۆم گێڕاوە، پێکەنی و رووی دە لای پەنجەرە کرد و وتی: بریا ئێستاش کرابا ببینم لەسەر قەرەوێڵە بۆی راکشاون و چاوتان لە ئاسمان بڕیوە و پێدەکەنن. دیار بوو کە دڵی بۆ تۆ زۆر تەنگ بووە، وتم: ئەگەر پێتان خۆشە با تەلەفۆنێك بۆ شوورا بکەم بێتە ئێرە؟ ئاخێکی کێشا و چی نەوت، هەر لەودەمەیدا کە تەلەفۆنم لەتۆ کرد. جارێکی دیکە

پرسییەوە: ئیمڕۆ هەورەکانت لە ئاسماندا بینی، چۆناو چۆن بوون. وتم: نا، خاتوونی گەورە، ئەمن دەمێکە چیرۆکێکم بۆ هەورەکان نەگێڕاوەتەوە. دیسان بە ئاخێکەوە چاوەکانی لێك نا.

فرمێسك هەروەك چۆمێکی رەوان و هێمن و بێدەنگ بەسەر گۆنامدا دێتەخوار.

وەردەچەرخێ سەبرۆکە دەستی لەسەرشانم دادەنێ و لەژێر لێویەوە دەڵێ: دیارە کە زۆریش لە ئێمە خافڵ نەبووە.

*خۆزگە قەت مەزن نەبووباین. بریا هیچکات*
*بەم تەمەنە نەگەیشتبام کە ئەوینداربم و*
*دەست لە هەموو شتێ بشۆمەوەو بڕۆم و*
*چاوم لەپشت سەری خۆمەوە بێ و بیر و هۆشم*
*بە لای ئەو کەسانەوە بێ کە جێیم هێشتوون.*
*چەند خۆش بوو منداڵ بواین، لەتەك یەگدی*
*بە دەوراندەوری حەساردا رامان کردباو*
*خەمی شتێکمان لەبەر نەبووبایە...*

جارێکی دیکە روانیمە ئاسمان، هەورەکان کەمتر ببوونەوە، ئاسمان ساو و تریفەی مانگەشەو چەشنی هەزاران چۆم کە لەهەر گۆشەو کەنارێکەوە بەرێ بێ ئاسمانی تاریك و نوتەکی رووناك دەکردەوە.

وتم: بڕوانە ئاسمان چەندە ساوە، هەورەکان باریان کردووەو خۆت وتەنی ماڵ چۆلە.

ئەویش وەك من چاوی لە ئاسمان بڕی و وتی: راستە، ماڵ چۆلە، ئەمشەو کەس لە ماڵەوە نیە.

لە درێژەی قسەکانیدا وتی: هەرکە ئاسمان بەم چەشنە دەبینم لەپڕ ئەوەم بە زەین دەگا کە ئاخۆ بێتهۆوێن مانگەشەوی بۆ ئەم ئاسمانە نووسیوە، یا روو لەهەر شوێنێ بکەی ئاسمان هەر ئەم رەنگەیە؟

دەستی لەسەرشانم هەڵگرتووە.

وتم: ئاسمان لە گشت شوێنێ هەر ئەم رەنگەیە. جیاوازی یەك لە ئارادا نیە، ئیدی ئەمە لەمن قبووڵ بکە کە سەرجەمی ئاسمانەکانم دیوە تەنانەت ئاسمانی بێتهۆوێنیش.

دەڵێ: بێتهۆوێن بۆمان فرە قورس بوو.

-بێتهۆوێن خۆی دنیایێکـە، سـووکی و قورسـی بـۆ نیـە، هـەروەك حـافز، هـی هـەموو کەسێکە، بۆ هەر کەسێکیش بە چەشنێ.

دەڵێ: بۆ من گەلێك قورس بوو. ورەم نەبوو.

-سەردەمی گەنجایەتیمان بووایە دەمانتوانی.

- ئەتۆش کە دەستت بەم شتانە ڕادەگەیی.

-لەبیرتە دەتوت نەخۆشەکان دەکرێ بە مۆسیقاش شفا بدرێن.

-ئێستاش لەسەر ئەم باوەڕە هەم. بەلاّم لێرە کەس لایەك لەم بابەتانە ناکاتەوە.

-ئاگاداری ئەمە هەی کە لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەیەك کراوە. ئەو منالاّنەی کە لـە بابـەت ئاکار و کردەوەیانەوە گرفتیان هەیە بە هۆی مۆسیقاوە چارەسـەر دەکـرێن. لـە بەرنامەیـەکی تەلەویزیۆنیدا دیم. بریا بۆم تۆمار کردبای.

-کەوابوو وتەکەی منیش زۆر بێ جێ نەبووە.

-وتەکانی تۆ هیچکات بێ جێ نەبوونە، بۆچ هێندە خۆبەکەم دەگرێ؟

پیاوێکی گەنج بە ڕاڕەوی شەمەندەفەردا تێدەپەری. بە شوێن جێگاوەیە و لـە قەنەفـەکان دەڕوانێ، بەلای ئێمەدا تێدەپەڕێ. قژی سەری رەش و کرژ و چڕ و پرە، ئەگەر چاوەکانیم دیبا، دەمتوانی بڵێم ئێرانی یە یا نا. شکم لە ئاسیایی بوونەکەیدا نیە. بـێ ئـەوە ئـاوڕ بدەمـەوەو چاوی لێ بکەم، زەینم بە خۆیەوە خەریك دەکا. سەر و پۆڕی شێوەی کەسانی خوێندەوار دەدا. پێدەچێ ئیش و کارێکی لەبار و ژیانێکی باشی بێ.

ڕۆسـتەم تـەواوی پێداویسـتییەکانی ژیـانێکی لـەبار و سـەرکەوتووانەی بـوو. ئـەو پێداویستیانەی کە مرۆڤانی دەور و بەری بەهەر شێوەیێ بۆیان لوابا هەوڵیان دەدا بەر بە ئاکام گەیشتنی تواناییەکانی بگرن. بێشك بلیمەت نەبوو. بەلاّم خـاوەنی هـۆش و توانسـتێکی وەك من و براکانم و کوڕە پوورەکانم بوو، خۆیشی بەمەی دەزانی. ئەگەر لە بنەماڵەیەکی جیاواز دا لە دایك بووبا دەیتوانی بۆخۆی کەسایەتی یەك بێ. باوکم وەك پاپا پێی وابوو ئەگەر لە دیپلۆم سەرتر بچێ یا ئەگەرکوو کراسەکەی ببێ بە دوو ئیتر نە خزمەتیان پێدەکاو نە سەری لەبەریان دادەنوێنێ. پاپا دژی چوونە قوتابخانەی بوو و باوکیشم دژی دیپلۆم وەرگرتنی.

پوورە ماه کاتێ هەواڵی بۆ دایکم رێ کردووە بڵێی نەڵێی هەرەشـەی کردبـوو کـە ئەگـەر نەهێڵێ ڕۆستەم دەرس بخوێنێ، بە بنکەی تەندروستی و لەش ساخی رادەگەیەنێ.

دەڵێ: خوشکم لە مناڵەکانی دەدا. هەرچی پێم وت کەڵکی نەبوو. تێناگەم ئەم دەست وەشاندنە لەکێ فێر بووە.

-بێ گومان لە شووەکەی.

-نا، نا. ئەو لە مناڵەکانی نەدەداو کاری نازێشی بەدڵ نەبوو.

-باشە.

-ئەو وەختە تەسجیلێك و چەند دانە شریتی حەقایەتم بۆ برد. وتم هەرکات هارِ و هاجیان کرد دایان نیشێنەو ئەم شریتەیان بۆ دانێ و خۆشت گوێی پێ بدە. لە مناڵەکان مەدە. دەموت ئەمن بە ڕادەی پێویست وێم کەوتووە کە بزانم یانی چی. بەڵێنیم پێ دا ئەگەر لە مناڵەکان نەدا غەسالەیەکی بۆ بکرِم. ئێستا خۆی یەکێ لە لایەنگرانی هەرە باشی شریتگەلی حەقایەتە.

بە دوای بێدەنگییەکی کورتدا دەڵێ: دیارە سانا نەبوو. ئەگەر مناڵەکان دەستیان لەتەسجیلەکە وەردەدا لێی دەدان. جارێکیان ناچار بووم پێی بڵێم ئەگەر لە مناڵەکان بدا دەیانهێنمە لای خۆم و ناهێڵم چاوی پێیان بکەوێ. باوکیشیان دانیشتبوو. لەپێشدا پێکەنی و وتی مەگین مناڵەکانی بێ باوکن. بەڵام هەرکە بینی زۆر بەرِق و تووڕەم ، ترسا. تاوانێکیشی نەبوو. لەنێو دەر و جیرانان‌دا ئەگەر یەکێك لە مناڵەکانی نەدا، عەیبێکی هەیە. زۆر بیرم لێکردەوە بۆ ئەوەی ڕێگایەك بدۆزمەوە.

وتم: ڕێگەیەکەشت دۆزی یەوە. ئەتۆ هەمیشە بۆ هەر کارێ دەتوانێ ڕێگەیەك بدۆزییەوە.

لە ژێر لێوییەوە وتی: جگە لە ڕێگای خۆم.

کوڕێکی مناڵکارە کە دەستی لەناو دەستی باوکیدایە، لە شەمەندەفەر دادەبەزێ. پیاوە کە دەستی مناڵەکە دەکێشێ و کوڕە بە دوایدا ڕادەکا. پیاوە لووتی داژەنیوە و بە هەشتاو هەنگاو دەنێ. کوڕە دەگەڕێتەوە لای شەمەندەفەر، پێدەچێ دابەزینەکەی پێ خۆش نەبێ و هێشتا هەر دڵی لە لای شەمەندەفەرە. پیاوە جارێکی دەستی دەکێشێ. مناڵەکە وەك راکردن بەدوایدا دەچێ. چاوی لێدەکەم. هەر لاجانگی دەبینم. لاجانگێکی کە روون نیە چەند جار زللەی وێکەوتووە و بۆ پاراستنی روومەتی دەستی پێوە گرتووە.

لە ئاسمان دەڕوانێ ، پەڵەهەورێك بە سووچێکدا تێدەپەڕێ، دەڵێم: هەر دەڵێی هەزار ساڵ بەر لە ئێستابوو کە گشت خۆشی و ناخۆشی یەکانمان لە چیرۆکەکانی ئەم هەورانە دا خۆیان دەنواند.

هەر دەڵێی دوێنێ بوو.

دەڵێم: چەند خۆش دەبوو مرۆظ توانیبای ئەو پەڕی مەرگ بدۆزێتەوە. ئەرێ هەر پێت وایە دنیایەکی دیکەش هەیە؟

سەری دەخورێنێ: خۆ بێ هیچیش هەر نابێ.

دەڵێم: تاقمێك لەسەر ئەم بڕوایەن مرۆظ چەندین جار دەمرێ و دەژێتەوە هەتا بەو پەڕی مەزنایەتی دەگا.

بێدەنگ بووە. دەڵێم ئەگەر کرابا جارێکی دیکە لەم دنیایەدا سەر هەڵدەینەوە، حەزت لێ بوو لەچ شوێنێ سەر هەڵدەی و چکارە بی؟

دەستێك بەسەری دادێنێ و دەڵێ: ئەی تۆ؟

-ئەمن حەزم دەکرد لە شوێنێ لە دایك بم کە ئیتر وانەبێ بەجێی هێڵم.

-ئەی خۆت حەزت نەدەکرد بڕۆی؟

-مرۆظ خۆ هەمیشە هەڵبژاردنەکانی خۆی بە دڵ نیە. ئەودەم کە ڕێگەیەکمان دەکەوێتە بەر، یەکێ لە دژوارترین ئەرکەکانی ژیان ئەمەیە کە مرۆظ بتوانێ بۆ مانەوە و ژیان لە شوێنی هەڵوێستی خۆی بگرێ، ئەوەی کە دەڕوا نەلێرەیە و نە لەوێ. هەمیشە لایەکەی دیکەیە. دەڵێی خەرمانەیەك چوار سووچی تەنیوە.

بە دەم بزەوە دەڵێ: خەرمانە خۆ شتێکی خراپ نیە. بەتایبەتی ئەگەر خەرمانەکە پیرۆز بێ.

بێ ئەوە سەرنجێك لەپێکەنینەکەی بدەم دەڵێم: خەرمانە نیە. بڵقە. مرۆظ هەمیشە و لە هەر جێگایەکەوە تەنیا بە هۆی بڵقێکەوە لە دیتران جیا دەکرێتەوە. گەلێ جار لەبیری دەکەی، بەڵام تەنانەت لەم کاتگەلەشدا هەر لەخۆوە هەستی پێ دەکەی و ڕێگەیەکیش بۆ لەبەرچاونەگرتنی لە ئارادا نیە، هیچ ڕێگەیەك. تەنیا خووی پێ دەگری، هەر هێندە و بەس.

ئەو باشتر لە گشت کەسێ بوو و دەمتوانی گرێی دڵمی لە لا بکەمەوە. تەنانەت باشتر لە براکانی خۆم کە هەر کامێکیان لە زانکۆ خوێندبوویان و خاوەن ئیش و پلە و پایەیەك بوون، باشتر لە جیهان کە دەوری دنیای بەسەر کردبۆوەو لە زانستدا پسپۆڕ بوو. باشتر لە فاختەکە نیوەی دیکەی گەنجایەتیم بوو.

دەڵێ: بۆچ نەگەڕایەوە. یانی هیچکات حەزت لێی نەبوو؟

-باس لە ویستن و نەویستن نـەبوو. لـەوێ جـیگیر ببـووین. بـەڵام ئـەم جـارە هۆشـم خـڕ دەکەمەوە سەریەك...

-کەوابوو سەودایە دەکەی؟

دەڵێم: ئا، بۆ نەیکەم، سەر لەبەری ژیان هەمووی هەر سەودایە. تۆچی؟

-ئەی ئەمن؟ ئەمن چی؟

-ئەگەر بڕیار بوو جارێکی دیکە...

-بەر لەم پرسیارە پرسیارێکی دیکە هەیە کە لەپێشدا دەبێ ئەو بپرسی.

-پرسیاری چی؟

-مرۆظ بەر لە هەر شتێ دەبێ بزانێ لە راستیدا حەزی لێیە و حەساو و سەودای تۆ...

دەپەڕمە نێو قسەکەی و دەڵێم: پرسیار ئەمە نەبوو. وتم کە گریمان ئەگەر...

-حەزم دەکرد باڵندەیەك بوومایە و بمتوانیبا ئازاد و سەربەست بێرەو بەوێدا هەڵفڕیبام.

لووتم هەڵدەقرچێنم: چاو ئەمن، گەرەکمە لێرە دوور نەکەومـەوە و ئـەتۆش دەتـەوێ دوور بیەوە.

ئـەمن کـەی وتوومـە دەمـەوێ دوور بکەومـەوە. دڵنیابـە هێنـدە دوور ناکەومـەوە. دەمدۆزییەوە.

*بەڵام فرە، فرە، فرە دوور کەوتوویتەوە...*

روو تەختییەکە وەلا دەنێم، چرای قەراخ قەرەوێڵە دەکوژێنمەوەو دەخزێمە ژێر پەتۆ. سەروە سەرین دەکەم. بۆی دەرمانخانەی باوکم لەوێش هەردێ. چاوەکانم لێك دەنێم، ئاخۆ ئافرەتێك لە پاڵ ئەودا لەسەر قەرەوێڵە خەوتووە، دەنگی هەناسەی ئەوینێك لەو هۆدەدا دەنگی داوەتـەوە؟ بۆی لەشی ئێستاش هەر لە نوێن و بانەکەوە دێ.

*پەتۆکە دەکێشمە سەر دەم و چاوم و بۆی*
*لەشت پڕ بە سی یەکانم هەڵدەمژم...*

شوێن پێی فرمێسکەکان هەست پێ دەکەم کە بە هەرتك لای گۆنامدا دەخـزێ و لـەناخی قژەکانمدا رۆ دەچێ. دەستێکی گەرم بەسەر لەشمدا دەکشێ. بە دەوری شانمدا دەگەڕێ و من بـە خۆیەوە دەگوشێ. شانەکانم دەتەنێتەوە و لەسەر خۆ دادەخزێتەخوارەوە. لەسەر کراسـەکەمەوە بە تەواوی لەشمدا دەگەڕێ، لە هەموو جێگەیەك دەوێستێ. خۆم دەسپێرمە ئەو دەستە گەرم و ناسیاوانەی کە بۆ یەکەمین جار لە لەشم دەسوێ و دەستەکانمی بە دەوریدا دێنم. دەمێکی گەرم

به ددانگەلێکی چەرموو و پتەوەوە بەسەر دەم و چاومدا دەخولێتەوە، دەمم دەکەمەوە هەتا ئەو هەناسە تینووە دزە بکاتە نێو هەست و نستم. چاوەکانم دەنووقێنم. لە ماڵێکدا تەنیای تەنیام و لە ناخی خەوێکدا ڕۆ دەچم کە حەز ناکەم لێی وەخەبەر بێم. سەدساڵ دەخەوم.

پوورە ماهـ دەستی لە ماڵەکەی وەرنەداوەو هەموو شتێ لەسەر جێگەی خۆیەتی. مرۆظ پێی وایە هەر ئێستا دەرگە دەکرێتەوە و غولام خان وەژوور دەکەوێ. دەنگی لە هۆدەکەدا هەست پێ دەکەم و شوێنەکەشی هەروا دیارە. دەڵێم خۆزیا دەنگیم تۆمار کردبایە، ئەمەم کە بە پوورە ماهـ وت سەری باداو وتی: بە خوای قسەت بۆ کردم.

راستی دەوت خۆ ئەم دەنگە قەت لەبیر ناچێتەوە.

تەنیا شتێکی کە تووشی گۆڕانکاری هاتووە نیگای پەرێشان و کپ و بێدەنگی پوورمە کە دەڵێی بەشەکەتیەوە بە شوێن ئەودا دەگەڕێ. ئەمن یەك بین دەئاخۆم، لە غولام خان دەپرسم: دەڵێم: هیچ دەزانی چەندەم خۆش دەویست، ئەو دەیزانی؟

پوورم ئاخێکی حەسرەتبار هەڵدەکێشێ و سەری با دەدا و دەڵێ: غولام تۆی وەك منالی خۆی خۆش دەویست. ئەودەم رۆیشتی لەمنت زۆرتر پەرۆش بوو. دڵی پوورت تەنگ دەبوو.

لێی دەپرسم حەزی لە گۆڕینی ماڵەکەی نیە. پێی وانیە ئەوێ بۆ ئەو مەزنە، تەنیایی ئازاری نادا؟

دیسان ئاخێك دەکێشێ و دەڵێ: زۆر کەس ئەمە دەڵێن. بەڵام دەستم لێرە بەر نابێ. لەهەر سووچێکی ئێرەدا غولامم لەلایە. بۆ هەر شوێنێ بچم تەنیاتر دەمێنمەوە. ئێمە هەرتکمان لە بانك وامان وەرگرت ئەم ماڵەمان پێکرێ. هەموو شتەکەییمان بەیەکەوە دروست کرد.

پێکەنینێکی خەماوی بە لێویەوە خۆ دەنوێنێ: لەوێدا ژیانێکی فرە خۆشمان لەتەك یەکا رابرد و تێیدا پیر بووینە. گەلێك خۆشی و ناخۆشیمان بە یەکەوە بووە کە هەر لەم چوار دیواریەدا لێمانی رووداوە. جا بۆ کوێ بچم کە ئەم پیاوە بەستەزمانەم بەم رادەیە لێم نزیك بێ.

*من و تو تەنانەت خانوویێکی ئاواشمان نیە...*

فرمێسکی بە سووچی چارشێوەکەی دەسڕێتەوە. دەڵێ: حەز ناکەی فاختە ببینی؟ ماوەیەك لەمەوبەر تەلەفۆنی لێم کرد. دەیوت خەریکە خۆی تەلاق دەدا یا تەلاق دراوە.

-ئاخری ملی وەبەر ئەم کارە نا؟

-بۆ، ئەوەی ئێمە دەماندی شووەکەی چ کەموکوڕییەکی نەبوو.

-هەر ساڵەکانی هەوەڵێ دەبووا ئەمکارەی کردبا نەك دوای چوار منالْ.
-بە مەبەستی  سەرەخۆشیکردن تەلەفۆنی کردبوو.
-سەرە خۆشی؟
-بۆ غولاْم.
دەڵێ: زۆر سەخت و دژوار بوو. بۆ هەرتکمان هەر دژوار بوو، هەتا بیست وچوار سەعات ئێشی هەر هەبوو. خوا دەزانێ ئەو پیاوە بەستەزمانە چەندە ئازاری دەکێشا. خۆ مرۆظ سەر لە کاروباری خوا دەرناکا. لەو دوایی یانەدا تەنانەت قسەی ژنەکەشی لێ گران دەهات، زۆرجار بە سەبری دەئاخاوت. لێرە و لەوێی ئەم دنیایە دەدوا. دەیوت حەز ناکا جیم بهێڵێ، بەلاْم ئیدی لە تام دەرکەوتووە. دەیوت گەرەکییە هەتا دوایین کاتەکانی ژیان هەر لە لای من بێ. هەتا ئەمن ئیزنم نەدا نەڕۆیی. راستییەکەی ئەمەیە کە هیچکات هیچ کەس مردنی پێخۆش نیە.
دەڵێم: چۆن؟
-شەوانە لە ژێرەوەی قەرەوێڵەکەی دەخەوتم. شەوێکیان حاڵی زۆر تێك چوو. شەکەت ببوو. دەتوت خەریکی پاڕانەوەیە. دەستم گرت و ماچم کرد و نامە سەرگۆنام. هەناسەیەکی لە ناخەوە کێشاو چاوی لێك نا، گەلێ جار ئەمەم بە مێشك دادێ کە ئەگەر رێگەم نەدابا دەیتوانی هەتا کەی زیندوو بمێنێ. بەلاْم هێزو توانای ئازار و جەزرەبەکێشانەکەییم نەبوو.
پشتە دەستی هەڵدێنێ و ئەو فرمێسکە دەسڕێتەوە کە تکابوویە سەر گۆنای.
دەڵێ: رۆستەم لەبەر دەم دەرگەی هۆدەوە خەوتبوو. ئەو نەبووایە ئەو بەستەزمانەش...
دەڵێی دەستێك سینگم هەڵدەدڕێ. پژکۆژەکانی* کراسم بە سەر یەکەوە لێك دەگووشم و دەستم دەنێمە سەر لێوی.

*هەر مەرگێ خاوەن حەقایەتێکە. جگە لە*
*مەرگی تۆ. دیتران لە گێڕانەوەی حەقایەتدا*
*دلاْوان. بەلاْم مەرگی تۆ بۆ من بێبەری لە*
*حەقایەتە...*

دەستم دەگرێ و دەنێتە سەر کوڵمیە، ساتێ لێم ورد دەبێتەوە. لێوی دەلەرنەوە، گەرەکییە شتێ بدرکێنێ. بە چاو لێی دەپاڕێمەوە و ئەویش لێم دەڕوانێ. قسەکەی لە دەمیدا دەجاوێ و ئەم جارە دەڵێ: بگری. ئەگەر بگری ئەهوەن دەبیەوە.

سەرێك با دەدەم.

دەڵێ: گریان کلۆکۆ دادەمرکێنێ.

دەڵێم: ئەگەر بگریم ئەشێ دایمە بگریم. تا هەتایی هەر بگریم، فرمێسکم کە دابڕژێ ئیتر بەری ناگیرێ.

دەستم دەنێتە نێو دەستەکانی خۆی. دەڵێ: تەلەفۆن لە فاختە دەکەم بێ چاوی پێت بکەوێ.

-بەڵێ، ماڵە دایکم دایمە قەرەباڵغە، ئەمن وازی ئەم شتانەم نیە.

جیهان چاوێك لە سەعاتەکەی دەکا و دەڵێ: ئیدی هێندەی نەماوە بگەینە جێ و بیردەکەمەوە: بۆ کوێ؟

بە پوورە ماه دەڵێم: دەبێ بمێنمەوە، ناتوانم بگەڕێمەوە.

دەڵێ: بمێنەوە، هەر چەند پێت خۆشە بمێنەوە.

دەڵێم: بەڵام دەبێ بڕۆم ناکرێ بمێنمەوە.

## ( ١٤ )

ڕۆژێ هەمووی هەر بەم خەیاڵەوە خەریکم. نازانم لەگەڵ خۆم لەگەڵ ڕۆژەکانم لەگەڵ قسەکان و مرۆڤەکان چ بکەم. فاختە قۆناخەکانی جیابوونەوە لە شووەکەی تێپەڕ دەکا. واتە بەشە هەر گرینگەکەی تێپەڕاندووە. سەری پڕ داخی با دەدا و دەڵێ: دەبووا سێ ساڵ تێپەڕ بووبا هەتا تێبگەین کە ڕەنگە ڕۆژێك بۆ بیانووگەلی فرە بێ کەڵکتر لە دژایەتی برا یا حەوتووی یەك دوو سەعات خۆدزینەوە لە وانەی زانکۆ، لە خواست و ویستەکانمان چاوپۆشی بکەین. تازە لێمان حاڵی دەبوو کە زیرەکایەتی و هۆشمان تا چ ڕادەیە. بۆ وێنە ئێمە قوتابیانی سەرکەوتووی قوتابخانە بووین بەڵام بە ڕادەی دەنکە جۆیەك لەوانەی ژیان نەدەگەیشتین.

-سەرەڕای ئەمەش ئێمە هێشتا لەو کەسانە بووین کە لە زۆر شت تێدەگەیشتین. کتێبمان دەخوێندەوە...

-جا چ کتێبێك، باوەڕ بکە هڕەمان لە بڕەی دەرنەدەکرد. هەر ورتە ورتمان بوو و بەس. ورتە ورتی زیادی. ئەودەم ئاشقیش دەبووین.

-ئەویش چۆن.

-تۆ کە لە کیس چووبووی.

-ئەشق لە نیگایەك دا.

دەڵێ: خۆشییەکەی لەمەدا بوو کە گومانت دەکرد کەست لێ حاڵی نیە. بەڵام ڕوخسارت لە هۆگانێکەوە هاواری دەکرد.

ئەتۆش زۆر بێ مەیل نەبووی لە هەموو شوێنێ جاڕ بدەی، بەڵام ئێستا ئەوەم بۆ بۆتە پرسیار کە چۆن گەیشتوومەتە ئێرە، بۆ چووم، بۆ جیگیر بووم. بۆ مناڵم بوو، بۆ شووم کرد.

پێدەکەنێ و دەڵێ: دیارە ئەشێ جێی پرسیارەکانت بگۆڕی. بۆ شووت کرد، بۆ مناڵت بوو.

لەخۆم دەپرسم: وانەگەلێکی کە خوێندوومن بە کەڵکی چیم هات؟ بە کەلکی چی ئەو هات؟

دەڵێ:  ئەو غەریبایەتی یەی کە تۆی لەمن ئەستاند. ئێمەی لە یەکتر هەڵاوارد.

دەڵێ: ئەگەر منالْم نەبووایە هەر یەکەم رۆژ لێی جیا دەبوومەوە. کاتێ وێژەریم بەلاوە نا دەبووا لەوە گەیشتبام. بەڵام بەم گشتە داوایە ئێستا بەوە گەیشتووم کە چەندە درەنگ وەخۆ هاتوومەوە. ئەشقێکی لەخۆبایی یانە، ئازارێکی تاهەتایی بە دواوەیە.

حەوتووی سێ رۆژ لە تاقیگا دا کاری دەکرد.

دەڵێ: زۆر حەزم لێ بوو کاری وێژەری دەست پێ بکەمەوە. هیچ دەزانی ئۆگری یەکی زۆرم بە وێژەری بوو.

لێی دەپرسم: باشە بۆ نەچووی، خۆ لە تاقیگا باشترە.

-تەنیا کارێك بوو کە هەمیشە حەزم لێ بوو و هیچ کاتیش رێگەیان پێ نەدام. ئێستاش ئیتر گومان ناکەم بتوانم و ئەو دەنگەشم نەماوە.

لێوەکانی بە لێك دەنێ، *: ئەوانەی کە لە ناوت دەبەن، هەر وازت لێ نایەنن. دەنگم ئەو تەڕی و زولاڵییەی جارانی لەدەست داوە. مەشقەکانم لەبیر چۆتەوە. خۆ تەمەنیش نوێ ناکرێتەوە. ئەوەی ئەتۆ لە کار دەخا، باش تێدەگا چ بکا. لەبیرتە پێستم چەندە ئەستوور بوو؟ بەڵام چارەنووست هەرچی بێ هەر ئەوە.

گەرەکمە بڵێم ئەی لەم نێوەدا مەڵەکانی خۆت بوو بەچی؟ حەز دەکەم بڵێم تاوانبارکردنی ئەم و ئەو سانایە. ئەو سەردەمێك لەوپەڕی جوانی و لەباری دابوو، بەڵام ئێستا پیرو تێك شکاوە و نیگا تاسەبارەکەی ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ. دەستم دەخەمە سەردەستی. بیر لەمە دەکەمەوە کە پیاوێك دەتوانێ بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ئافرەتێك تێك بشکێنێ و ئافرەتەش هیچکات پەی بە قولایی کارەساتەکە نەبا.

دەڵێ: قەدری ژیانت لەبەر بێ... ژیانێکی بێ گرێ و گۆڵت هەیە.

گەرەکمە بڵێم: تۆ چووزانی.

بەڵام لێی دەگەڕێم قسەکانی بکا.

دەڵێ: ئەتۆ ئەو رەنج و کوێرەوەری یەی ئێمەت نیە.

-...

-شووەکەت خۆشی دەوێی و گوێ لە مشتتە.

-...

- هەر منالێکیشت هەیە و لەمەش ئاسوودەی کە خەریکی کارو ژیانی خۆتی و وەکوو ئێمە سەرقاڵی ئەم گشتە بیروخەیاڵ و گرفتە نیت.

-...

-تۆ بەختەوەری. بەختەوەرتری. ئەمن وام لێهاتبوو کە ئیتر بوون و نەبوونی جیاوازی یەکی بۆم نەبوو و دەیتوانی بیست ساڵی دیکەش بژی.

لە ئاست نیگا سەمەرەکەمدا، پێدەکەنێ و دەڵێ: مان و نەمانی جیاوازییەکی بۆم نیە. ئەودەم کە گومان دەکەم مردووە ئاسوودە ترم. دەکرێ ببێ، دەکرێ نەبێ. باشتر بوو مردبا. ئەمن چیم کە خۆ لەکاروباری خوا هەڵقورتێنم. دیارە گەلێ جار سەرەدەرێ لە کاری خواش دەرناکەم. ئەم چەشنە مرۆڤانە دەمێنن کە شەڕی دنیا پەرە پێ بدەن، ئەوجار کەسێکی وەك رۆستەمیش...

ئەو دەستە نادیارە جارێکی دیکە لە سینگم ڕودەچێ. دڵم وەختە بتەقێ.

دەڵێ: قەدری ژیانت لەبەر بێ. ئەمنیش ژیانی خۆم بە گشتی لەدەست داوە. جگە لەنالەباری و داخ و کەسەر چیم بۆ نەماوەتەوە. ئەمن چیم پێ نەماوەو خراپتر لەوانەش هێندێ جار شوێنە بەتاڵەکەی هەست پێ دەکەم. بەڵام ئەتۆ، تەنانەت مردووەکانیشت باشتر لە مردووەکانی ئێمەن. دەتوانی لە تەواوی تەمەنی خۆتدا بیری لێ بکەیەوە و هەروەتر لەبیرکردنەوەی تێر نەبی. دەتوانی بڵێی رۆستەمێکت بوو دەستان، بەڵام ئەمن چیم بۆ وتن هەیە؟

فرمێسکەکانی بە پشتە دەستی دەسڕێتەوە. دەڵێ: قسوورەکە لە ئێمەوە بوو. چاومان بە سەرییەوە نەبوو. قەدرمان نەزانی ، بەرەڵڵامان کرد، دەسەڵاتەکەیمان دابوویە دەست خۆیەوە. ئێمە لە بانەوە لێمان دەڕوانی.

ئەمن کپ و بێ دەنگم و ئەویش بە سەیرەوە لێم دەڕوانێ و دەڵێ: وەرە بەیەکەوە بچینە مەشەد. دەتوانی لەوێ دۆعا بکەی. نازانی مرۆڤ چەندە هەست بەئاسوودەیی دەکا. ئەمن هەر کە دڵم دەگیرێ تەنانەت بۆ یەك دوو رۆژانیش بێ دەچمە زیارەت. برێ جار بەیانی دەچم، ئیوارێ دەگەڕێمەوە.

هەست دەکەم دەستی ناوەتە سینگم و دڵمی راکێشاوەتە دەرێ. دڵم لەنێو دەستەکانیدا پەلەقاژەیەتی. دڵێکی کە نەشتەرگەر بە پارێزەوە لە سینگی نەخۆش دا وەدەری دێنێ و دڵ هەروا لەسەر هەوای خۆی لێدەدا. دەستەکانی دەنێمە نێو دەستم. دەڵێ: هەر ئەورۆ و سبەی جێبەجێی دەکەم. دەچین و یەك دوو ڕۆژێك، ئەگەر حەزیشت لێ بێ حەوتوویێك دەمێنینەوە،

دەکرێ پوورە ماهیشت ببەین، ئەویش لەم ماوەیەدا ئازارێکی زۆری دیوە. دایکە لە لای منـاڵان دەمێنێتەوە ، خۆشم ماوەیەکە نەچوومە. جـا چ لەمـە باشـتر. دەچـین و ئـاخ و ئـۆخی دڵمـان هەڵدەڕێژین. زیارەت دڵی مرۆظ ئەهوەن دەکاتەوە.

دەترسم لەنێو دەستەکانیدا مردبێ.

دەڵێ: بە شەمەندەفەر یا فرۆکە، هەرتك راحەتن، بەڵام بـە فرۆکـە زووتـر دەگـەینێ. دیـارە شەمەندەفەرەکانیش خۆش و ڕاحەتن، ئەگەر حەزت لێ بێ دەتوانین بە شەمەندەفەر بچین.

شەمەندەفەرێکی فرە کۆن و قەدیمی دوو هێڵ ئەولاتر بـە نقـەنق بەلامانـدا تێپـەڕی. چـەند واگـۆنێکی زیـاتر نیـە و ڕەنـگ بـێ بـۆ چـاککردنەوە بـبرێ یـا لـەنێوان شـارە چـکۆلەو دوور کەوتووەکاندا بێ و بچێ. لەو شەمەندەفەرانەی کە بۆ ئەنتیکەخانەکان خاس و لەبارن.

خانم خانمێ ساڵێ چەند جار دەچوویە سەفەرە زیارەتی یەکان. یەك دوو جار چۆتە مەشـەدێ. یەك دوو جاریش لەتەك پاپادا چووە. جارەکانی دیکەش لەتەك هاوڕێیانی و خۆی وتەنی سەفەری ژنانـە بـوو. دایکـم ئەگـەر هـاوڕێی یـەکێك لـە پوورەکـانم دەچـوون یـەك دووێـك لـە منالّـە مەزنەکانیشـیان دەبـرد. لـەو سـاتانەدا ئێرەییمـان بـەو بەختەوەرییـە دەبـرد کـە ئـەوان پێـی گەیشتبوون. منالّەکان کە دەگەڕانەوە بێ ئەوە هەست بە ماندوویی بکەن، ئـەوەی دیبوویـان بـە تێرو تەسەلی بۆیان دەگێڕاینەوە. هەرچی دیبوویان و بـۆ هـەر شـوێنێ چـووبوون و هـەر چـییان خواردبوو. هەر لەو ساتەوە کە پێیان دەنایە شەمەندەفەر و تا ئەوکاتە کە لە تـاران دادەبـەزین، بێ هیچ کەم و زیادی یەك باسیان لێوە دەکرد، ئەگەر یەکیان شتێکی لەبیر کردبـا ئـەویتر بـیری دەخستەوە و لە کۆتاییشدا دەیانوت هێندە زۆرە کە بۆیان ناکرێ سەرجەمی بگێڕنـەوە. لـەو دەم دا رووخساری ئێمە سەرنجڕاکێش تر لە تاریف و پێهەڵاگوتنەکانی ئـەوان بـوو، کڕوکـپ چـاومان تێدەبڕین. ئاوی لێو و لیچمان شۆڕاوەی دەبەست و هەر حەسرەتمان بۆ دەمایەوە. ئەگەر یەکێ لـە گەورەترەکانمان لەو کەش و هەوای دا دەدین جرتێکی رادەیەڵا و دەیوت: زۆری قەراخ مەکێشن و کە چاوی پێمان دەکەوت وا بە حەسرەتەوە گوێمان بۆ وتەکانیان هەڵخسـتووە دەیـوت: زۆریـش باوەڕ مەکەن، هەمووش هەر هەو نیە.

چۆن دەکرا باوەڕ نەکەین، هیچ شتێ وەك دڵی منالّ بەشتەکان زوو باوەڕ ناکا. پاشـان لەبـەر ئەوە گەورەترەکان ئێمەیان لەتەك خۆیان نـەدەبرد بۆڵـەبۆڵ و نووکـە نووکمـان لەسـەر دەکـردن. ئەوانیش بۆخۆ دەرهاویشتن دەیانوت: ئەمجارەی کە مەزنتر بوون.

ئاواتمان بوو هەرچی زووتر بە تەمەنێك بگەین کە بتوانین لە تەکیاندا بچین، خەیاڵێك بوو کە زۆریش وێنەدەچوو بتوانین پێی بگەین.

هەتا ئەوەی کە رۆژێکیان خانم خانمێ وتی، ئەگەر مناڵێکی خاس بم ئەمن لەتەك رۆستەم و نەنە گەورە و نەنە دەدری دەباتە مەشەد.

متمانەم پێی نەدەکرد و ڕۆستەمیش باوەڕی نەدەکرد. دەیوت درۆ دەکەم و گەرەکمە گاڵتەی پێ بکەم یا هەر بەڕاستی چاکم نەبیستووە.

پیشم دەخواردەوە کە: مەگین تا ئێستا درۆم پێ گوتووی؟

-نا، بەڵام لەخۆتەوە قسە دەکەی، خانمی گەورە ئەگەر تۆ ببا ئەمن نابا.

چاوەکانی لێورێژی داخ و پەژارە دەبوو.

-سوێند دەخۆم. بە گیانی دایکم سوێند دەخۆم کە خانم خانمێ خۆی وتی کە من و تۆ لەتەك نەنە گەورەو نەنە دەدری دا دەباتە مەشەد بەڵام بە مەرجێ مناڵێکی خاس و ژیر بم.

-ئەی ئەمن؟

-تۆش دەبێ مناڵێکی خاس بی، وتی بە شەمەندەفەر دەچین.

-بەراست؟

هێندەی گوتەوە کە وەشك کەوتم. گوڕاندمە سەری کە هەر نەدەبوا پێم وتبا. خانم خانمێ وتوویە هەر من لەتەك خۆی دەبا.

لێوەکانی بەیەکەوەنا، سەری بەرداوە و سەبرێکی وتی: خۆزگەم بە خۆت.

دەستم هاویشتە سەرشانی: ئەگەر ئەتۆ نەبا ئەمنیش ناچم.

-دیسان لێی دووپات کەوە.

-ئاخر دەترسم ئەگەر بپرسم...

-ئەگەر لەبیری چوو بێ؟ ئەگەر نەپرسی لەبیری دەکا.

راستی دەوت، مەزنەکان هەمیشە هەر بەڵێنی یەکی دەیاندا لەبیریان دەکرد. هەتا ئەوەی کە رۆژێك ورەم وەبە خۆم ناو لەسەر سفرە لە دایکم پرسی: دایکە، ئەمن مناڵێکی خاسم؟

باوکم پێکەنی و وتی: مەبەستت لە خاس بوون چیە؟

دڵم ڕاچەنی. دایکم وتی: باشە چۆنە ئەوانەت بە خەیاڵ داهاتوون؟

براکەم وتی: مەگین مناڵ، خاسیش دەبێ؟

باوکم وتی: ئێمە کە نەمان دیوە.

بەهەر چەشنێ بوو تامی زارم خۆش کرد و وتم: خانم خانمێ وتوویە ئەگەر منـاڵێکی خـاس بم لەتەك خۆییم دەباتە مەشەدێ.

هەموو تێکڕا وتیان: چی؟

دەبووا بێدەنگ بووبام، بەڵام وتم: ئەویش بە شەمەندەفەرێ... خـۆ ئـەمن منـاڵێکی خاسـم وەنیە دایکە؟

هەموو لە یەکتر ڕامان. دەتوت گشتیان لەبیری ئەمەدان کە چۆن دەتوانم بـە پێـی توانسـتی خۆیان لەم دەرفەتە کەڵك وەربگرن.

ئەو ڕۆژە لەسەر سفرە کەس لە دەمی دەرنەچوو بڵێ مناڵێکی خاسم یـا نـا. کـەس نـەیوت نیگەران مەبە دەچیە سەفەرێ. خوشك و براکانم بە هۆی ئێرەیـی یـەوە، دایکـم بـۆ ئەمـە کـە دەرفەتێکی دەست کەوتبوو لەبیر بارهێنانی من دابێ و باوکم هەر هیچ پێـی وانـەبوو بـۆ ئەمـە دەبێ قسەی مناڵیش بە هێند هەڵگری.

بۆ یەکەمین جار واتای نادادپەروەریم هەست پێ دەکرد، بێ ئەمە بە دروستی لێی تێ بگەم.

نەمدەزانی چ بکەم؟ واباشە لە ماڵە خۆمان بمێنمەوە هەتا لە چـاوی خـانم خانمـێ نـەدیوبم و ڕۆژی سەفەر دابێ و ئەو لەمە نەگا کە من مناڵێکی خاس بووم یا خراپ. یا ئەوەتا بچمە لای و گوێ لە مشت و بێ دەنگ بم تا بزانێ چ مناڵێکی خاسم؟

پێوانەی خاسی و خراپی بۆم ببوویە پرسێکی چارەنووسـاز، لـێم ڕوون نـەبوو کـەی دەچـینە سەفەرێ، هەر بەڕاستی دەچین یا نا، ورەی پرسینیشم نەبوو، پێمانیـان وتبـوو پرسـینی زۆر خـۆ تێهەڵقورتاندنە و مناڵ نابێ خۆ لە هەموو کارێك هەڵقورتێنێ. خوشك و براکانم تا منیـان دەدی دەیانوت: ئەگەر ئەم کارە بکەی، ئەگەر ئەم کارە نەکەی، دایکە یا خانم خانمێ تێدەگەیەنین.

*لەتۆ دەپرسم: تۆ تێدەگەی مناڵی خاس بوون*
*یانی چی؟*
*دەستت بەسەرت دادێنی و دەڵێی: باشە، تو*
*مناڵێکی خاسی و...*
*-ئەتۆ چی؟*
*-ئەمن نازانم، ڕەنگ بێ ئەوانەی کە لە ماڵە*
*دایك و باوکیاندان خاسن، بەڵکوو من خاس*
*نەبووبم کە باوکم منی هێناوە لە لای مەزن*

*ئاغای داناوم.*

*-خۆ تۆ کارێکی چەوتت نەکردووە.*

*-ئەمن کە چیم وەبیر نایە.*

*لە ئاسمان ڕوانیم، هەورەکان بە دوای یەکدا*

*ڕێچکەیان بەستبوو، وتم: ئەگەر لەسەر*

*قەرەوێڵە ڕاکشێین و لە هەورەکان وردبینەوە*

*خاسە یا خراپە؟ و تۆ شێواوتر لەمن وتت*

*نازانم و بەم چەشنە ترسەکەم بوو بە گومان و*

*دوو دڵیێ...*

نەمدەزانی ئەگەر چێشتەکەم هەمووی بخۆم خاسە یا خراپ، ئەگەر شەوێ زوو بخەوم و بەیانی زوو ڕابم کارێکی باشە؟ لەتەك منالّەکان کایە بکەم یا لە سووچێك دانیشم؟ لیباسەکانم زوو زوو بگۆڕم یا ئەوەندە پاك و پاقژی ڕاگرم کە پێویستییان بە ئالّوگۆڕ نەبێ... بچمە چێشتخانە یارمەتی نەنە گەورە بدەم یا کارێکم پێیان نەبێ و وەخۆیان نەخەم. ئەگەر برسیم بوو بڵێم برسیمە یا هەتا وادەی خۆی دەنگ نەکەم؟ نەمدەزانی، هەر هیچم نەدەزانی.

گەلاّی یەك یەکی گولّەکانمان بەیەکەوە لێدەکردەوە: دەچینە سەفەرێ ، ناچین. بە قامکەکانمان فالّمان دەگرتەوە: دەچین، ناچین.

هەورەکانی ئاسمان سەرجەم شەمەندەفەرێك بوون کە بە شوێن یەکتردا ڕێچکەیان بەستبوو و چاوەنواڕی ئێمە بوون. هاوارمان دەکرد: کەوابوو دەچین، کەوابوو دەچین، و قاقا پێدەکەنین. بەلاّم هەر زووەکی دەستمان بە دەمانەوە گرت کە کەس دەنگمان نەبیسێ.

ئەگەر لە مالّە خۆمان دەمامەوە ترسم لەمە بوو خانم خانمێ لەبیری بچێ و من لەتەك خۆی دا نەبا. رام ئەسپاردە رۆستەم: ئەگەر ئەوان وەڕێ کەوتن و منیان لەتەکدا نەبوو حەتمەن لەبیرت بێ بە خانم خانمێ یا نەنەگەورە یا نەنە دەدری بلّێی بەجێم نەهێلّێ.

بەلّێنی پێ دەدام بە بێ من ناچێ.

دەموت: لەبیرت نەچێ وەبیریان بخەیەوە. و بۆ ئەمە کارەکەم توند بگرم دەموت: ئەگە ئەمن نەبەن، ڕەنگە ئەتۆش نەبەن.

سەری با دەدا و چاوەکانی تەژی لە حێوەت و سەرگەردانی بوو. دەستی یەکترمان دەگرت، لە یەکتر رادەماین و پێدەکەنین.

حەزم دەکرد منداڵێکی خاس بم، بەڵام ڕۆژێ سەدجار بۆڵە بۆڵم دەبیستەوە کە بۆچ هێندە سەر سەریم، بۆچ وەك منداڵانی خەواڵووم لێهاتووە. و هەموو جارێ حەزم دەکرد دەستم بە دەمیانەوە بگرم کە کەس دەنگیان نەبیسێ. هەر دەتوت گشتی یان تەنیا وشەیەکیان دەزانی کە ئەویش: ئەگەر ئەم کارە بکەی بە خانم خانمێ دەڵێم نەتبا.

ئەودەم لەگەڵ یەکتر بڕیارمان دا لە پوورە ماه یا غوڵام خان بپرسین منداڵی خاس بوون یانی چی. پوورە ماه باوەشی پێداکردم و وتی: خانم خانمێ ئەگەر بەڵێنی دابێ دەتبا.

وتم: بڕیار وایە ڕۆستەمیش ببا.

غوڵام خان بێ ئەوە سەری لە سەر کارێ هەڵگرێ لە ژێر لێوی یەوە وتی: گەرەکی یە ئەو بۆ بەردەستی نەنە دەدری ببا.

پوورم بە دەست ئاماژەیەکی بۆ کرد و بە منی وت: دڵنیابە ئەگەر بەڵێنی دابێ بتانبا، دەتانبا.

-ئاخر وتوویە ئەگەر منداڵێکی خاس بم.

پوورە ماه پێکەنی و منی بەخۆیەوە گوشی: مەگین تو منداڵێکی خراپی؟ دڵنیابە کە منداڵێکی خاسی هەر بۆیە خانم خانمێ وتوویە دەتبا.

ئەی ڕۆستەم؟

غوڵام خان دیسان لەژێر لێوی یەوە وتی: ئەم قسانە بۆیە دەکەن سەر لە منداڵ چەواشە شێوێنن.

پوورم وتی: وست، و ئاماژەی بەمن کرد و دڵنیای کردم کە ئاگای لێدەبێ لەبیریان نەچێ کە منیش لەتەك خۆیان ببەن.

-ئەی ڕۆستەم؟

-ڕۆستەمیش.

بەڵام بەم هەمووە شەوانە دیسان مۆتەکە دەیگرتم و لە خەونم دا دەمدی شەمەندەفەر بە بەر ماڵی ئێمە دا تێدەپەڕێ. لە حاڵێکدا کە منیان لە ماڵەوە بەند کردووە. کەس بە دەردی بێ قەرارییەکانی دڵە بچکۆلە شەش حەوت ساڵانەکەی منی نەدەزانی، بۆ ئەوە کەس لێم ناڕازی نەبێ هەوڵم دەدا خۆم تەنیا بم.

*لەو خەونە ئاڵۆزانەی کە دەمدی بۆتم دەگێڕاوە*

*و ئەتۆ سەرت با دەدا و دەتوت تۆیش هەموو شەوێ*

*لەم چەشنە خەونانە دەبینی...*

خۆشترین رۆژی ژیانمان ئەوکاتە بوو کە لەبەر ئێزگەی هێڵی ئاسن لە سەیارەکەی پاپا دابەزین. دەستمان لەناو دەستی یەکتردا بوو و بە ڕاکردن لەو پێپلەکانانەدا گەڕاینە خوار کە بەرەو سەکۆی شەمەندەفەر دابەسترابوو. عەلی خان کە شۆفێری پاپاش بوو رۆستەمی بانگ کرد و باوەگەورەش گوڕاندی یە سەری کە بۆ کوێ سەری داخستووە دەڕوا، بۆچ بە هانای نەنکەکانەوە نایە؟

رۆستەم زووەکی دەستمی بەردا و ڕای کرد بەستەیەکی لە نەنکەکان وەرگرت. بۆ ئەوە پێ بە پێی ئەو بڕۆم هەنگاوەکانم شل کردەوە. بەستەکە قورس بوو و بە زەحمەت هەڵی هێنابۆوە. ویستم دەستێکی لەگەڵ بدەمێ. لەسەر خۆ وتی: گوێی پێ مەدە. مەزن ئاغا لێمان تووڕە دەبێ.

لە حێوەتی ئەمە نەکوو ئیزنی هاتنی پێ نەدەن بێدەنگیم لێ کرد. شەمەندەفەر بە شکۆیەکی تەواوەوە لەژێرەوەی پێپلەکانەکان وێستابوو، باوەڕم نەدەکرد. لام وابوو لە سەفەرێکی خەیاڵاویدام، حەزم دەکرد دەستی رۆستەم بگرم، بەڵام بەڕاکردن چووم بە دەستی خانم خانمێدا نووسام. لە خۆشی وەك مێوژۆکە هەڵدەلەرزیم و خۆم بە لەشییەوە دەگووشی. پاپا لە باوەشی کردم و روومەتمی ڕامووسی. رۆستەم لەپاڵ ئەودا وێستابوو. بە بێ وازی لێی ڕوانی، لەپشت ملی دا و وتی بۆ یارمەتی نەنکەکان نادا؟ لە باوەشی هاتمە خوار و بە دوای رۆستەم دا سوار بووم کە خەریك بوو بەستەیەکی پاڵ دەدایە نێو شەمەندەفەر. هەتا شوێنی خۆمان دۆزی یەوە و دەرگاکان داخران و شەمەندەفەر وەجووڵە جووڵ کەوت و بەرێ بوو، تا ڕادەیەك زۆری پێ چوو. پاپا ببوویە درنجێکی دلۆڤان. لەوبەر پەنجەرە وێستابوو و دەستی ڕادەتەکاند و دەتگوت بەرەو دواوە پاڵ درا. روومەتم بە شووشە وەنا و لە هەوڵی دیتنی دا بووم، بەڵام لێم دوور دەکەوتەوە و ماوەیەك دواتر لەبەرچاو ون بوو. شەمەندەفەر بەتاوتر دەڕۆیی و دەنگی بەرزتر دەبۆوە، ئەو نەدەبینرا بەڵام ئێمە هەروا دەستمان بۆ را دەتەکاند و دڵمان ئەهوەن دەبۆوە. لە سەفەر دابووین. دەستمان لەناو دەستی یەکتردا بوو و لە خۆشیدا لێوەلەرزەمان بوو و هبەڵبەز دابەزینش لەوپەڕی خۆی دا.

هەر ئەوەندە بەسە هەتا قامکەکانم بەیەکەوە جووت بکەم، چاوەکانم بنووقێنم، چاوم بەو دوو منداڵە بکەوێ کە روومەتیان بە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە ناوە و بەختەوەرترین منداڵانی سەر گۆی زەوین.

ئێستاش هەر بە بینینی شەمەندەفەرێکی کە لە سەکۆی تایبەتی خۆیدا وێستاوە و چەشنی ئاژەڵێکی دیل کراو پشووی سوارە بە هەسکە هەسکەوە* چاوەنواڕی دوایین فیکەی فەرمانبەرە، تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دێم. زارۆی نیگەرانی نێو ناخم رادەپەڕێ. دڵەخورپێ گەلێکی کە ئێستاش بەیناو بەین هەروا سەرم لێ هەڵدێنن. هەر کە پێ دەنێمە نێو شەمەندەفەر، لەنێو خەڵکێکی کە هەرکام بەرەو شوێنێ دەچن. لەنێو ژاوەژاوێکی نادیار و ترسێنەردا دەکەومەوە بیر ئەو دوو منداڵەی کە دەستی یەکتریان گرتووە و سەرسام وێستاون، ئەگەر لەبەر منداڵی خاس بوون نەبووبا، بە هەموو هێزیانەوە لە خۆشی یان دەنگیان لێ هەڵدەهێنا.

شەوێ بەتانییەکیان بۆ رۆستەم لەسەر عەردی کووپە راخست هەتا لە سەری بخەوێ. نەنە گەورە گەرەکی بوو من لە تەنیشت خۆی بخەوێنێ. وتم: حەز دەکەم لای رۆستەم بخەوم.

خانم خانمێ وتی: بڕۆ بخەوە. نەنە لێی گەڕێ بچێ بخەوێ، بەمەرجێك بخەون و قسە نەکەن.

رۆستەم زۆری پێ خۆشبوو و زوو جێی بۆم کردەوە. عەردی کووپە رەق و تەق و تاریك بوو و دەنگی تەگەرەکان ترسێنەر، دەتوت لە ئێمە زۆر نزیکن. وەك دوو پەلەوری حەپەساو لە یەکترمان روانی. بە یەکەوە نووساین هەتا گوێیەکانمان وردە وردە بە دەنگەکە راهاتن. سەرینەکەمان وەلانا، گوێمان بە عەردی کووپە وە نا و دەمانوت لە بری لە ئاسمان رامان و حەقایەت وتن بو هەورەکان، گوێ لە دەنگی تەگەرەکان دەگرین. دەنگی ئەو تەگەرانەی کە پێدەچوو بەرەبەرە نزیکتر دەبوونەوە و ئاهەنگێکی رێك و پێك و ترسێنەریان دووپاتە دەکردەوە، رۆستەم لەبن گوێمدا وتی: ئەمە لە حەقایەتی هەورەکان خۆشترە، وەنیە؟

لە هەوڵی ئەمەدا بووین شێعرێك بۆ ئەو وەدۆزینەوە، وشەکانمان دەگوتەوە، دەنگەکانمان لاسایی دەکردەوە، وەشوێنیان دەکەوتین و دەمانژماردن، یەك دوو... یەك دوو... پێمان سەیر بوو. پێدەکەنین، دەترساین و دەنگمان بەرزتر دەبۆوە، لەو سەردەماندا گەورەکان دەنگیان لێ هەڵدەهێنا و وست وستیان لێ دەگرتینەوە. چرا گەورەکانیان دەکوژاندەوە، کووپە لەنێو رووناکایی چراگەلی بچکۆلەدا و ئێمەش کە لە عەردی کووپەکەدا خەوتبووین، لە تاریکیدا نوقم بووین.

تازە دەهات چاومان گەرم دابێ رۆستەم سەرینەکەی کێشایە لای خۆی. سەرم خزییە سەر بەتانی، بە ئاخێزیکەوە سەرینەکەم راپسکاند. ئەو رایپسکاند و ئەمن رامپسکاند، دیسان رایپسکاندەوە، دەستم هەڵێناو بە هەموو هێزمەوە لە سینگیم راکێشا، بۆساتێ کپ لێم ڕاما. لەپی دەستم خوراند. خانم خانمێ بە چاوی خەواڵووە وە وتی: منداڵ وست، بخەون.

نەنە دەدری کە لەسەر قەنەفە راکشابوو، وەرسووڕا، دەستی درێژ کرد و نقوورچێکی لە قۆڵی ڕۆستەم داگرت و هێدی وتی: زەلیل بی بخەوە، لێگەڕێ ئەو منالە بخەوێ. ویستی ئەمن لەوێ هەڵگرێ و لە لای خۆی بخەوێنێ. توند دەستیم وەلاناو وتم: وازبێنە ئیدی.

*تۆ دەستت نابووە سەر قۆڵت و هێدی وتت:*
*ئاخ... نیگای ترساو و داچڵەکاوی ئێمە لە*
*تاریك و روونی کووپەدا لێك هالآبوون. سەرم*
*هێنایە پێش و وتم: ئێشا؟ سەرت راوەشاند و*
*بە دەم داماڵینی قۆڵتەوە جارێکی دیکە وتت:*
*ئاخ... نا، و دەستی مشت کراوت بە چاوتدا*
*هێنا، نەمپرسی کامیان زۆرتر ئێشا. ئەتۆش*
*چیت نەوت. سەرینەکەمان سافکردەوە،سەرمان*
*نایە لای یەك، خەوتین و گوێمان بە رەوتی*
*شەمەندەفەرەوە ئەسپارد و هێور هێور لەخەو*
*ڕۆچووین. نیوەشەو لەخەو رابووم، شەمەندەفەر*
*لە ئیزگەیەك دا ڕایگرتبوو. گوێم لە دەنگە بێ*
*ناڕوونەکانی دەرەوە گرتبوو. دەنگی پڕخەپڕخی*
*خانم خانمێ و نەنە گەورە لەگەڵ هەناسەی*
*قووڵ و هێمنی نەنە دەدری ژووری کووپەی*
*تەنیبۆوە. ئانیشکی نەنە دەدری لە*
*چارشێوەکەی هاتبووە دەرێ. دەستی بشکێ.*
*تۆ خەوتبووی. دەستم نایە سەر قۆڵت و*
*چاوەکانم نووقاند. لەپی دەستم دەسۆژاوە...*

هەموو جارێ کە پاپا لەوی دەدا بە خۆم نەبوو چاوم دەنووقاند و حەزم بە مردنی دەکرد. ڕۆستەم لەژێر تەوژمی لێدان و کوتانەکانی ئەودا خۆی وێك دەیەناوە، چاوی لە لای من نەدەکرد، لەلای من نەدەگریا و هەتا چەند ڕۆژ چاوی پێم هەڵنەدەهات.

*بەرەو عەردە تاریك و روونە بچکۆلەکەی*
*کووپەی شەمەندەفەر دەچم. بەرەولای*

*ئەو دوو منالەی کە لەوێ خەوتوون.دەزانم*
*کە نیگا داماو و ترساو و کپەکەی تۆ هەمیشە*
*لەتەك مندا دەبێ، چ بۆ خۆت بێ، چ نەبێ...*

فاختە دەستی خستۆتە ناو دەستم و چاوەنواڕی وەڵامەکەمە. دەزانم ئەوکاتە دەگەڕێمەوەو داخی ئەو قسانەم بە دڵەوە دەمێنێ کە دەبووایە پێم وتبا. کاتێ بەسەر پێشخانی دەرمانخانەدا دەچەمێمەوە هەتا نوسخەی نەخۆشێك بخوێنمەوە، ئەودەمەی دەرمانەکانی پێدەدەم و چلۆنایەتی دەکارکردنیانی پێدەڵێم، داخی ئەو شتەی دەمگرێ کە دەبووایە پێم وتبا و نەموت.

کلکەوانەی لەقامکدا نیە. دیارە دەمێکە بە نینۆکەکانی دا نەهاتۆتەوە. سەرم لار دەکەمەوە، دەستەکانی دەنێمە نێو دەستم و بە روومەتمەوەی دەنێم و دەڵێم: ئەمن ئەشێ بگەڕێمەوە.

لێبڕاوم لە یەکێ لە دەرمانخانەکانی نزیك ماڵماندا خەریك بم. لەم دەرمانخانەدا بە پێچەوانەی باوکم کەمتر دیاریمان دەبێ و پێوەندی یەکی کەمترمان لەتەك کڕیاردا هەیە، دەنگەکان دەبیسین و ڕەنگە تاقمێکیان بە دەنگەوە بناسین. جارو بار ئەگەر دوکتۆری سەرەکی یا خاوەن دەرمانخانە لەوێ نەبێ، بە کڕیارەکان رادەگەین. بەڵام هیچ کات پێوەندییەك لەتەك ئەواندا پێك نایە، لە دەرمانخانەدا کارو بارمان لە پێوەندی لەگەڵ دەرماندایە نەك خەڵك. بەڵام بۆچوونی من لە دەرمانخانە هەمیشە هەر ئەو بۆچوونە دەبێ کە لە گەڕەکە کۆن و ناسیاوەکەی سەردەمی منالێم و دەرمانخانەکەی باوکمدا هەیە.

دەبووا رۆستەمم تێگەیاندبا بە هەر شێوەیێ بۆی دەلوێ خۆی لەگەڵ بۆی دەرمانەکان ڕابێنێ. چونکە ئەمن سەرم بەهەر شوێنێ دا کردووە، هەموو جێگەیەك گەڕاوم و ڕێگەیەکم نەدۆزیوەتەوە.

دەڵێ: بە خوا هەر هیچ نەگۆڕاوی و هەر ئەو شووڕا سوێرە پڕ خوێ یەکەی لەو پەڕی بێتامی دای، گەرەکمە بگەڕێمەوە یانی چی؟ هێشتا نەهاتووم بگەڕێمەوە. دەستت لە کار هەڵگرتووە. کەوابوو بیانووێکت نەماوە. هەرتك بێعار و بێکار. ئیتر لەوە باشتر چیت گەرەکە؟

دەڵێم: با بمێنێ بۆ جارێکی دی.

-وادەی سەرجێخوونم پێ مەدە. ئەمن دڵم هەر بەتۆوە خۆش کردبوو.

-ئێستا نۆرەی تۆیە کە بێیە ئەو لایانە.

-بەم منالانەوە؟

-ئەمانە ئیدی مەزن بوونە بە دایکتیان بسپێرە.

-مەزن بوونە و کێشەکانیشیان هەر لەتەك خۆیاندا پێگەیشتوون. نازانم چیان لەگەڵ بکەم. هەر بەڕاستی ئەتۆ شوێنێك شك نابەی بیان نێرمە ئەوێ؟ بۆ ڕایانگرم. مەگین ئێمە چیمان کردووە کە ئەوان بیکەن. ئاخری هەر دەبنە شتێکی وەکوو ئێمە، وەك من، خەرجەکەشیان شتێك نیە. ئەو هەتیوە پیسکەیە* ئەوەندەی هەیە بیدا. چاوی کوێر بێ کە ژیانی منیشی بەتاڵاند. ڕێگەی پێنادەم ژیانی مناڵەکانم بشێوێنێ. ناچاری دەکەم هەتا قڕانی ئاخر یان لێ خەرج بکا.

دەڵێم: هەر کارێکی لە دەستم بێ بۆ تۆی دەکەم. بە مەرجێ کە خۆشت بێی.

-کەوابوو هەر ئەوەندە بەسە کە ئەوانە ببەیە ئەوێ. ئەودەم سەرم ببڕی، لاقم ببڕی ، لەوێ هەم، ئەو تولە سەگانە وازم لێ نایەنن.

-ئەوان وازت لێ نایەنن یا تۆ؟

پێدەکەنێ و سێبەری ئەو پێکەنینە کە وێنەیەك لە پێکەنینە شیرینەکانی رابردووە، جارێکی دیکە جوانی و کەشخەیی شاراوەی دەم و چاوی وەڕوو دەخا.

دەڵێ: ڕۆح و گیانم لە تەکیاندایە. گەلێ جاریش چاوی دیتنیانم نیە، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە سۆراغی باوکیان دەگرن.

-دەیجا، باوکیانە ئیدی.

-ئاخێك هەڵدەکێشێ: کە پێگەیشتن خۆیان بۆیان دەردەکەوێ کە باوەگیان چ کەرێك بووە ئەمن نایلێم کە دوایە پیاو خراپ بم.

لێم دەڕوانێ ، پێدەچێ شتێك لە نیگامەوە تێ بگا کە هاودەمییەکەی ئاوا هەڵدەخرێنێ. خوا دەزانێ تاڵە موویێکی ڕۆستەم سەدی ئەوانەی دەهێنا. ئەو بەستەزمانە لەسەر و ماڵمان زیاد بوو.

دەستم بە دەمییەوە دەنێم، بەسەر سوڕمانەوە تێم دەڕوانێ. دەڵێم: قسەی لێ مەکە، کتێبەکەمت بیر دێتەوە، لاپەڕەی سی و حەوت، لای چەپی، سووچی ژێرەوەی.

*تۆ دەتوت: ئەمن نەمردووم، ماڵم گۆڕیوە.*

*لە تۆ دا کە دەمبینی و*

*فرمێسکم بۆ دەڕێژی زیندوو دەمێنم...*

## ( ١٥ )

له ماڵی ئێمەدا هەموو له تەدارەکی ڕێـو ڕەسمـی جـەژن دان. لـەوێ نـەورۆز چـاوەنواری بانگێشتن نامێنێنەوه. خۆی دەرگه دەکاتەوەو وەژوور دەکەوێ. تێناگەم سەبر و حەوسەلەی ئەو هێندە جەژن گرتنەیان لە کوێ بوو. کە لە دایکم دەپرسم، دەڵێ: ئەم قسانە چین. جەژن نەگرتن یانی چی؟ ودمی باش نیه.

-ئاخر...

-ئاخر و ماخری پێناوێ. غولاّم خان، خوا عافووی کا، هەر هێندە بەشـی بـه دنیـاوەبوو، لەبەر پوورە ماهیشت بێ هەر دەبێ جەژن بگرین. دەبێ لەو تازییەی دەرخەین.

حەز دەکەم دەنگ هەڵبڕم: ئای دایه، چۆن نابینی... بـەڵام کـپ لێـی دەڕوانم و سـەرم بـا دەدەم.

*ئاخر کێ باوەڕ دەکا، کێ باوەڕ دەکا،ڕۆستەم...*

له نوێ بوونەوەی ساڵدا هەموو له ماڵه باوکم کۆ ببووینەوه. خوشکم لەتەك شـووەکەی و سێ منالّی، براگەورەم و هاوسەرو دوو منالّیان. برا چـکۆلەم لـه تـەك هاوسـەر و خەسـوو و خەزووری. پوورە پەری لەتەك منالّەکان و وەوی یەکانی*، پوورە پەری لە حەوتووێك پێشترەوە بۆ یارمەتیدانی دایکم هاتۆتە مالّمانەوه. نەنە دەدریش لەبەر دەستی یان دێ و دەچێ.

نەنه گەورە گەڕاوەتەوە گوندی. لە لای کوڕی دەژی، گـەلێك پـیر بـووە و دەڵـێن سـۆمای چاوانی چوونە. دەبێ بچمە گوندی سەرێکی بدەم، بەلاّم نازانم لە توانام دایە یا نا. نەنە دەدری لەلای پوورم ماوەتەوه. ئەویش داکەوتووە بەلاّم هێشتا لە پێکەنینەکەی خۆی دانەناوه.

تاقەتی داب و ڕەسمی جەژنەم نیه. بەپێچەوانەی پرتە و بۆڵەکانی دایکم، بە بیانووی ئـەوە کە پوورە ماو تەنیایە لە لای دەمێنمەوە. دایکم یەك پشوو دەڵێ واباشترە بگەڕێمەوە مالـێ.

ئەو هەر پێی وانیە شوێنێکم بە نێوی ماڵی خۆم هەیە. بە بڕوای ئەو ماڵ هەر ماڵەکەی ئەوە. ئاگای لەوە نیە کە گەلێك ساڵە ماڵەکەی ماڵی من نیە.

*ئەو نازانێ ماڵی تۆ زۆرتر لەهەر ماڵێکی دیکە ماڵی*
*من بووە. ئەو ئاگاداری ئەوە نیە کە گەلێك*
*سەعات لە ماڵی تۆ یا ماڵە پوورە ماهمدا*
*بە یەکەوەمان رابردووە و دەردی دڵمان*
*کردووە، ئەو نازانێ لەو پوورە ماهم بەر لەو*
*دایکم بووە و تۆش بۆم لە هەموو کەس نزیکتر*
*بوویت. تۆ دایکم نەبووی، باوکم نەبووی، برام*
*نەبووی، خزم و کەسم نەبووی، دۆستی نزیکم*
*نەبووی، تۆ تەنیا دۆستێك بووی کە هەمبووە،*
*تۆ مناڵی من بووی، وڵاتم بووی، پێناسەم*
*بووی، سەرجەم ژیانم بووی...*

شەو تا بەیانی بە خۆم دەڵێم: دەبێ بگەڕێمەوە. ئیتر کارێکم لێرە نەماوە. بەیانی لەپشت مێزی ژووری دانیشتنی پوورە ماهم کە ئەو و غولام خان هەرکام لە لایەکی دادەنیشتن و کاریان دەکرد، تێشت دەخۆم. لە بێدەنگی یەکی خەفەتبار دا کە هیچ سەرئێشەیەکی بۆ کەس نیە، لەتەك خۆمدا مشت و مڕمە: دەبێ بمێنمەوە، دەبێ بگەڕێمەوە. دەبێ بمێنمەوە، دەبێ بگەڕێمەوە...

کتێبەکانی رۆستەم بەستەبەندی دەکەم و دایاندەنێمە ماڵە پوورە ماهم تا بیانداتە مناڵەکانی خوشکی. باوکم دەڵێ ماڵەکە بە کرێ دەداتە یەکێکی بە متمانە و کرێیەکەی بۆ خوشکی رێدەکا. دەڵێ: بێ خەم بە. رۆستەم هەقی زۆری بەسەر منەوە هەیە. ئاگام لە ماڵ و حاڵەکەی هەیە.

تەنیا شتێکی کە بۆ خۆمی هەڵدەگرم هەر ئەو کتێبەیە کە چارەنووسی بە باداچووی منی تێداهاتووە. لە جانتاکەمی دەخەم و دەگەڕێمەوە.

دەتوانم خۆم لەنێو هەورەکاندا حەشار بدەم و هەبوونی خۆم لەسەر ئەم عەردە لەبیر بکەم، هەموو شت زۆر بەتاو بە بەرچاومدا تێدەپەری. هەوڵ دەدەم سێرەیان لەسەر هەڵنەگرم بەڵام بۆم ناکرێ. کتێبەکە لە درێژایی ئەو سەفەرەدا لەسەر کۆشم کراوەتەوە.

*لە سووچی ژێرەوەی لای چەپ، لاپەڕەی*
*سی و حەوتدا نووسیوتە: ساڵەکان دێن و*
*دەڕۆن، جگە لەتۆ کەس شك نابەم...*

لە ئێزگەیەکی چکۆلەدا دەوێستین. چەند کەس دادەبەزن، ئەو دوو کەسەی کە لە ئاخریدا دابەزین، ژن و پیاوێکی بە ساڵاچوون، ژنە بن هەنگڵی پیاوەکەی گرتووەو پیاوە هەنگاوی قورس هەڵدەگرێ و بە زەحمەت دێتە پێش. شانەکانی دەرپەڕیون. لەشێکی لەڕو لاوازی هەیە. پیاوە بێ ئەوە هیچ وێچوونێکی لەتەك پاپا دا هەبێ دوایین رۆژەکانی ژیانی ئەوم بیر دەخاتەوە، پاپای من کە هیچکات لەکەس نەدەچوو، لە دوایین مانگەکانی کۆتایی ژیانیدا بە زەحمەت بە رێگەدا دەڕۆیی. لەو رۆژانەدا ئەو ئیتر چووکترین وێچوونێکی لەگەڵ ئەو پیاوە بە هەیبەتەدا نەبوو کە دانیشتووانی ماڵێ بە بیستنی پێیەکانی وەدڵەخورپێ دەکەوتن. دڵم چەند بۆی تەنگ بووە.

*ئەتۆ بن هەنگڵیت دەگرت هەتا لە هۆدە*
*بێتەدەر و لەسەر قەنەفەی حەسار دانیشێ...*

کاتێ لەو دوو پێپلەکانەی بەرەو حەسار دەهاتەخوار، پێویستیم بەوە بوو هۆشم کۆ بکەمەوە سەریەك هەتا لەنێو ئەو لەشە تورت و کۆتایی پێهاتووە دا بە شوێن دۆزینەوەی دێوەزمەی حەقایەتەکانم دا بگەڕێم. دێوەزمەیەکی کە کاتێ دەچوومە باوەشی، کایەم بە قۆڵە تەژی لە مووەکە دەکرد، لێدەبڕام تاڵێك لەو مووانە دەرکێشم و ئەو دەستی دەکێشاوەو دەیوت: ئەی ئەوە چ دەکەی کچەتیوە؟

دەموت: باوەگەورە ، دێشێ؟

پێدەکەنی: دێشێ؟ کچەتیوە، دیارە کە دێشێ.

*شەرتم لەگەڵ خۆم بەستبوو هەر جارە کە*
*لە تۆی دا تاڵێك لە مووەکانی دەستی دەرکێشم.*

شەمەندەفەر وەڕێدەکەوێ و ژن و پیاوە بە ساڵاچووەکە گەیشتوونەتە دەرگەی دەرەوە، دەم و چاوی پیاوکەم بۆ نابیندرێ، لە ئێزگە تێدەپەڕین، سەرنجێکم بە ناوەکەی نەداوە. ئەم ناوانە شتێکم بیر ناخەنەوە. تەنانەت ئەگەر چاویشیان لێ بکەم هەرکە بە پێشیاندا تێپەڕم لەبیریان دەکەم. پاڵ وەپاڵگەی قەنەفەکە دەدەم، لە جیهان دەڕوانم، چاوەکانی نووقاندووە. دوو هێڵی قووڵ کەوتوونەتە سەر هەنیەی. قژی ماش و برنجین و هەر دوو لاجانگی تەنکەیان کردووە.

له فرۆکەخانەدا دەپرسێ بۆچ هێندە کەم مامەوە.

ئەو تێناگا کە هەزار ساڵە ماومەوە. لێی دەڕوانم و چ نالێم، هەر وشەیەکی کە بیڵێم دواجار هەر دەبێتەوە فرمێسك ڕشتن. هەر سەرم با دەدەم. بە پەیجوویی یەوە دەپرسێ. هەر دەڵێی دەیەوێ وەقسەم بێنێ، دەڵێم: هیچ نەبوو ئیتر هاتمەوە.

دەڵێ: هەموو شتێ سەرو بەر کراوە؟

بەهێمای سەر دەڵێم ئا.

دەپرسێ: گشتی خاس بوون.

دەڵێم: گشتی خاس بوون.

سەری ڕەزامەندی با دەدا.

*ئەتۆ بۆ ئەو جگە لە کەسانی دیکە نیت و*

*ڕەنگبێ ئەتۆ بە هیچ کەس دانەنێ...*

نووسراوەی شاعیرێکم بیر دێتەوە: «مەرگ واتایەکی بۆ نیە. هیچ شتێ ناگۆڕێ. ئێمە لە شوێنەکەی خۆمان داین و هەموو شتێ وەك پێشوو درێژەی دەبێ. دەتوانین وەك رابردوو، بە پێی عادەتی خۆمان، بیر لە یەکتر بکەینەوەو لەتەك یەکتر دا بە وتە خۆشەکانمان پێ بکەنین. تەنیا شتێکی کە نایبینین لەشە، بەڵام ئەوەی ڕۆیوە، هەر بەو چەشنی خۆی دەمێنێتەوە.»

نینۆکەکانم لەپی دەستم دەچەقێنم و بێ کاکڵی هەر شێعر و نووسراوەیەکم بۆ دەردەکەوێ. کامە شێعر دەتوانێ ئەو شتەم بۆ دەربڕێ کە هەستی پێدەکەم؟

جیهان دەڵێ: دیارە ئیتر وازی ئەوێت نەماوە. لەڕاستی دا چوونی هەموو ساڵێکیش بێ هۆیە. لە دنیادا ئەو گشتە شوێنە بۆ دیتن هەیە، حەیف نیە مرۆظ ساتگەلی پشوودانی خۆی لەوێ تێپەڕ بکا؟

*ئەو ڕۆستەمەکەی لە کیس نەداوە کە لە*

*وتەکەی من بگا. ئەو هەر بەڕاستی ڕۆستەمێکی*

*نیە کە بزانێ من دەڵێم چی...*

حەوتوویەك دواتر چاوم بە ستارە دەکەوێ. هێشتا لاقی دە ژووری نەناوە، بەستەیەکم بۆ رادەدێری و دەڵێ: هی ڕۆژی لە دایك بوونە.

ئاخ، هەر لەبیرم نەمابوو. دەڵێم: خۆ لێرە نەبووم.

*ئاسمان ساو و بێ پەڵەهەورە. ئەتۆ بەوت*

*دەوت: ئیمرۆ کەس لە ماڵ نیە. دەبێ*
*راوەستین هەتا هەورەکان بگەڕێنەوە*
*ماڵەکانیان...*

هێدی و بەخەمساردییەوە دەڵێ: ئەمن لە بیرم بوو.

نازانم چ بەویش بڵێم؟ بەڵام ئەو قسە دەکا، گوێ لە ئاهەنگی دەنگەکەی دەگرم، هەرچیەکیش دەڵێ بۆم گرینگ نیە. گرینگ بوونی خۆیەتی. تەنیا بوونەکەی مەبەستە.

*ئەو ئەتۆی نەدیوە و ناتناسێ و چووکترین*
*بۆچوونی لەسەر بوون یا نەبوونی تۆدا نیە...*

بۆچ خۆی پێمی نەوت؟ دەیتوانی بە نامە بۆم بنووسێ. دەیتوانی بە تەلەفۆن پێم بڵێ، هیچ رێکەوتێکی لە ژێریدا نەنووسیوە. ئێستا تێدەگەم کە هونەرمەندەکان بۆچ بۆ هەر کارێکی هونەری یان ڕێکەوت دادەنێن. تێگەیشتنی ئەوە کە کەی چ بیرێکمان بووە فرە گرینگە.

ستارە دەڵێ: مامی...

زۆر جار پێم وتووە بەمن نەڵێ مامی، لە وەڵامدا پێکەنیوە و وتوویە: بۆ؟

دەڵێم: چونکە....

دەپەڕێتە نێو قسەم: مامی هەمان مامانە ئیدی، چ فەرق دەکا؟

لێوەکانم بە یەکەوە دەنێم.

رێکەوتی کڕینی کتێب دەگەڕێتەوە بۆ گەلێك ساڵ لەمەوبەر، بەڵام کەی نووسیویە؟

ستارە دەپرسێ: ئاڕ یوو ویز می؟ شت لە لای منە؟

دەڵێم: ئاف کورس. بێ شك.

نوقمی ئاهەنگی دەنگەکەی دەبم و بە دوای ئەم پەژارە کپ و شاراوەیەدا هەروا لێی دەڕوانم.

*«ئا، گشت کوڵو مەینەتەکان، مەینەتی ئەو*
*کەسانە، کێشی ئەو زارۆکە خەوتوویەیە کە*
*تا هەتایی بە کۆڵتەوەیە...»*

❊ ❊ ❊

**فەرهەنگۆك:**

**ئازیز:** لەناو فارسەکان بە دایك یان نەنك دەڵێن ئازیز

**ئاوڵەمە:** بێچووی ناو زگ کە هێشتا خۆی باش نەگرتووە

**باشارکردن:** دەربردن. خۆ راگرتن. دەرەقەت هاتن

**بۆینباخ:** کراوات

**بەترەف:** بەتلاو. خراپ

**بەرقەلیان:** قاوەڵتی. بەرتێشت

**بەرکەوت:** بەش

بە ئەمەگ. وەفادار

**بیتاقە:** بلێت

**پاژ:** بەش. بەشێك لە شتێ

**پژکۆژ:** دوگمە. قۆبچە

**پسمام:** کوڕمام . ئامۆزا

**پلك:** خوشکی باوك

**پۆتراك:** سەرو گوێلاك

**پیسکە:** رەزیل. رژد. چروك

**تەحل:** تاڵ

**تەرەبوون:** ئاوارە بوون

**جەخار:** خەم . خەفەت. مەینەت

**چما:** بۆچی. لەبەرچی. مەگەر

**چەقەسرۆ:** بێ چاوو روو. زۆر وێژ

**حێوەت:** مەترسی

**خلستان:** رزگار بوون

**خێواندن:** لێدان

**داتروسکان:** راچەنین لەترسان

**داڵگۆشت:** کز . لاواز. لەڕ

**دنیێ:** دنیا

**دۆلاپ:** کۆمێد . ئیشکاف - کەنتۆر

**دەراشۆ:** بێ حەیای زمان درێژ

**دەلال:** جوان و خوێن شیرین

**دڵ چێك بوون:** دڵ تەنگ بوون

**دەلی دۆم:** مەسخەرە

**راهی:** رزگاری

**رەشقەن:** گاڵتەجار

**زارۆ:** منداڵ

**زایە بوون:** لە کارکەوتن. لەبەین چوون

**زیرە:** ناڵبەکی. ژێرپیاڵە

**بالاپۆش:** جلی کە لەسەرەوە لەبەر دەکرێ

**سەوزەڵێ:** سەوزەڕەنگ

**شاز:** هەڵکەوتە

**غەوارە:** بێگانە. غەریبە

**فیزراندن:** راکردن. هەلاتن

**قرساندن:** بەسەریەك داگرتنی ددان بە تەوژم

**قووت بوونەوە:** سەرهەڵدان. سەرهەڵێنان

**قولێنە:** قرتاڵە. سەبەتە

**گشتی:** کوللی

**کەڕەت:** جار. دەفعە.

**کەرەمکە:** فەرموو

**کەللا:** هەمە کارە

**کەلان:** جوان دەلال

**کەڵکەڵە:** خولیا

**گزی:** فێڵ، حیلە

**گوڵووك:** شکۆفە. گوڵی دار

**گەزەك :** بیانوو

**گەو:** ئاڵقە

**لاقرتێ کردن:** گاڵتەو گەپ

**لانەواز:** ئاوارە

**وەوی:** بووك

**هنگی:** ئەودەم. ئەوسات

**هەجەت:** بیانوو

**هەرزە چەنە:** هەرزە بێژ، قەرەچەناخ

**هەستۆکی:** حەساسییەت

**هەسکە هەسك:** هانکە هانك

**هەڵتەقێن:** تووشی یەکتر هاتن

**هێور هێور:** وردە وردە